## لەوتەکانی سەرۆکی فەرماندە

لێرەدا پێویستە بەرامبەر پەیوەندیەکان لەگەڵ ئێراندا بوەستین ، لەسەرەتاوە ، هەڵوێستێکی ئیجابی بەرامبەر رووداوەکانی ئێران وەستاین‌و پیرۆزبایی ئاوات‌و خواستی گەلانی ئێرانمان کرد لە چاوبرینە سەربەستی‌داو بەهەڵویستی ئاشکراو پەیوەندی راستەوخۆ لەگەڵ لێپرسراوانی نوی‌ی ئێراندا دووپاتمان کردەوە کە عیراق بەتەنگ دامەزراندنی پەیوەندی هاوکاری‌و دراوسێ باشیەوەیە لەگەڵ ئیراندا ، ئەمەش بە پی‌ی میژووی هاوبەشی نیوان گەلانی ئیسلام‌و لەسەر بنەرەتی ریزی وەك یەك‌و دەست نەخستنە کاروباری ناوخوو ، ئەمەشمان زوو کردو بەر لەوەی حقیقەتی باری ئێران بوکەسانی تر روون بێتەوە ، بەلاّم ئەم هەڵویستە دڵسۆزانەیە لەلایەن کاربەدەستانی ئیرانەوە وەلاّمی نەدرایەوە بەهەڵویستی دوژمنایەتی‌و رەگەزپەرستی نارەواوە نەبی‌و بەهەڵویستی لەخۆبایی بوونی بۆگەن .

ئەورژنمە پەردەی لەرووی نیەتی دوژمنایەتی بەرامبەر نەتەوەی عەرەب‌و بزوتنەوەی شۆرشگیرانەی نەتەوەی هەڵپاڵی‌و دیسان چاوبرسیەتی خۆی لەخاکی عەرەب‌و نیەتی فراوان کردنی لەناوچەی خلیجی عەرەبی ئاشکرا کرد ، ئەم هەڵویستەش کە لەرەگەزپەرستی‌و قین‌و دواکەوتنەوە هەڵقولاّوە کارەساتی بەسەر ئێراندا هینا ، رژیمی نویّ لەبەحری گیروگرفتا نوقم‌بوو ، لەدەریای خوێندا ، لەناکوکی‌و زۆران‌بازی ناو خۆو دەستی کردبەشەری لەناوبردنی گەلانی ئیران کە چاویان لەسەرپەرستی‌و یەکسانیەوەیە .

حاکمەکان لەئێران لێپرسراوی راستەوخۆن لەتێك‌چوونی پەیوەندیان لەگەڵ نەتەوەی عەرەب ، دیسان لێپرسراون بەرامبەر ئەوویران کاری‌یەی بەسەر ئێراندا هات ، ئیمە هیوای خێر بۆ ئێران دەخوازین‌و بۆهەموو گەلانی ئێران هیوای سەربەخۆی تەواوی بۆ دەخوازین ، یەکیتی‌و پێشکەوتن‌و هیوامان وایە بەسەر ئەم‌نەهامەتیەی ئیستایدا زاڵ بی‌و نەکەوێتە ژێر چنگی بێگاتە دیسان هیوا دارین فرسەتی لەبار لەئێران بێتە دی تالە نێوان ئێمەو ئەواندا پەیوەندی دراوسێ باش‌و هاوکاری بەرهەمدار بەدی‌بیّ .

الاشراف الفني: ص. ع

رۆشـــنبیری نـــویّ
گۆڤاریکی رۆشنبیری گشتی مانـگانـەیـە
دەزگای رۆشنبیری‌و بـلاّوکردنەوەی کوردی دەری دەکات

سەرنووسەر
اسماعیل رسول
جیگری سەرنووسەر
فائق جمیل

# سڵاو لە شۆڕش

# سڵاو لە سـ

کاتێ کەشۆڕشی نەمری ( ١٤ ) تەمووز نووچی داو ڕیرەوەکەی گۆڕا . . ئەبوایە سەرلەنوێ مشووری چارەنووسی ئەو شۆڕشەی کە بە هەزاران هەزار دەردەسەری و خەم و قوربانی دان و خوێن و فرمێسکی درێژخایەنەوە هاتبووەکایە ،

بخورێ . . نەخوازەڵلا دوای ئەوەی ئەم گەلە سەوداسەرە ، تووشی گەلێ پلان و داوی کۆنەپەرست و ئیمپریالیزم و دەستەودایەرەکانی هات و کاربەدەستە نۆکەرەکانیش پشتیان تێکردو چارەنووسی وولاتیان خستە مەترسی یەوە . . !

لەئەنجامی ئەو نووچدانەو هەر لەئەنجامی جوولانەوەی رزگاری بەخش عەرەبی و جیهانی یەوە . . مزگێنی شۆڕشێک راستکەرەوەی رەسەن تادەها زاخ نەدراو نەدرەوشایەوە . . ئەوەبوو لەسەرلەبەیانی ١٧ ی تەمووزی دواساڵەکا



## رۆشنبیری نوێ

شەستدا ، ئەو مزگێندیە ، بۆ هەمو دنیا جاڕداو جارێکی تر ، حیزبی سەرکروە ، حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی ، جڵەوی کارو دەسپێشکەری گرتەوە دەستو ئەمجارەیان قۆناغێکی تازەی نێو عیراقێکی دواکەوتەی پڕ لەئاژاوەو اشوب ، دەستیپێکرد .

قۆناغی ( ١٢) ساڵانەی بەپێزی شۆرشی ١٧ - ٣٠ تەمووزی پێشکەوتنخواز ، لەرۆژی ئەمڕۆیدا ؛ لەنێو جوولانەوەی نیشتمانی عیراقیو جوولانەوەی شۆرشی عەرەبیو جوولانەوەی میللەتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستو جوولانەوە رزگاریخوازەکانی جیهانیشی لەگەڵ دابێ ، دیارترین نیشانەیەکی سەوزی سەرکەوتنی میلەتانە . .

ئەم تەمەنەکورتەی شۆرشی بەشانو شکۆیش ، پڕە لەکارو نەسرەوتنو بەرگەگرتن ، پڕە لە بەرەنگاربوونو بەگژاچوون ، پڕە لکۆششو هەڵمەتو دەسکەوتی مەزنو جویٚ جویٚ ، کە خۆی لەخۆیدا ، توانای بەتینی ئەم گەلە قارەمانەی ئێمەو لەگشت بوارەکانی ژیاندا ، دەسنیشان ئەکات .

شۆرشی پیرۆز ، لەم چەند بەهارەیدا ، دریٚغی لەهیچ کاریٚکی بنیادنەرانەی بۆ کۆمەلانی خەلکی چەوساوەی ولاتەکەمان نەکردوەو ریٚگەو مەودای بەرفراوانی لەبەردەما تەختکردوە ، تاکو دەوری میٚژوییانەی خۆی ببینیٚو خەریکی داهیٚنانی پاشەرۆژی پرشنگداری خۆی بیٚتو بەرگری لەهیواو ئارەزوو ئامانجە رەواکانی خۆی بکات . . بەمەیش ریٚگەی یەکجارەکی لەبەردەم کۆنەپەرستایەتی نالەباردا ، بنەبرو بەربەستکردو هەمو جۆرە پلانو پیلانیٚکی درندانەی دوژمنانی خستە نیٚو چالی میٚژووەوە . . چونکە لەبنجدا شۆرش بۆ گۆرینیٚکی بنەرەتی نیٚوواقیعی ئابوریو کۆمەلایەتیو سیاسیی ئەم گەلە نەبەزە پەیدا ببوو ، بۆ ئەوە سەری هەلدابوو ، تا بنچینەی کۆمەڵگەیەکی شارستانیو هاوچەرخو پیٚشکەوتوو ، برەخسیٚنیٚو دەستی زوربەی زۆری کۆمەلانی خەلکی هەژارو چەوساوە بگریٚتو بەرەو مەنزلگەی بەختیاریو ژیانی ئاسودە بیانخاتەریٚ . .

•

بەم باری سەرنجەی شۆرشگیٚرانەیە ، شۆرش توانیویەتی ، گۆرانیٚکی جۆرەکی لەرەوتی بزوتنەوەی خەباتی بەجەرگانەی گەلەکەمان ، بەرەو پاشەرۆژیٚکی رووناك رەنیٚوبهیٚنیٚ .

هەر لەسەرەتاوە شۆرشی مەزن ، بەخەباتی بیٚوچانی رۆژانەیو لەبەر رۆشنایی نەخشەیەکی وردو زانستانەدا ، روویکردە ئالۆزترین مەسەلەیەکی هەلاّیساوی نیٚو عیراق — مەسەلەیکورد — ودانی بەوجودی رەوای نەتەوەیی کوردا ، نا . . ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش ، چەندین بریاری لەم بوارەدا جاردا ، لەوانەش : دامەزراندنی زانستگەی سلیٚمانیو کۆری زانیاری کوردو جەژنی نەورۆزی پیرۆزو سەرلەبەری مافە رۆشنبیریەکانی گەلی نەبەردی کوردو هەڵخستنی جۆرەها دەرفەتو دەرەتان لەبەردەم کۆمەلانی خەلکی دلشکاوی کوردستان ، تا پتر قۆڵی مەردانەی لیٚهەلماڵنو بیٚنە کۆری ژیانو تیٚکۆشانەوە . . زۆری پیٚنەچوو ، بەیاننامەی (١١) ئاداری ساڵی ١٩٧٠ی میٚژوویی ، وەك چوارچیٚوەیەکی راستودورستی چارەسەرکردنی ئاشتیو دیموکراتیانەی مەسەلەی کورد ، بانگی بۆ راهیٚلرا . . . بەمەیش : پیٚوەندی برایانەی هەردوو گەلی کوردو عەرەب ، خرایە مەودایەکی باشترو خەباتی هاوکۆیان رەگاژۆترکراو گەلی قارەمانی کوردیش ، لەدەرەتانی میٚژووی هاوچەرخی خۆیدا ، هەنگاویٚکی گەورەی بەرەوپیٚشەوە هەڵیٚناو جۆرەها هیواو ئامانجو دووربینیو چەشنە خەباتیٚکیتر هاتە کۆری سیاسەتی سەرجەمی ئەم گەلەوە ، بەتایبەتی دوای جاردانی قانونی ئۆتۆنۆمی کوردستانو دامەزراندنی هەردوو ئەنجومەنی یاسادانانو راپەراندنی . . . !

لەگەلٚ ئەم هەنگاوە زلەدا ، شۆرش کەوتە هەولٚوتەقەلایەکی مەردانەی ترەوەو خەونی دەیەها ساڵی گەلی عیراق وەدیهیٚنا ، ئەمیش کاتیٚ کەهاتو روبەرووی مۆنۆپۆلە چاوچنۆکەکانی نەوت بوەوەو بنکەیەکی زانستانەو قایمی وەبەرهەمهیٚنانی راستەوخۆی نەوتی گرتەدەسو لەیەکی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٢ دا ، ئەم مەیدانەی دادریو کۆمپانیای نەوتی عیراق تەئمیمکرد . تالەیەکی ئاداری ساڵی داهاتوودا ، ئەو کۆمپانیا مۆنۆپۆلانە ، لەبەردەم خواستی شۆرشا چۆکیان داداو ملکەچی تەئمیمی میٚژوویی بوون . . . بەمەیش ستراتیژیەتی گەشەسەندنیٚکی فراوانو ئاراستەکراوی بەرهەمو بەعەدالەت دابەبەشکردنی سامانی ولاّت ، پیٚی نایە قۆناغیٚکی تر . بنیادنانیَ بنکەیەکی ئابوری هەمەچەشنەو پوختو سەربەخۆی بوو بە ئەرکو ژانی رۆژانەی شۆرش . . . ئەوەبوو ، کەرتی گشتی کرایەوەو بوو بە دەستەبەری بەجیٚهیٚنانی ئەو رەوتو بنیادنانەو هەنگاوهەڵیٚنان بەرەو ئیشتراکیەتو ئەرکی تازەو پیٚویست . . . لەم بارەیەوە سەرۆکی فەرماندە صدام حسین وتویەتی .

**(سەرکەوتنی شۆرشگیٚرەکان . هەمیشە ئەیانخاتە بەردەم کارو ئەرکی تازەوە . ئەرکیٚ کەلەپیٚناوی کارو بەرەو ئامانجە ستراتیژیەکان بیٚت ، نەك لەپیٚناوی بیرکردنەوە ، لەهەنگاویٚ بەرەو دواوە چوون . . .)**

هەنگاو هەڵیٚنرا . . مەسەلەی چارەسەرکردنیٚکی بنەرەتیانەی کشتوکاڵو بەرپاکردنی شۆرشیٚکی گەورەی نیٚو دیٚهاتی

عیراق دەسپێکراو سەدەها پرۆژەی بۆ خرایەکار ، بەتایبەتی لەرەگ‌هەڵکێشانی پێوەندیيە ناهەموارەکانی دەرەبەگایەتی‌و قەلاچۆکردنی نەخوێندەواری‌و قووڵکردنی رێرەوو هەستی ئیشتراکی‌و دامەزراندنی کۆمەڵەی هەرەوەزی‌و رێکخراوی شۆرشگێرانەی جوتیارو کشتسازان .

لەبواری پیشەسازی‌ی نەوت‌و پیترۆکیمیایی‌و پیشەسازی‌ی قورس‌و سووك‌و هەروا لەبواری راژەی تەندروستی‌و پەروەردەی منالان‌و رێگەوبان‌و رۆشنبیری ، سەدەها پرۆژەی گەورە ، خرایەکار . . . لەهەمووشیان گرینگتر ، شۆرشی پیرۆز ، بەرەو رووی چینی کارگەران هەنگاوی هەڵێناو گەلێ قانونی بۆ هەڵخستن .

لەوانەش : قانونی خانەنشینی‌و دەستەبەرکردنی کۆمەلایەتی‌و چاودێری‌ی لەشساغی‌و بەرزکردنی رادەی بژێوی کرێکاران‌و نواندنیشیان لەئەنجومەنە جیاجیاکانی پرۆژەو دەزگاکان‌دا . . بەمەیش مەسەلەی دیموکراتیەت ، رۆژ دوای رۆژ تەوەرەکەی خێراتر ئەبوو ، هەروەك چۆن لەم بارەیەوە ، سەرۆك صدام وتویەتی :

**(لەبێ بەردەوام ، کاری دیموکراتیانە ، بێ بەبەشێ لە رێبازەکەمان . . .)**

لەبواری خزمەتکردنی ژنانی عیراقیش‌دا ، چونکە لەبنجا شۆرشی سەرفرازی ١٧ – ٣٠ تەمووز ، بۆ رزگارکردنی مرۆڤ سەری هەڵدابوو ، بۆیە بایەخێکی گرینگ بەمەسەلەی ژنان‌دراو هەموو جۆرە کۆست‌و کۆسپێکی نالەباریان ، لەبەردەما تەخت‌کراو خۆیان خزاندە نێو کۆری خەبات‌و نێو هەمو جۆرە دەرەتانێکی رۆشنبیری‌و فیکری‌و ئابوری‌یەوە ، تاکو پتر توانای شاردراویان بەدەرخەن‌و لەدنیای شۆرشا داهێنەربن ، چونکە وەك سەرۆکی فەرماندە وتویەتی :

**(رزگارکردنێکی پوخت‌و تەواوی ژن ، هەرچەندەیش خۆی‌لەخۆی‌دا ، پێداویستیەکی شۆرشگێرانە بێت‌و رەورەوی پێشکەوتن زۆر بەخێرایی بخاتەگەر ، ئەوا ئەو واقیعەی کەکۆمەڵی پێوەت ئەبێ‌و بەرەنگاری گەلێ رووبەروبوونی چارەنووسانە ئەبێت ، بەهیچ کلۆجێ نابێ بەرەی ژنان لەدەرەوەی سنووری ئەرکەنیشتمانی‌و نەتەوەیيەکاندا بێت‌و ئەبێ بەشداریەکی کاریگەرانەی لەرووبەڕووبوونا هەبێت . . .)**

ئەمەو لەبواری سیاسەتی دەرەوەش‌دا ، شۆرشی نەمری تەمووز ، لەم تەمەنەیدا ، توانیویەتی : لەسەر بنچینەیەکی ئاشکرای مەبدەئیانەی دژی ئیمپریالیزم‌و زایۆنیزم‌و گشت جۆرە دوژمنکاری‌و زەوتکردن‌و جیاوازی رەگەزایەتی‌دا ، ئیلتیزام بەسیاسەتێکی شۆرشگێرانەی نێوئاستی دەوڵەتان‌و هەروا لەئاستی دەوڵەتە بێلایەنەکان بکات‌و پشتگیریەکی تەواو ، لەهەمو شۆرش‌و جوولانەوە نەتەوایەتی‌و رزگاریخوازانەی گەلە خەباتکەرەکانی ئاسیاو ئەفریقیاو ئەمەریکای لاتین بکات ، بەشێوەێك تەجرەبەو ئەزمونەکەی لەناخی رەسەنی ئەم خاکەو شارستانیەتی ئەم خاکەو لەبیروباوەری سەرکردایەتیەکەی هەڵێنجرابێ ، هەروەك چۆن سەرۆك ئەمەی دووپاتکردوەو وتویەتی :

**(تەجرەبەی ئێمە ، روونووسکردنی هیچ تەجرەبەیەکی‌تر نیە ، نەلە فیکرا نەلە پراکتیکا . بەلام لەهەمان کاتا ، ئەبێ بەبرواو بەتواناو لەرێگەی دان‌و وەرگرتنەوە ، ساتو سەوا ، لەگەڵ فیکری شۆرشگێرانەی مرۆڤایەتیا بکەین . . . )**

ئابەم شێوەیەو لەبەررۆشنایی ئەم جۆرە پلانە .

زانستیەدا ، شۆرش هەنگاوی هەڵێناوەو ئەم تەمەنەکورتەی ، نەك هەربوە بەسەرچاوەیەکی شۆرشگێرانە ، بۆ عیراقیەکان‌و بەس ، بەڵکو بووە بەتەجرەبەیەکی زیندووی گەلەقارەمان‌و ئاشتیخوازو داهێنەرەکانی جیهانیش . . .

لەم رۆژگارەشدا ، کە تاقمی گومڕاو گەلۆری قوم‌وتاران ، تەپڵی شەڕی ناعادیلانەی خۆی لێەدات‌و گەل‌و سوپا جەنگاوەرەکەمان ، بەسەرکردایەتی حیزبی سەرکردەو سەرۆکی فەرماندەمان صدام حسین ، لەپێناوی بەرگری‌کردن لەکەرامەت‌و بەرژەوەندی‌و مافی رەوای مێژوويیانەی گەلەکەمان لەقادسیەی تازەي‌دا ؛ روبەڕووی ئەو رژێمە گەندەڵەی ئێران بۆتەوە ، بەهیچ جۆرێ رەوتی بنیادنانی نەوەستاوەو ناشوەستێ ، چونکە تەوەرەی ژیان لەسەر خواستی پاك‌و پیرۆزی گەلان‌و بۆ گەلان ئەسورێتەوە ، بەردەوامیش هەمو مۆتەکەو شملی شەڕێ ئەپلیشێنێتەوە . . .

سلاو لەیادی شۆرشی مەزن

**سلاو لەسەرۆك صدام‌و سوپا دلێرەکەی لەقادسیەی صداما .**

# هەڵوێستی ئاشتیخوازانەی عیراق لە مەوقیعی بەهێزی و بەتوانابوونەوەیە

رۆشنبیری نوێ

عیراق شۆڕش هەمیشە پەیوەندیی چاکی لەگەڵ وڵاتە دراوسێکانیدا هەبووەو هەوڵی ئەوەی اوە بەردەوام ئەو پەیوەندییانەی لەگەڵیاندا هەیەتی بەرەوپێشەوە بەرێت بەچەشنێك پەیوەندیی دۆستایەتیو دراوسێیەتی پتەوتربێتو سوودو قازانجی هەر دوولای تێدابێت ، هەر لەم روانگەیشەوە بوو ، کە گەلانی ئێران توانییان رژێمی دکتاتۆریی شای ئێران برووخێنن‌و رژێمێکی تر دامەزرێنن ، عیراق پیرۆزبایی لێکردن‌و بروسکەی پیرۆزباییو پشتگیریی بۆناردن ، بەڵام دەستەڵاتدارە تازەکانی تاران لەجیاتی ئەوەی وەڵامی چاکەی عیراقبدەنەوە ، ڕۆیشتن چی ڕقو کینەی کۆنی رەگەزپەرستانەی خۆیان هەبوو هەموویان بووژانەوەو دەستیان بەبڕو بیانووی ئەوتۆ کرد کە لەقوتووی عەتاریش دانین ، لەو زوڕنایانەی دەیانژەندن ئەوەبووجارێك دەیانووت بەحرەین خاکی ئێرانە ، جارێکی تر دەیانووت بەغدا خاکی ئێرانەو ، بەم بیانووەوە شۆڕشە ئائیسلامییەکەیان دەویست بچێتە دەرەوەو ، وڵاتە دراوسێکانی ئێران بگرێتەوە ، بەڵکو دەیانویست بینێرنە وڵاتی دوور ترکە دراوسێی ئێران نین .

ئابەم جۆرەیش چڵکاوخۆرەکانی خۆیانهانداو ، چەندین کاری تاوانکارییان لە عیراق خۆشەویستماندا دژ بەهاووڵاتییان ئەنجام دا ، یەکێك لەو تاوانکارییانە ، تاوانەکەی زانکۆی موستەنسرییە بوو کە بەناهەق خوێنی چەندین قوتابیی کوڕو کچ ڕژاو خاکی نیشتمانیان سوورکردو ، بوون بە قوربانیی ڕێگەی ئازادیو سەربەستیو ، هەمدیسان تاوانی دەستدرێژیکردن لە کاتی بەرێکردنی تەرمی قوتابیەکان دا . . . کە بەڵگەی ئەوەبوون رژێمی نوێی قومو تاران لەسەر هەمان ڕێڕەوی رژێمی پاشایەتی دەچێتو ، هەمیشە لە سەرچاوچنۆکیو فراوانگەرێتی سوورە ، لەسەر حسێبی خاكو ئاوی وڵاتانی دراوسێ لەوانەیش عیراق .

هەر بەمەیشەوە نەوەستان ، ئەوەبوو لە چواری مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٠ دا ،

بەتۆنچانەو مووشەك ، شارو گوندو مەخفەرەکانی سەرسنووریان دایە بەر گوللەو ، بوون بە هۆی کوشتنو بریندارکردنی چەندین هاوولاتی ، سەرەرای ئەوەی دەزگا ئابووریو شارستانیەکانیان دایە بەر تۆپو دەستدر یژیان کردە سەر .

عیراقیش بۆ وەلامدانەوەی دەستدر یژی‌یەکانیانو بۆ بەرگری‌کردن لە خاكو مافەکانی خۆیو پاراستنی هاوولاتیو شارو گوندەکانی سەرسنوور ، وەلامێکی ئەوتۆی ئەو دەستدر یژی‌یانەی دایەوە ، فەرمانی بەهێزە چەکدارەکان کرد ، خاکی زەینەلقەوسو سیف‌سەعدو هێلەیان وەرگرتەوەو هاتنەوە ئامێزی نیشتمانو بەناو خاکی دوژمن دا دەستی دلێرانەیان لە هێزە هەلخەلەتێنراوەکانی دوژمن وەشاندو چەندین کیلۆمەتر خاكو زەویو چەندین شاری دوژمنیان داگیرکردو چەندین دەستکەوتیان وەدەست‌هێنا لە تۆپو تانكو زریلیو رادارو تەقەمەنی‌ی هەمەچەشنو گەیشتنە نزیکی شاری ئەهوازو عەبادانو خەفاجیەو سەرپێلی زەهاو .

لەگەلٚ ئەو هەموو سەرکەوتنانەیش دا ، عیراق شۆرش بۆ ئەوەی خوێنی کەمتر لەم شەرەدا برێژرێت ، بە زمانی سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسین فەرماندەی گشتی‌ی هێزە چەکدارەکانەوە رای‌گەیاند جەنگ دەوەستێنێت بەمەرجێك ئەو لایەنەکەی تریش بیوەستێنێت ، ئنجا دەست بەگفت‌وگۆی راستەوخۆیان ناراستەوخۆ بکرێت ، ئەوەبوو راشیوەستاند بەلام کەدی‌ی لایەنی تر نایەوێت جەنگ رابگرێت ئەمیش لەسەرکەوتنو بۆپێشەوە چوونی خۆی دا بەردەوام بوو .

کە هەولی ئەوەیش درا ، لەلایەن چەندین لیژنەی نێو دەولەتی‌یەوە جەنگی نێوان عیراقو ئێران رابگیررێت ، دەستەلاتدارەکانی قومو تاران بەردەوام کۆسپیان دەخستە رێگەیان ، بەهیوای ئەوەی سوود لەهەلی‌کات وەربگرنو بەخەیالی خاویان سەرکەوتن بەدەست‌بهێنن ، کەچی بەپێچەوانەوە عیراق هەمیشە لەگەلٚ هەموو هەولێکی نێو دەولەتی دا بووە بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکی‌ی لەگەلٚ ئێراندا ، بەلام کە فەرمان‌رەوا رەگەزپەرستو نەزانەکانی ئێران لەسەر رێرەوی کۆسپ خستنە بەردەم لیژنەکانی چارەسەرکردنی ناکۆکی‌یەکە رۆیشتنو ، بە هیوای ئەوەوە چەندین جار لە زستانو بەهار دا هێرشی بەرانبەریان کردە سەر هێزە پالەوانەکانی عیراق ، کە بە دەستی پۆلایینو بەتوانای مەردانە دەستیان لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگەکانیانەو توند لە سەنگەرەکانیان‌دا راوەستاون ، لە خەفاجیەو عەبادانو گیلانی رۆژئاوا ، پاشانیش لەسەرپێلی زەهاو ، کەچی لە شکستی زیاترو زیانی زۆر ترو کوژراوی زۆرتر بەولاوە هیچی تریان دەستگیرنەبوو .

لەگەلٚ هەموو ئەمانەیش دا ، لەگەلٚ بەتوانیو لێهاتوویی سوپای عیراقو گەلی عیراق داو ، لە شوێنی بەهێزیو توانابوونەوە ئەوا عیراق رای‌گەیاندووەو رای‌دەگەیەنێت کە پێشوازی لە هەموو هەولێکی خێرخوازیو چاکەخوازیو نیازپاکی دەکات ، بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکی‌یەکانی لەگەلٚ ئێران دا ، بە چەشنێك مافە رەواکانی لە خاكو ئاودا بپارێزێتو دەست لە کاروباری ناوخۆی وەرنەدرێتو بەچاکەو دراوسێیەتی باش لەگەلٚ یەکتری دا بژین .

ئەگەرچی عیراق ئەمەی بە نیازێکی پاکەوە وتووە ، بەلام ئەگەر دەستەلاتدارەکانی قومو تاران ، ئەمە بە جۆرێکی تر لێك‌بدەنەوەو وای‌شی بکەنەوە کە عیراق لە شوێنی‌بێهێزی‌یەوە ئەم هەلوێستەی دەرخستووە ، ئەوا زۆر بەهەلەدا چوون ، ئەم بەهەلەدا چوونەشیان ، نۆ مانگی بەردەوامی جەنگ وەلامی دەداتەوەو دەبێتە بەلگەی ئەوەی کە هێزەکانیان نەیانتوانیوە چی لە عەبادانو چی لە خەفاجیەو چی لە سەرپێلی زەهاو بستێك پالەوانەکانی قادسیەی صدام پاشەکشێ پێبکەن ، بە پێچەوانەوە سوپاو هێزە دلێرەکانی عیراق لە توانایاندایە ئەگەر فەرمانیان پێبدرێت شارو خاکی تر داگیربکەن .

ئابەوجۆرە لەگەلٚ هەموو ئەو سەرکەوتنانەی پالەوانەکانی قادسیەی صدام دا ، لەگەلٚ بەهێزیو بەتوانیی سوپای پالەوانو گەلی مەزنی عیراق دا عیراق شۆرش لەگەلٚ هەموو هەولێکی خێرخوازی دا هاریکاری دەکاتو لەسەرکەوتنو بەرەوپێشەوەچوونو بنیاتنانو پێشکەوتنیش دا بەردەوام دەبێت ، تاکوو دەستەلاتدارەکانی قوم وتاران وەئاگادێنو ، فارسی دوژمن چۆك دادەداتو ددان بەتەواوی مافەرەواکانی عیراق دا دەنێت .



# ئاوردانەوەیەك لە داستانی شۆرشی چواردەی تەموزی ساڵی ١٩٥٨

**رۆژی یەکشەممە**
**رێکەوتی ١٣/ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨**

مەلیك لەم ڕۆژەدا خەریکی خۆ ئامادەکردن بوو بەو نیازەی کە لە سەعات (٨)ی سەر لە بەیانی ڕۆژی ئاینده لەگەڵ نوری سعیدو تۆفیق سوێدیو فازڵ جمالی بەرەو «ئەستەنبۆل» بکەونە ڕێ بۆ ئامادەبوون لە کۆنگرەی سەرۆکانی وڵاتانی پەیمانی بەغدا ، بڕیار وابوو کە دوای کۆنگرەکە سەردانی لەندەنیش بکات بۆ دیدەنی «فازیلەی» دەزگیرانی کە نیازیان وابوو لە پاییزی هەمان ساڵدا زەماوەند بکەن .

هەموو شتێ لە شاری بەغدا هێمنو سروشتی بوو ، ڕۆژێکی سروشتیی وەك هەموو ڕۆژانی ساڵ بوو بەلام لە هەمان کاتدا ڕۆژێکی زۆر گەرم بوو چونکە بەغدا لەم وەرزەدا زۆر گەرمە .

سەرلەبەیانیی ئەم ڕۆژە مەلیك کۆشکی بەهەشتو چوو بۆ (بلاطی مەلەکی) کە لە أعظمیة ، لەوێدا پێشوازی ئەو مێوانانەی کرد کە بۆ دیدەنی ئەو هاتبوون . پاشان ڕووی لە کۆشکی (الرحاب) کرد کە دەکەوتە نزیك پردی خڕەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ کەسوکاری خۆیدا نانی نیوەڕۆ بخوات .

دوای نانخواردنی نیوەڕۆ ، مەلیك چووە ژووری خەوتن کە لە نهۆمی دووەم بوو بۆ ئەوەی کەمێ بحەسێتەوەو پاشان خۆی بۆ سەردانەکەی بەیانی ئامادەبکات . سەر لەئێوارەی هەمان ڕۆژ واتە ڕۆژی ١٣/ی تەمووز ، مەلیك فەیسەڵو عبد الالەی خاڵیو هەردوو پووری خۆی «عابدیة»و بدیعەو الشریف‌حسینی مێردی» و دوو کیج کە هاوڕێی بوون «خزمی یەکێ لە گەورە ئەفسەرەکانی پاسەوانی مەلەکی بوون» پێکەوە دانیشتبوونو چایان دەخواردەوە وجارجارەش باسی مەسەلەی زەماوەندی مەلیكو دیدەنی دەزگیرانەکەی دەکرا ،



● دوای تێپەڕبوونی ٢٣ ساڵ چەند ڕاستیەکی گرنگ‌و مێژوویی بڵاوده‌کرێنەوه .

● داستانی ڕووداوەکانی یەکەم سەعاتی شۆڕشی چواردەی تەمووز .

● سەر لە بەیانی ڕۆژی چواردەی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ چی ڕووی دا ؟

● چۆن نەخشەی شۆڕش جێبەجێ کراو کۆشکی «الرحاب» داگیرکرا ؟؟

● چۆن مەلیك‌و عبد الاله کوژرانو نوری سعید لە کۆشکی خۆی ڕای کرد چۆن گیرا ؟؟

**وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە بۆ کوردی**
**خالد خۆشناو**

ناوناوەش هەموویان بە پێکەنینەوە تەماشای مەلیکیان دەکرد چونکە ئەو ڕۆژە مەلیك قژی تاشیبوو ئیتر ڕوخساری وەك جاران نەبوو کە قژی درێژ دەکرد .

**● نامەیەکی نهێنی . .**

لە کاتێکا هەموویان خەریکی «چا» خواردنەوەو گفتوگۆی هەمەچەشنە بوون . ئۆتۆمبێلێك لە چەشنی «فۆلکس واگن» بە خێراییەکی تیژ گەیشتە بەر ..ە کۆشکی «الرحاب» و دوای وەستانێکی کورت تێپەڕ ی ئاگەیشتە بەر دەرگای سەرەکی ی کۆشك‌و ئەفسەرێك کە هەرخۆی ئۆتۆمبێلەکەی لێدەخوڕی د.. ی‌و خۆی گە ..دە یاوەری «مورافیق» عبد الالەو نامەیەکی د..ی د..ست . ئەویش خێرا چووە لایان . بەڵام عبد الاله ..ڕا.. نەگرت‌و خێرا نامەکەی لێ‌سەندو بەپەلە خوێندیەوە . لە ناکاو ڕوخساری گۆڕاو ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاو دەستی لەرزی . خێرا تەلەفۆنەکەی خستەکار بۆ ئەوەی لەگەڵ (بهجة العطیة)ی بەڕێوەبەری گشتیی ئاسایش ..سە بکات . هەندەی نەبرد بەپەلە سواری ئۆتۆمبێلەکەی بوو و لە تەنیشت شوفێرەکەی دانیشت‌و بەرەو شوێنێکی نەزانراو ڕۆیشتن .

**● عبد الاله بۆ کوێ ڕۆیشت ؟**

**● ناوەڕۆکی نامەکە دەبێ چیبێ کە ئەفسەرەکە بۆی هێنا ؟**

**● باشە کە نامەکەی خوێندەوە لەبەرچی شێواو ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا ؟ ؟**

بهجة العطیة ئاگای لە مەسەلەکە هەیە ! ئەوانەی ئاگایان لە مەسەلەکە بووە دەڵێن ئەو نامەیەی کە گەیشتە عبد الاله

چەند مەعلوماتێکی مەترسی لێکراوی دەربارەی شۆڕشی ١٤/ی تەموز تێدا نووسرابوو . عبد الأله کە نامەکەی خوێندەوە بەتەلەفۆن لەگەڵ بهجة عطية قسەی کردو داوای لی کرد کە بەزووترین کات بێتە ماڵی تایبەتی ی خۆی (عبد الأله) کە دەکەوتە سەر ڕووباری دیجلەوە لەلای کەرادەی مەریەم . بهجة بەپەلە هاتە ئەوی و ماوەیەکی درێژ پێکەوە کۆبوونەوەو عبد الأله ناوەڕۆکی نامەکەی بۆ بهجة ڕوون کردەوەو بەهجەتیش کە ئاگای لەمەسەلەکە هەبووە بەوناوەی بەڕێوەبەری گشتی ی ئاسایش بوو پاڵپشتی قسەکانی عبد الأله ی کرد . بەڵام عبد الأله کە زۆر شێواوو پەشۆکا بوو دڵی دانەدەکەوت خێرا تەلەفۆنی بۆ ڕەفیق عارف سەرکردەی ئەرکانی سوپاو نوری سەعیدی سەرەك وەزیران کردو باسی مەسەلەکەی بۆ کردن . ئەوانیش دڵیان دایەوەو وتیان هیچ لە گۆڕێ نی یەو هەموو شتێك ئاسایی و لە شوێنی خۆیەتی و سوپاش هەمیشە لایەنگیری حکوومەتەو چاوەڕوانی هیچ ڕووداوێك ناکری و بۆیان دووپات کردەوە کەوا ئەوەی ئێوەی هەراسان کردووە بهجة عطيەیە بۆ ئەوەی دەرفەتێك بۆ خۆی دابێن بکات و دەست بخاتە ناو کاروباری سوپاو مەبەستی خۆی بهێنێتەدی ! ! عبد الأله کە ئەمەی لە هەردووکیان بیست کەمێ هاتەوە سەرخۆو بە دڵنیاییەوە گەڕایەوە کۆشکی «الرحاب» تا ڕابواردنەکەی ئەم شەوە لەگەڵ فەیسەڵ و مێوانەکانی تر بە بینینی فلیمێکی سینەمایی تەواوبکەن کە ناوی فلیمی بێجامە بوو .

نانی ئێوارە خوراو سەعات بوو بە (١٠)ی شەو . مەلیك چووە ژووری نوستن و عبد الأله بەتەنیا لە تارمەکە دانیشت . . لە (١٢)ی شەو گڵۆپەکانی کۆشك کوژانەوەو هەریەکە کەوتە خەوی خۆی بی ئەوەی بزانن بەیانی چی ڕوو دەدات ! !

## ● عەریف سالم هێرش دەباتە سەر کۆشکی مەلیك !

سەرکردایەتی ی سوپا هەر لە مانگی تەموزەوە بڕیاری دەرکردبوو کە لیوای بیستەم لە جەلەولاوە بەرەو اردن بکەوێتە ڕێ . بەپێی بڕیارەکە ئەم لیوایە دەبوایە لە ئێوارەی ڕۆژی یەکشەممەدا ڕێکەوتی ١٣/ی تەمووز بکەوێتە ڕێ و بەناو شاری بەغدا تێپەڕێ .

ئەفسەرە ڕزگاریخوازەکان . ئەمەیان بە دەرفەتێکی بە نرخ زانی بۆ ڕاپەڕاندنی نەخشەی شۆڕش کاتێ کە لیوای ناوبراو بەناو بەغدادا تێپەڕدەبێ . نەخشەی شۆڕشیان دانەیەوە و هەموو جۆرە پێویستیەك ئامادەکراو پەیوەندی لەگەڵ شانەکانی ئەفسەرە ڕزگاریخوازەکانیش کرا کە لەزۆربەی زۆری بەشەکانی سوپا لە بەغداو شارەکانی تردا هەبوون .

لە سەعات (٩)ی شەوی ١٣/١٤/ی تەموزدا لیوای ناوبراو بەرەو بەغدا کەوتەڕێ . زەعیم (أحمد حق محمد علی)ی فەرماندەی لیواکە سەر قافڵەبوو . . لیوای ناوبراو لە (٣) فەوج پێك هاتبوو . بۆ ڕاپەڕاندنی نەخشەی شۆڕش گرفتێك سەری هەڵدا ئەویش ئەوەبوو کە فیشەك و تەقەمەنی بەسەر فەوجەکاندا دابەش نەکرابوو لەبەر ئەوەی قەدەغەبوو کە فیشەك و تەقەمەنی بەسەر ئەو لەشکرەدا دابەش بکرێ کە بەناو شاری بەغدا تێدەپەڕێ و یان لە شوێنێك دەچێتە شوێنێکی ترەوە . . بەڵام ئەفسەرەکان بەهەر حاڵ توانیان کەمێکی لێ پەیدا بکەن .

فەرماندەی لیوا زوو گەیشتە فلوجەو لەوێدا چاوەڕێ ی گەیشتنی لیواکەی دەکرد . هێشتان (٢٥) کیلۆمەتر مابوو بگەنە بەغدا ئەفسەرە ڕزگاریخوازەکان قافڵەیان ڕاگرت و تەعلیمات و ڕاسپاردەیان دەربارەی چۆنیەتی ڕاپەڕاندنی نەخشەی شۆڕش بەسەر ئەفسەرو زابت سەفەکاندا دابەش کرد .

## ● نەخشەی شۆڕش بەم جۆرە دانرایەوە :

بڕیاردرا کە فەوجی (٣) نەخشەکە ڕاپەڕێنی و دوو فەوجەکەی تریش یاریدەی بدەن و سەریەکانی فەوجی ناوبراو بەغداو بنکەگرنگەکان داگیربکەن ئەویش بەم شێوەیە : —

- سەریەی یەکەم بۆ داگیرکردنی ئێزگە .
- سەریەی دووەم بەسەرپەرشتی ی رئيس عبد الجواد حميد بۆ داگیرکردنی کۆشکی مەلیك .
- سەریەی سێیەم بە سەرۆکایەتی رئيس یەکەم بهجة سعید بۆ داگیرکردنی کۆشکی نوری سعید گرتنی .

لە سەعات چوارى سەر لەبەیانی ڕۆژی ١٤/ی تەمووزا سەریەکان بەرەو شاری بەغدا هاتن . کەمتر لە نیو سەعات هەر سێ سەریەکان گەیشتنە ناو پایتەخت و دەست بە ڕاپەڕاندنی نەخشەی شۆڕش کرا . هێزەکانی پۆلیس و ناوخۆش لە خەوێکی قووڵ دابوون .

**● چۆن کۆشکی الرحاب داگیرکراو چۆن مەلیك و عبد الاله کوژران ؟ ؟**

ئەوساکە شتێکی سروشتی بوو کاتێ سوپا بەناو پایتەختدا تێپەڕ بایە دەبوایە هێزێکی سوپاو پۆلیس لە ئینزار دابن ، بەڵام نوری سعید سەرکردەی ئەرکانی سوپا ئەم شەوە هیچ بڕیارێکیان لەم بارەیەوە دەرنەکردو وایان دەزانی کە لیوای ناوبراو بەناو پایتەختدا ڕەت نابێ‌و بەرێگای دەوروپشتی بەغداد تێ دەپەڕێ ، هەروا ئەوەشیان لەیاد کرد کە ئەم ڕێگایەی لیوا کە پیێدا دەڕوا یەکسەر بۆ کۆشکی (الرحاب) دەچێ . بەم جۆرە ڕۆژی ١٤/ی تەمموزو سەرلەبەیانی زوو سوپا گەیشتە ناو شارو بەبێ هیچ جۆرە بەرەنگاری بوونێك نەخشەی شۆرش جێبەجێ‌کرا .

**● شۆرشگێران هێرش دەبەنە سەر کۆشکی مەلەکی .**

لەگەڵ گزنگی‌سەر لەبەیانی ڕۆژی دوو شەممە ١٤/ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ کە بەرەبەیانێکی پاك‌و بێ‌گەرد بوو . خزمەتکارانی مەلیك زوو لەخەو هەڵسان چونکە مەلیك ئەم ڕۆژە لەسەر سەفەر بوو ، لە سەعات پێنج‌و دە دەقیقەی سەرلەبەیانی گوێیان لە تەقە بوو ، وادیار بوو کەتەقەکە لە دوورەوە دەنگی دەهات ، لەبەرئەوە هەموویان هاتنە دەرەوە تا بزانن سەرچاوەی تەقە لە کوێیە ! ! وای بۆ چوون کە ئەم تەقەیە لە ئۆردوگای وەشاشەوە دێ‌و هی مەشقە (تەدریب) ، چونکە مەڵبەندی مەشق پێ کردنی سەربازان لەوێ بوو . بەڵام ئەوەندەی پێ‌نەچوو تەقەکە زیادی کرد . لە سەعات پێنج‌و نیودا مەلیك لەخەو هەلساو جل‌و بەرگی خۆی لەبەرکردو لە ژوورەکەی خۆی هاتە خوارەوەو نفیسەی داپیری‌و خزمەتکارەکانی بینی کە لە تارمەکە وەستاون‌و دەیانەوێ بزانن ئەم تەقەیە لەکوێیە ؟ ؟ هەندەی پێ‌نەچوو عبد الألەش بە بێجامەوە هاتە لایان‌و ئەویش نەی‌دەزانی چ باس‌و خواسە . .

عبد الأله کە تازە لەخەو هەڵسابووو گوێی لە تەقەکە بوو ڕووی لە مەلیك‌و ئەوانی‌تر کردو ووتی : ئەمە سوپایەو دژی ئێمە هەڵساوە ! لەم قسانەدا بوون ، گوللە بەرەو کۆشك دەهات‌و جارجارەش پاسەوانەکانی کۆشك هەر لە خۆیانەوە تەقەیان دەکرد . عبد الأله بە گورگە لۆقە چووە لای تەلەفۆنەکە بۆ



ئەوەی لەگەڵ نوری سعیدو سەرکردەی ئەرکانی سوپاو یان وەزیری ناوخۆ قسەبکات‌و بزانێ مەسەلەکە چی‌یە ؟ بەڵام هەوڵدانەکەی بێ سوود بوو ، کەس نەبوو تەلەفۆنەکە هەڵگرێ‌و وەڵام بداتەوە ، عبد الأله زیاتر تێك‌چوو ، گەڕایەوە لایان ، بەڵام سەروسیمای شیواو ڕەنگی هەڵبزورکاو زەرد بوو ، بە مەلیکی وت : —

لەم بڕوایەدام ئەمە جوولانەوەیەکە دژی ئێمەیەو دەمزانی هەر ڕوو دەدات . . ! کە هەستی کرد خزمەتکارەکان گوێی لێ دەگرن ئیتر بە زمانی تورکی قسەی لەگەڵ مەلیك کرد .

سەعات خەریکە بیێتە (٦)ی تەواو ، تەقەش هەروا لە زیاد بوندایە ، مەلیك‌و عبد الأله لە نهۆمی سەرەوە هاتنە نهۆمی خوارەوەو چوونە هۆڵی کۆشك ، مەلیك لەسەر کورسیە درێژەکەی هۆڵ دانیشت‌و عبد الألەش هەر دەهات‌و دەچوو ، جارجاریش مژێکی لە جگەرەکەی دەدا .

لەم کەین‌و بەینەدا بوون . فەرماندەی هێزی پاسەوانی مەلەکی گەیشتە کۆشکی رحاب داوای دیدەنی مەلیك‌و عبد الألەی کرد ، کە هاتە لایان وتی : —

ئەفسەرێکی هێزی پاسەوانیان بۆ لای هێزی هێرشکەر نارد ، ئەویش چاوی بەسەرۆکەکەی کەوتووە کە ئەفسەرێکی بچووکەو پێیان وتووە گوایە شۆرش دەستی‌پی‌کردووو ئۆمار ئاشکراکرا ، و بنەماڵەی مەلیك دەبێ بەزووترین کات خۆیان

بدەن بەدەستەوە . . ! هەروا وتی :

پاسەوانی مەلەکی لە توانای‌دا نی‌یە بەرەنگاری هێزی شۆرشگێرەکان بیی‌و لەوانە یەسەربازەکان خۆیان یەکتری بکوژن‌و قران بۆ یەکتر بێنن . . و ئەممەش دەبێتە هۆی بەرپابوونی شەرێکی سەخت لە نێوان هاوولاتیاندا !

عبد الألە کە ئەمەی لە کابرا بیست دەستی بە لەرزین کردو سەری دانواند بی‌ئەوەی بتوانیّ هیچ وەلامێك بداتەوە . . کە ئەفسەرەکە لەلایان دەرچوو ، بانگی رئیس «ثابت»ی کرد کە یاوەری (مرافق)ی تایبەتی‌ی مەلیك بوو بۆ ئەوەی بچێتە لای شۆرشگێرەکان و ئاگاداریان بکاتەوە کە بنەماڵەی مەلیك ئامادەن بۆ راوێژکردن‌و تەنیا دەیانەویّ ماوەیان بدرێتیّ بۆ ئەوەی ولات بەجیّ بهێلن .

نەبەستیشی لەمە سوود وەرگرتن بوو لە وەخت . !

نێرداوی عبد الألە بەرەو لای شۆرشگێرەکان هات‌و داوای وەستاندنی تەقەی لی‌کردن ، بەلام رازی نەبوون‌و وتیان تەقە بەردەوامە تا ئەو کاتەی بنەماڵەی مەلیك خۆیان دەدەن بەدەستەوە ، وتووێژێکی توندوتیژ لە نێوان ناوبراوو شۆرشگێرەکان رووی‌دا بەلام بی‌سوود بوو ! کابرا (نێرداوی عبد الألە) لە پرێکا رووی رەشاشەکەی کە بەدەستیەوە بوو لە شۆرشگێرەکان کردو تەقەی لی‌کردن بەلام دەرحال گوللە بارانیان کردو کوشتیان . سەعاتیش خەریك بوو بگاتە شەش‌و نیو ، فەرماندەی سەریە عەریف سالم راسپارد کە لەگەلّ چەند سەربازێك روو لە کۆشك بکەن‌و داگیری بکەن . بەلام لێرەدا گرفتێك سەری هەلداو خەریك‌بوو شۆرش پاشگەز بکاتەوە ئەویش کەمی فیشەك‌و تەقەمەنی سەربازەکانی بوو ، شۆرشگێرەکان ترسیان لی‌پەیدابوو ، کـــە لەم وەختە ناسکەدا کە فیشەك‌و تەقەمەنی شۆرشگێرەکان کۆتایی بێت ، ئەفسەرە رزگاریخوازەکانی ئۆردوگای وەشاش کە نزیکەی (٧٥٠) مەتری لە کۆشکی (الرحابەوە) دووربوو خێرا جبەخانەیان شکاندو بە موژدەی بەرپابوونی شۆرش شادبوون ، بەم جۆرە چەك‌و فیشەك‌و تەقەمەنیێکی زۆریان گەیاندە شۆرشگێرەکان بەتایبەتی تۆپی (١٠٦) ملم کە لەسەر ئۆتومبێلی جێبی سەربازی قایم دەکرا ، کۆشکیان بۆمباباران کردو چوونە ژوورەوو چەند هێزێکی تریش لە دەورو پشتی کۆشك‌و ناو باغەکەی‌دا پەرت‌و بلاو خۆیان قایم کرد بوو ، دلێرانە فەرماندەی پاسەوانەکانی مەلەکی‌و ئەفسەرو سەربازەکانیان چەك‌کردو ئینجا بی‌ترس روویان لە ژوورەکان کرد .

سەعات نزیك بوو بێتە حەوت‌و دە دەقیقەی سەر لەبەیانی ، تەقە هەر بەردەوام بوو ، مەلیك‌و عبد الألە کوژران‌و لاشەیان کەوتە ئەو گۆرەو ئۆتۆمبێلێکی سەربازیان هێنا بۆ گواستنەوەی لاشەکانیان‌و ئەو خەلکەی کە تینووی ئەم رۆژە بوون هێرشیان بردە سەر لاشەی عبد الألە بۆ ئەوەی پارچە پارچەی بکەن‌و لە شەقامەکاندا هەلی‌واسن .

**● ئافرەتێکی نانکەر هەوالی شۆرش دەگەیەنێتە نوری سعید .**

لە ئێوارەی رۆژی یەکشەممە ١٣/ی تەمموزی ١٩٥٨ دا ، نوری سعید لەگەلّ احمد موناسیفی پارێزەرو خلیل کنەو خلیل ابراهیم کە سیّ دۆستی نزیکی بوون ، لەمالی خۆی‌دا لە کەرادەی مەریەم تا سەعات (١٠)ی شەو دانیشتن ، کە میوانەکان رۆیشتن ، نوری سعید چووە ژووری خەوتن‌و خزمەتکارەکەی خۆی راسپارد کە بەیانی لە سەعات (٥) لە خەوی هەلسێنیّ تاخۆی ئامادەی سەفەر بکات لەگەلّ مەلیك بۆ ئەستەنبۆل‌و لەوێشەوە بۆ لەندەن . . شەو بەسەرچووو نوری ئاگای لە هیچ نی‌یە . . بەیانی ئەو هێزەی کە بۆ داگیرکردنی کۆشکی نوری سعید تەرخان کرابوو گەیشتە نزیك کۆشك‌و لە نێوان دارخورماکاندا خۆیان قایم کرد . .

نوری سعید خووی بەوەوەگرتبوو کە لە خەو هەلدەسا پێش هەمووشتیّ نانێکی گەرمی دەخوارد ، لەبەرئەوە ئافرەتێکی لادیی هەموو بەیانیان زوو دەهاتە مالی نوری‌و نانی گەرمی بۆ ئامادە دەکرد ، ئەم بەیانیە کە ئافرەتەکە هاتە ئەویّ ، هێزێکی سەربازی بینی کە لێرەو لەویّ لە نێوان دارخورماکاندا پەرت‌و بلاو بوونەتەوە ، ئیتر خێرا خۆی گەیاندە ژووری نوری سعیدو لە خەوی هەلساندو مەسەلەکەی بۆ گێرایەوە ، ئەویش گورج خۆی گەیاندە نووسینگەکەی خۆی کە لە ناو مالەوەی بوو ، دوو دەمانچەی دەرهێناو بە پێخاوسی چووە ناو باخی لای رووبارەکەو پێلاوەکانیشی بەدەستەوە گرتبوو ، نوری خۆی گەیاندە سەر رووبار ، لە ناوەراستی رووباردا دوو ماسی‌گری بینی کە بە بەلەم خەریکی ماسی گرتن بانگی کردن‌و داوای

تێکردن کە لە ڕووباری بپەڕێننەوەو بەرەو ماڵی وەزیری ناوخۆ کە سعید قەزاز بوو ببەن .

لەبەرئەوە ئەو هێزەی هێرشیان بردە سەر ماڵی نوری‌و وبە وردی هەموو سووچ‌و قوژبنێکیان پشکنی نەیان دۆزیەوە ! هەرچەندەش هەوڵیان لەگەڵ خزمەتکارەکەی‌دا بەلاّم بەسەرو سۆراغی نەکەوتن .

ماسی‌گرەکان نوری‌یان خستە ناو بەلەم‌و بەکەل‌و پەلی ماسی‌گرتن کە لەناو بەلەمەکەدا هەبوو دایانپۆشی وشاردیانەوە . . سەربازەکانیش لەسەربان‌و نهۆمەکانی کۆشك هەر بەدوای نوری دەگەڕان . . . پێش‌ئەوەی بەلەم بگاتە ئەوبەری ڕووبار ، نوری وەکو ڕێوی سەری لەپەنا کەل‌و پەلەکان دەرهێنا ، گوێی لە بگرەو بەردەی خەڵك بوو ، خەڵکێکی زۆری بینی کە بەدرێژایی شەقامی (أبو نؤاس) ەوە پەرت‌و بلاّو بوونەتەوە ، نوری ترسێکی زۆری لێ نیشتبو ، داوای لە ماسی‌گرەکان کرد کە بیهێننەوە لای کەرخ بەلاّم کیلۆمەترو نیویك دوور لە کۆشکی خۆی ، لەوێدا بەپەلە لەبەلەم دابەزی‌و خۆی گەیاندە ماڵی خزمی یەکێ لە وەزیرەکانی ، تا سەعات (٨ر١٥)ی سەر لەبەیانی لەوێ مایەوە . پاشان بە ئۆتومبیلی ماڵەکە خۆی‌گەیاندە ماڵی (ئەستەر ابادی ، نوری سعید زۆری هەوڵدا کە بە تەلەفۆن پەیوەندی بە سعید قەزازو رفیق عارف‌و خلیل کنە خلیل ابراهیم بکات بەلاّم بێسوود بوو . . لەم کاتەدا هەواڵی کوشتنی مەلیك‌و عبدالألەی لە رادیۆ بیست ، ئیتر زیاتر پەشۆکاو ڕەنگی هەڵبزورکاو تێك چوو . . ٥

نیوەڕۆ ویستی خۆی بگەیەنێتە لیوای یەك کە لە مسیب بوو . بەلاّم لەبەر ئەوەی خەڵکەکە لە هەموو شەقام‌و کولاّنەکاندا دەسووڕانەوەو سەربازەکانیش هەموو ئۆتۆمبێلیکیان دەپشکینەوە نەیتوانی بڕوا بۆ مسیب . . بەم‌جۆرە ، تا ڕۆژی ١٥/ی تەموز لەوێ واتە لەماڵی ئەستەر ابادی مایەوەو گوێی لە رادیۆش گرتبوو لەبەرخۆیەوە دەیووت :-

تێناگەم . . ! ! تێناگەم . . ! نازانم مەسەلە چی‌یە . .؟؟ بڕیاری پشکینی ماڵە گومان لێکراوەکان درا بەتایبەتی ئەو ماڵاّنەی کە گومانیان لێ دەکرا نوری تیایانا خۆی شاردبێتەوە . . ئیتر نوری ئۆقرەی نەماو زانی کارلەکار ترازاوە ، ونەوێرا لەوماڵە بمێنێتەوە ، لەبەرئەوە بە عەبایەکی ئافرەتانەوە خۆی داپۆشی‌و لەگەڵ خێزانی محمود ئەستەرابادی بە جووتە بەرەو ماڵی شێخ (محمد العربي) کەوتنەرێ کە لە « بتاوین» بوو . . پێش‌ئەوەی بگەنە ئەوێ ، لایان‌دایە ماڵی خزمێکی بنەماڵەی ئەستەر ابادی . . لەوێدا یەکێکیان ناردە ماڵی محمد العربي تا بزانن لە ماڵەوەیە یان نا ؟؟ نێرراوەکە لە سەعات دووی پاش نیوەڕۆ هاتەوە لایان‌و تێی‌گەیاندن کەوا کەس لە ماڵ‌نیە ! نوری بەتەواوەتی شلەژاو ئاڵۆز بوو ، لە ترسی خەڵکەکە نەی‌دەزانی چۆن خۆی بگەیەنێتە شوێنێکی تر نەوەك لەم هاتووچووەی‌دا کەسێ بیناسێو ئاشکرای بکات بەتایبەتی ئەو خەلاّتە دە هەزار دیناریەی کە شۆڕشگێڕان تەرخانیان کرد بۆ ئەوکەسەی نوری سعید دەدۆزیتەوە وای لە نوری کرد کە ناوی خۆی لەبیر بچێتەوە بەلاّم لەگەڵ ئەو هەموو ترسەدا دڵی ئۆقرەی نەگرت‌و لەگەڵ ئافرەتەکەدا لە ماڵەکە هاتنە دەرەوەو هەردووکیان عەباو پەچەیان پۆشی‌بوو ، لە یەکێ لە کۆلاّنەکانی بەتاوین عەباکەی نوری کەمێ ترازاو بێجامەکەی بەدیار کەوت ، منالاّنی کۆلاّن کە ئەم کارەیان بینی دەستیان بەهات‌و هاوار کردو دەورەیان‌داو ووتیان ، خۆیەتی . .

نوری سعیدە نوری سعیدە ، بیگرن . . ڕزگاری نەکەن ، خەڵکەکە دەورەیان‌دان‌و لە هەڵلاّیان‌دا ، لەم کەین‌و بەینەدا هاوولاّتیەك تەلەفۆنی بۆ وەزارەتی بەرگری کردو هەواڵەکەی پێگەیاندن . . دەرحاڵ ئۆتۆبیلێکی سەربازی کە ئەفسەرێك‌و چەند سەربازی تێدا بوو گەیشتە ئەوێ . . . نوری سعید زانی هیچ چارەی نەما ، دەمانچەکەی دەرهێناو تەقەی لە خەڵکەکە کرد بەلاّم سوودێکی نەبوو . سەربازەکان خێرا گوللە بارانیان کردو کوشتیان‌و بە ئۆتومبێلێکی سەربازی لاشەکەیان بردە وەزارەتی بەرگری‌و لەوێ ئەفسەرە شۆڕشگێڕەکان چاویان بە لاشەی نوری سعیدکەوت و ئیتر هەموو لە بە
بڕوایان کرد کەوا نوریش لە دەست شۆڕشگێڕەکان ڕزگاری نەبوو . . . پاشان لاشەکەی بردرایە دایەرەی (الطب العدلي) و ئینجا بەشەو لە ئۆردوگای ئەبو غرێب شاردرایەوە .

بەم‌جورە نەخشەی شۆڕشی ١٤/ی تەمووز سەرکەوت‌و لاپەڕەکانی سەردەمی بۆگەنی زوڵم‌و زۆرداری لول‌دراو لاپەڕەیەکی نوێ کرایەوە .

# ئەو چالاکیانەی کە ئەمینداریتی رۆشنبیری لاوانی ناوچەی کوردستان لە

١ – ئەمینداریتی لە سەر ئەرکی خۆی هەشت کتێبی لە چاپ دا لەگەڵ پارەدان بە نووسەرانی ، هەروەکو کتێبی تریشی خستۆتە بەر چاپ .

٢ – ئەمینداریتی لە رێی یارمەتی دان ، کۆمەڵێ کتێبی کوردیو عەرەبی کە ژمارەی ئەگاتە بیست کتێب . . لە چاپ داوە .

٣ – لەمەیدانی ئەدەبی منالدا ، ئەمینداریتی دوو نامیلکەی رەنگاورەنگی دەرکردو بەسەر باخچەی منالانو قوتابخانە سەرەتاییەکان دا دابەش کران .

٤ – نامیلکەیەك کە بۆ رێزگرتن لە رۆژنامەنووسەکان لە ئاهەنگێك دا بەم بۆنەیەوە کرابوو ، لە چاپی دا .

٥ – دوو پۆستەری سیاسی کە بەبۆنەی لە دایك بوونی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست لە (٧)ی نیسان دەرکرد .

**لەبارەی ئاهەنگو میهرجانە رۆشنبیریەکانەوە**

١ – بەبۆنەی رۆژی رۆنامەگەری عیراقیەوە ئاهەنگێك سازکرا تیایدا(٢٤) لە رۆژنامەنووسانی ناوچەکە خەلاتو یادداشتیان وەرگرت .

٢ – ئەمینداریتی بەشداری لەو ئاهەنگەدا کەدەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی لە ١٩٨٠/١/١٢ لە شاری سلێمانی گێرای بەبۆنەی یادی دەرچوونی رۆژنامەی هاوکاری ، کردبوی کرد .

هەروەها بەشداری لە میهرەجانی رۆشنبیری کوردی کە دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی لە هەولێر بۆ ماوەی هەفتەیەك لە ١٩٨٠/٤/٢٠ وە کردبووی ، کرد .

هەروەها ئەمینداریتی میهرەجانێکی هونەری کە لە دهوك بۆ ماوەی دوو رۆژ ، لە ٤/٢ تا ١٩٨٠/٤/٣ پێك هێنا ، کە بەرێوەبەرایەتی یەکانی رۆشنبیری جەماوەری لە ناوچەکە دا بەشداری یان تیا کردبوو . وەئەمینداریتی بەشداری لەگەڵ یەکێتی ئافرەتانی سلێمانی دا کرد لە میهرەجانە تەندروستی یەکەی یەکێتی لە خێوەتی پەنابەرەکان دا کەفلیمی سینەمایی بەڵگەنامەییو وێنەی سەرۆکی فەرماندەو هەندێ نامیلکەی ئەدەبی تیاپیشان درا ، لە ماوەی سێ رۆژ دا .

هەروەها بەشداری لەئاهەنگەکانی یادی دوانزەمینی شۆرشی ١٧– ٣٠ی تەموز دا ، کرد .

**لەبارەی پیشانگاهونەری یەکانەوە**

ئەمینداریتی یەکەم پیشانگای هونەری بۆ تێکرا چاپەمەنی یەکانی لە هەر سێ پارێزگاکە دا کە لەیەك کاتداو بەسەرپەرشتی بەرێکاری سەرۆکی ئەنجومەنی جێبەجێکردن گێرابوو ، کە (٦٥) کتێبی تیابووو سێ رۆژی خایاند . پێك هێنا .

هەروەها بەشداری لە پێك هێنانی پیشانگایەکی فۆتۆگرافی لەسەر ژیانی سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسین ، کە ئەرشیفی سینەمایی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست پێکی هێنابوو ، کرد .

بەرێوەبەری وە رۆشنبیری جەماوەری لە سلێمانی پیشانگایەکی بۆ هونەرمەندی تەشکیلی خالد رسول لە سلێمانی لە ئێوارەی ١٩٨٠/٨/١٦ پێك هێنا .

هەروەها ئەمینداریتی پیشانگایەکی بۆ هونەرمەند ئاکۆ غریب لە هۆڵی مەڵبەندی کۆمەلایەتی لە سلێمانی رۆژی ١٩٨٠/٣/١٣ پێك هێنا .

# ـــداری گشتیی بەڕێوەبەرایەتی
# ـــاوەی ساڵی ١٩٨٠ دا کردوویەتی

**چالاکی شانۆگەری**

لیژنەی پشکنینی دەقەکانی شانۆگەری (٢٥) دەقی شانۆگەریی بینیو ڕێگەی بە پیشاندانی دا .

هەروەها لەلایەن بەڕەێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەرییەوە لە سلێمانی ١٩ هەڵقەی شانۆ بەناوی «شمشاڵی شوان لە ئەمتۆدیۆکانی زانکۆی سلێمانی تۆمار کرا .

ژمارەیەکی زۆر لەگۆرانیو سروودی نیشتمانیو شانۆگەری لە تلفزیۆنی تأمیمو بەغداد تۆمارکرا .

**گرتنی کۆڕی ئەدەبیو پیشاندانی سینەمایی**

١ – کۆڕێکی ڕۆشنبیری بۆ ئەدەبی کورد احمد محمد ئابلاخی لە هۆڵی یانەی وەرزشی کرێکاران لە سلێمانی ئێوارەی ڕۆژی ١٩٨٠/٣/١٤ پێکهێزا .

٢ – کۆڕێکی ڕۆشنبیری بۆ دکتۆر معروف خەزنەدار لەسەر مێژووی ڕۆهەلات ناسیی کورد ، لە سلێمانی گێڕا .

٣ – دوو کۆڕی تلفزیۆنی لەسەر هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی لە تلفزیۆنی نینویو تامیم پێکهات .

٤ – کۆڕێکی ڕۆشنبیری بۆ بەڕێز ناصر حەفید بە ناوی « فەلسەفەو زانیارییو جولانەوەی هاوچەرخ» لە سلێمانی لە ١٩٨٠/٢/٢٧ پێکهات .

٥ – کۆڕێکی ڕۆشنبیری لە سلێمانی بۆ دکتۆر نافع ئاکرەیی لە ١٩٨٠/٣/٥ کرا .

٦ – بەبۆنەی ڕۆژی شانۆگەریی جیهانییەوە کۆڕێکی تەلفزیۆنی لە تلفزیۆنی تامیمەوە لە ١٩٨٠/٣/١٨ پێشکەشکرا .

٧ – ئەمینداریێتی لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەری لە پارێزگاکانی ناوچەدا ، فلیمی سینەما بەبەردەوامی لەتێکڕا ناوچەکەداو لەهەموو مەڵبەندە گشت گوزەرو گەڕەکە میللییەکاندا بەرادەی بیست جار لە مانگێك دا پێشکەشکرد .

**یارمەتیو دەستگیرۆیی**

ئەو یارمەتییەو دەستگیرۆییەی کە ئەمینداریێتی پێشکەشی کردووە بە یەکێتی نووسەرانی کورد بەهەموو لقەکانییەوە وبۆکۆمەڵەی هونەرو ئەدەبی کوردی لە هەولێر لقەکانی لەراوەندوز ، و تیپی هونەریی هەولێرو ، یانەی ڕۆشنبیری ئاسوری لە سلێمانی گەیشتۆتە (٤٢٠٠) دینار .

هەروەها ئەم ئەمینداریێتییە بەهۆی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەری لە ناوچەکەدا هەڵمەتێکی گەورەی لە مەیدانی ڕاگەیاندندا کردو لە تێکڕا شارەکانی ناوچەو مەڵبەندە نیشتەجێیەکان دا کۆڕی ڕۆشنبیرو بەئەگاکردنەوەی کردوو . جگە لەوەی کە ئەرکی دابەشکردنی ئامیلکەو ئەدەبیاتی حزبو شۆڕش بەزمانی کوردییو عەرەبی گرتۆتەئەستۆ . هەروەها فلیمی سینەماو بەڵگەنامەیی پێشکەش بەدانیشتوان کرد . . هەروەها بەڕێوەبەرایەتی بەگەرمی بەشداری ئەو کۆڕانەی کرد کە باسی یاسای بەزۆر خوێندنو قەلاچۆکردنی نەخوێندەوارییو . گوێدان بە بەشداریکردن لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانیو وئەنجومەنی دانان لە ناوچەی کوردستان دا . هەروەها بەشداری بەگەرمی بۆ تێگەیاندنی شەڕی قادسیەی صدام دژی فارسەکانو هەقی ڕەوامان بۆ گێڕانەوەی زەوییو ئاوو وڵات کردووە .

# چالاکییەکانی ئەمینداریێتی گشتی بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەو خوێندەواری بالا

لەو هەوڵو تەقەلایانەی کە ئەمینداریێتی گشتی بەرێوەبەرایەتی پەروەردەو خوێندەواری بالاّ داویەتی لە ماوەی ساڵی رابوردودا بەشانازیەوە باس ئەکریّ .

لەو بوجەیەی کە ئەم ساڵ بۆ ئەم ئەمینداریێتیە تەرخان‌کراوە کە بریتیە لە (۸٥٤٠٦٢٩) دینار بەزیادەی (۱۹۹٦۸٦۹) دینار لە ساڵی پێشوو ، کەوتە خەرج‌کردنی لەهەموو مەیدانێکی گەشەکردنو پەرەپێدانی خوێندەواریا . .

چەندی لەووزەدابوو بۆ بەربەست‌کردنی تێکرا پێویستیەکانی قوتابخانەکانی ناوچەی کوردستان ، لەهەموو روویەکەوە کەوتە جێبەجێکردنی کاروباری خوێندن لە قوتابخانە ناوەندیو ئامادەییەکانی ناوچەکەدا ، هەروەکو(۱۱) مامۆستای دانا بۆ بەرێوەبەرێتی لەسەر قوتابخانەکاندا . . جگە لەوەی (۳۷) مامۆستای لەدەرچووانی ئامادەیی پیشەسازی پارێزگاکانی ناوچەکە دانا . . هەروەها بەم وێنەیەی خوارەوە دەرچووانی ئامۆزگاو دەزگا مامۆستاییەکانی بەسەر ناوچەکەدا دابەش‌کران :—

**هەولێر : ۳۳۰ لەدەرچووان**

**سلێمانی : ۳٦٤ لە دەرچووان**

**دهۆك : ۲۳۹ لە دەرچووان**

هەروەها لەو قوتابخانە ناوەندیو ئامادەییانەی کە مامۆستایان کەمە . . بەدەرس‌دانی زیادە چارەسەری ئەو گیروگرفتیەکراو بەم رەنگە هەموو شتێك جیّی خۆی گرتەوە .

هەروەها پاش وەدەست‌هێنانی بریارێکی رەسمی . . ئامۆزگای هونەرە جوانەکان لە سلێمانی لەم ساڵەدا کرایەوەو ئێستا ئامادەیە بۆوەرگرتنی قوتابیان پاش ئەوە توانیان هەموو پێویستیەکانی چی لە مامۆستاو چی لەشتی تر بۆ دابین بکەین .

هەروەها بۆدانانی بناغەی زانکۆیێك لە هەولێر لە هەوڵو کۆشش‌داین ، وەبۆ ئەم مەبەستە پیرۆزو گرنگە لیژنەیەکی تایبەتی لە بارەگای ئەم ئەمینداریێتیەدا پێك هێنرا بۆ لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەم پرۆژەیەو پێشکەش‌کردنی پێشنیارو راسپاردە بۆ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی جێبەجێکردنو لە دوایدا بۆ خستنە بەرچاوی وەزارەتی خوێندەواری بالاّو لێکۆڵینەوەی زانستی .

هەروەها ئەم ئەمینداریێتیە رێگەی بە (۳۱) مامۆستا دا بۆ وەرگرتنی بەڵگەنامەی بەرز لە ناوەوە دەرەوەی وڵات وەکو لەخوارەوە روون‌ئەکرێتەوە :—

**دوکتۆرا ٤**

**ماجستێر ۱۸**

**دبلومی بەرز ۲**

**بەکەلۆریۆس**

**۳۱/۷ لەناو وڵاتدا**

هەروەها لە بوجەی ئەم ساڵ دا دروست‌کردنی دەزگایەك بۆ بەرێوەبەرێتی گشتی پەروەردەی سلێمانی هەیەو ، هەوڵ ئەدریّ بۆ تەرخان‌کردنی زەوی بۆ بناغەدانانی ئامۆزگایەکی ئیسلامی لە سلێمانی دا .

هەروەها لە هەولێرو دهۆك لەم رووەوە هەنگاوێ زۆرە بۆ کردنەوەی بارەگای ..کتی نیشتمانی قوتابیانی عیراق لق هەولێرو . بناغەدانانی ئامۆزگایەکی ئیسلامی لە هەولێر یەکێکە لە چالاکی یەکانی ئەم ئەمینداریێتی یە .

و لە خوارەوە سەر ژمارەیەك خوێنەکەنیەوە کە بریتی یە لە بەراورد کردنێك دەربارەی زیادبوونی قوتابخانە لە نێوان سالآنی ( ١٩٧٤ – ١٩٧٥) وە سالآنی ( ١٩٧٩– ١٩٨٠) :–

| چەشنی قوتابخانە | ژمارەی قوتابخانەکان سالآنی(١٩٧٤ ١٩٧٥) | ژمارەی قوتابخانەکان سالآنی(١٩٧٩ -١٩٨٠) |
|---|---|---|
| باخچەی ساڵان | ٦ | ٣٦ |
| سەرەتایی | ٥٥٣ | ٢٤٢٠ |
| ناوەندیو ئامادەیی | ١١٨ | ٢٨١ |
| قوتابخانە پیشەیی یەکان | ٧ | ١٧ |
| ئامۆزگاو دەزگای مامۆستایان | ٣ | ٧ |
| ئامۆزگای ئاینی (سەرەتایی و ئامادەیی) | ٣ | ١٤(٧)ئەوان دەرچووانی سەرەتایی |
| قوتابخانەی تازە پێگەیشتووان | | ٦ |

وا لە خوارەوش سەرژمێریەك دەربارەی ژمارەی قوتابیانی ناوچەکە لە دووکاتدا بلآوئەکەینەوە . . و بەراوردێك لە نێوان سەر ژمێری سالی (١٩٧٤–١٩٧٥) و سالی (١٩٧٩–١٩٨٠) دا ئەکەین ، بۆ ئەوەی رادەی زیادبوونی قوتابیان بەباشی بزانین :–

| چەشنی قوتابخانە | ژمارەی قوتابیان (١٩٧٤ ١٩٧٥) | ژمارەی قوتابیان (١٩٧٩ ١٩٨٠) |
|---|---|---|
| باخچەی ساڵان | ٩٠٧ | ٤٧١٠ |
| سەرەتایی | ٨٦٥٩٨ | ٢٩٤٨١٦ |
| ناوەندیو ئامادەیی | ٢١٦٤٧ | ٦٣٢٥٧ |
| قوتابخانە پیشەیی یەکان | ١٦٥١ | ٨٢٠٥ |
| ئامۆزگاو دەزگای مامۆستایان | ٢٧٩٠ | ٢٩٨٤ |
| ئامۆزگا ئاینی یەکان (سەرەتایی و ئامادەیی) | ١٢٢ | ٢٨١٧ |
| قوتابخانەی تازە پێگەیشتوان | | ٨٢٥ |

دەربارەی قەلاچۆکردنی نەخوێندەواریو بەزۆرخوێندن فێربوون .

هەلمەتبردن بۆ قەلاچۆکردنی نەخوێندەواریو بلآوکردنەوەی بەزۆر زانستیو خوێندەوارکردنی لە ناوچەی کوردستان دا لەم سالآنەی رابووردودا بە چالاکانە براوە بەرێوە ، وا لە خوارەوە سەرژمارەی ئەوانە ئەنووسین کە بەر یاسای بەزۆرخوێندەواری کەوتوون لە ناوچەکە دا :–

| ناوی پارێزگا | ژمارەی ئەوانەی یاسا ئەیا نگرێتەوە سالی(١٩٧٨-١٩٧٩) | ژمارەی ئەوانەی یاسا ئەیانگرێتەوە سالی(١٩٧٩ ١٩٨٠) |
|---|---|---|
| هەولێر | ١٧٣٠٦ | ١٨٣٨٧ |
| سلێمانی | ٢٣١٥٦ | ٢٦١٧٣ |
| دهۆك | ٩٣٦٠ | ٨٩٧٩ |

مەلبەندەکانی قەلاچۆکردنی نەخوێندەواریو قوتابخانە گەلیەکان :–

لە خوارەوە سەرژمێری یەك بۆ ژمارەی ئەوانەی لە مەلبەندەکانی قەلاچۆکردنی نەخوێندەوارو قوتابخانە گەلی یەکانی سالی (١٩٧٩–١٩٨٠) لە پیاوو ئافرەت پیشان ئەدەین :–

| پارێزگا | بنچینە | تەواوکەر | گەلی | کۆ |
|---|---|---|---|---|
| هەولێر | ٢٠٢٤ | ١٢٤٢٨ | ٦٢٦٨٧ | ٧٧١٣٩ |
| سلێمانی | ٦٦٥٨ | ٢٣٢٨٠ | ٤٦٤٧٤ | ٧٦٤١٢ |
| دهۆك | ١٨٠٦ | ١٠٨٥٣ | ٢٧٠٥٨ | ٣٩٧١٧ |
| پاشکۆ | | . | | ٢٣٠٣٨ |
| کۆ | ١٠٤٨٨ | ٤٦٥٦١ | ١٣٦٢١٩ | ٢١٩٣٠٦ |

هەروەها ئەم ئەمینداریێتی یە لە پێناوی بەرێوەبردنی کاروانی پەروەردە کردنو قەلاچۆکردنی نەخوێندەواری هیچ کەم تەرخەمی یەکی نەنواندووەو هەرچی لە توانادا بووە کردوویەتی . بۆ وێنە ، بەسەرۆکایەتی ئەمینداری گشتی دوو کۆری فراوان بەسترا –

**یەکەم** : لە ١٩٨٠/٦/١٧ کورێکی بۆ سەر پەرشتانی پەروەردەیی ناوچەکە کرد کە تیایا لە چەوتو چەوێلی خۆیان دوانو چارەسەرکردنیان بە شێوەیەکی دیموکراتی بۆ پیکرد

**دووەم** کۆرێکی تر لەگەل تیکرا بەرێوەبەرانو مامۆستایان بۆ لێکۆلینەوە لە هۆی دواکەوتنی قوتابیان لە بەراوردکردنی سالآنداو . دانانی رێو شوێنی دروست بۆ چارەسەرکردنی کرا .

# پێوەندی کورد بە کاردۆخیانەوە

دکتور جمال رشید احمد

ئەو پۆشراوی‌و لێڵی‌یەی ، کە مێژووی کۆنی گەلی کوردی گرتۆتەوەو ئەو هەوڵ‌و تەقەلایانەی ، کە دراوە بۆ یەکبەستنی تایبەتێتی‌و بنەمای جۆراوجۆری ، کە سنوور بۆ ڕوواڵەتی ئەم گەلە — بەر لە هەمووان نێوی نەتەوەیی — دادەنێ ، لەگەڵ ئەو نێوانەی ، کە لە شێوەو لێوی نێزیکن ، هەروا ئەو لێکۆڵینەوانانەی ، کە تەنیا لەبەر ڕۆشنایی ئەو ناوانەدا لە ڕووداوانی مێژوو کۆڵدراوەتەوەو هێنانەکای هێندێك

بیرورا . . کە لەسەر باوەڕی تاکە کەس دەوەستێ لەرووی پەرەسەندنو نەمانیدا ئەمانە هەموو بوونە هۆی سەرەکی پەیدا بوونی جیاوازی نێوان ئەو تیوری یانە ، کە پسپۆرانی ئەم بوارە لە لێکۆڵینەوەکانیان داو خستویانەتە روو ، کە ئەمەش بۆ هۆی سەرهەڵدانی رێك نەکەوتنو ناتەبایی تایبەتێکانی گەلی کورد لە ئەنجامدا جیاوازی بیرورا دەربارەی نەژادی ئەم گەلو ناوی نەتەوەی پەیدابوو .



ئەوەی لە بواری زانستیدا باوە ، ئەو تیوری یەیە ، کە دەڵێ نەژادی کورد بۆ کاردۆخی یان دەگەرێنەوە ، باوەکو نولدکە «١» و زانایانی دی لەو باوەڕەدان ، کە نەژادی کورد بۆ «کیرت» یان «٢» دەگەرێنەوە . ئەم بیروباوەڕەی نولدکە لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا لە لایەن ڤایسباخ «٣»ەوە پەسەندکراوە ، بەڵام ج . ك . درایفەر هەوڵی ئەوەی دا کە ئەم دوو ناوەو ئەو ناوانەی کە لەم ناوانە لەرووی شێوەوە نێزیکن بەیەکەوە بەستێت ، بۆ ئەوەی پێوەندی ئیتمۆلۆژی نێوان ئەم ناوانەو ناوی کورد بدۆزێتەوە (٤) .

هەتا ئێستە ئەم بیرورایانە باوە . دە دەڵێ کاردو+خ+ۆی (Kaesovxoi) – کە دانشتوانی کۆنی ناوچەی بۆتانی ئەمڕۆن – بە باپیرە گەورەی کورد دادەنرێن ئەم ناوەش یەکەمین جار لە لایەن سەرکردەی لەشکری یۆنانی کسنوفونەوە (Xenophon) لە ساڵی «٤٠١» پ . ز . نوسراوە .

هۆی سەرەکی ئەم جۆرە باوەڕە لە نێزیکی گۆکردنی ئەم دوو ناوەیەو هەروا لەبەر ئەوەشە ، کە وولاتی «کاردو» خۆی ئەمڕۆ بە بنکەی سەرەکی کۆبوونەوەی کوردان دەژمێردرێت (٥) .

لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی هێندێك دیاردەی کوردو «کاردۆخ» یان ئەم دوو خاڵە بە شێوەی گومانکراوی دەمێننەوە .

زاراوەی کاردو ناوێکی کۆنی کۆمەڵە مرۆڤێکی شاخاوی یە ، کە بەری رۆژهەڵاتو ژووررووی روباری دیجلەو چاوگەکانی بە نیشتمانی خۆی داناوە . ئەم ناوە بۆ یەکەمین جار بەشێوەی کاردوخۆی (Kaesovxoi) لە کتێبی «ئاناباسیس» دا هاتووە ، کە پێشەوای یاخود سەرکردەی یۆنانی کینوفۆن دایناوە لە ئەنجامی تێك شکانی دە هەزار یۆنانەکان لە شەری کۆناکسادا (٦) ئەم پێشەوایە دەربارەی کاردۆخیان وتوویەتی کەوا (نەکەوتبوونە ژێر فەرمانڕەوایەتی نە ئێرانو نە ئەرمەن) (٧) .

لە لایەکی ترەوە کورد

ناوی ئەو گەلەیە ، کە لەو وولاتە شاخاوی یەدا دەژی ، کە دەکەوێتە بەری رۆژهەڵاتی تورکیاو رۆژئاوای ئێران وباکوری عیراق ، زمانەکەشی بەر گروپەی زمانانی ئێرانی رۆژئاوایی دەکەوێ .

فلجیفسکی دان بە هەمان بیرورای کسینوفۆندا دەنێ کە دەڵێ : لە کاتی گفتوگۆکردنی یۆنانیێکان لەگەڵ کاردۆخێکاندا پێویستیان بە هیچ کەسێکی وەرگێر نەبووە لەوانەی ، کە زمانی فارسیان زانیوە بۆ ئەوەی لێك بگەن ، بەڵکو یۆنانیێکان پشتیان بەو دیلانە بەستوە ، کە دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بوونو بەهۆیانەوە ئازادبوون دوای ئەوەی ، کە رێگەیەکی بێ ترسو ستەمیان پیشان داون (٨) .

لەراستیدا کسینوفۆن چەند جارێك رۆڵی ئەو وەرگێرانە پیشان دەدا ، کە لە گەشتەکەیدا هاریکاری کردوون لەو وولاتانەدا کە غەیری وولاتی کاردۆخی بوون لەوانە پیگرتیوم (Pigretom) و تیسافرنو هی دی ، بەڵام پرۆفیسۆر ق . کوردۆ لە ووتاریکیدا دەڵێ : (یۆنانیێکان بە هاوکاری وەرگێر لە کاردۆخێکان گەیشتون و لە هەمان کاتیشدا دان بەوەدا دەنێ کە هەتا ئیستە هیچ لێکۆڵینەوەیەك نەیتوانیوە بەڵگەیەکی ئەوتۆ بدا بەدەستەوە بۆ راستی ووتەکەی ئاکوبۆڤ دەربارەی چۆنیەتی گفتو گۆکردنی یۆنانیێکانو دانیشتوانی ئەم ناوچەیە (٩) هەروا کوردۆییف لەو باوەڕە دایە کەوا «شێوەی لێك گەیشتنی خواررووی ئەم وولاتەدا پێڕەوی کراوە» . . .(١٠) ئەوەی شایەنی باسە کسینۆفۆن دان بەم رایەی کوردۆییف نانێ بۆیە نووسەری نێوبراو بەسەر سورمانێکەوە بەرامبەر ئەم پرسیارە گرانە دەوەستێو دەڵێ : (ئەی دەبێ یۆنانیێکان بە چ زمانێك قسەیان لەگەڵ کاردۆخێکان

ـەتیی ـە کاتێکدا ئەگەر پشتیان بە هیچ ـمێکی وەرگێر نەبەستێ لە کاتی ـحەـن دا ؟) کۆردۆییف وەڵامی ئەم ـپرەی خۆی دەداتەوە دەڵێ: ـوەڵامەکە تەواو قایمکەر نی‌یە . . . ئەگەر ـێمە دان بەوەدا بنێن کە زمانی کاردۆخی ـمێکی ئێرانی نی‌یە، دەگەینە ئەو ـەنجامی، کە بڵێین کاردۆخێکان لە ـەیەکی ئەوتۆی دیاری‌کراودا بوون، کە ـەرووی باری کۆمەڵایەتی‌و کەلچەردا زۆر ـێش‌کەوتوون‌و لە هەمان کاتدا ـەرمانڕەوایی وڵاتەکە بوون، بۆیە هێندێك مەرجیان بۆ یۆنانێکان داناوە، هەروا پێوەندی یەکانی رابوردوویان گەیشتۆتە پلەیەك، کەوا لەنێو یۆنانێکاندا وەرگێری وایان هەبووە شارەزایەکی باش ـە زمانی کاردۆخی‌دا هەبووە وهەروا بە پێچەوانەش . . .

بۆ ئەم رایانە هیچ بەڵگەیەکی مێژوویمان بە دەستەوە نی‌یە .) . . .(١١) هەر بۆیە پرۆفسۆر کوردۆییف لەو باوەڕەدایە کە (گفت‌وگۆی نێوان یونانی‌وکاردۆخێکان بە زمانێکی ناوچەیی نەبووە، بەڵکو بە زمانی فارسی وەیا زمانێکی ئێرانی بووە)،

بۆیە کۆردۆییف دەڵێ: (کاردۆخێکان کۆمەڵێك بوون، بە دیاردەیەکی ئەتنیکی تایبەتی‌و لەروی زمانەوە سەر بە زمانێکی ئێرانی بوون، کە ئەوسا لە کوردستانی کۆن‌دا باوبووە و باپیرەی گەورەی کوردی ئەمرۆن) هەروەها دەڵێ (کاردۆخ لە یەك کات‌دا نێویکی نەتەوەیی و زمانەوانی یەو هەروا واتایەکی ئەتنیکی نەتەوەییش دەبەخشێت) (١٢)

پرۆفیسۆر کۆردۆییف پشت بە ووتەکانی مامۆستا رەشید یاسەمی دەبەستێو دەڵێ: (ووشەی کردك وەیا کردوك هەروەکو سترابون باسی دەکات واتای هوزە بەهێزەکانی ئێرانی دەبەخشێت)(١٣)

گەر دانمان بەراستی ئەو بیروڕایانەدا هێنا، کە پرۆفیسۆر کۆردۆییف خستوونیەتە روو، ئەوە بە پێچەوانەی ئەو هەموو تیوری‌یانە دەوەستێن، کە پێوەندی نێوان کوردو کاردۆخی‌و کارداکای سۆمەری (١٤) دەخاتە ڕوو لە یەکەوە ئەو بەراوردانەی کە کراون لەنێوان ئەم ناوانە زاراوەی سامی«کاردو»، کە واتای بەهێز وەیا شەڕکەر دەگەیەنێت لە لایەکی دی . ئەمەش ئەو تیوری‌یەیە، کە درایڤەر بایەخی پێداوەو ناتوانرێت باوەڕی پێ بکرێت هەر وەکو کۆردۆییف کاردۆ دەبە ستێتەوە جیهانی ئیران، چونکە پەیدابوونی ئەوخێڵانەی کە بەزمانی ئێرانی دەدووان لە رۆژ هەڵاتی نێوەڕاستدا لە سەرەتایی هەزاری (١٠٠٠)ی یەکەم پ .ز . پەیدا بوون (١٥)بەپێی رۆشنایی ئەو نوسراوانەی ئاشوریان، کە دەربارەی گوێزانەوەی خێڵەکانی ئێرانی‌یە بۆ بەری رۆژئاوای ئێران و باکووری عیراق، بەپێی ئەو کاتەی کە پێشان‌دراوە بیرو راکانی درایڤەر لەو بۆچوونانە دوور دەکەونەوە، کە پێوەندی بە کوردەوەیە (بەوەی کە کۆمەڵێکن بە زمانێکی ئێرانی قسەدەکەن) لەگەڵ ئەو نێوە کۆنانەی، کە خاوەنەکانیان لە هێندێک ناوچەی کوردستانی ئەمرۆدا ژیاون لە پێش ئێرانی‌یەکان، چونکە سەرکەوتنی سوپایی‌و رامیاری میدی‌کان بەسەر ئاشوریەکان‌دا لە کۆتایی سەدەی حەوتەمی پێش زایین بووە .

کە لە ئەنجامدا خێڵەکانی میدی بەرەو رۆژئاوا هاتن . ئەمەش بەر پەچی ئەم راستی‌یە نیە بەوەی، کە هێندێك خێڵ . کە بە زمانێك لە زمانانی هیندو ئەوروپی دوواون ئەم ناوچەیەدا لە بەشی یەکەمی هەزاری دووەمی پ .ز . ژیان‌و کیشوەری ووڵاتی میتانی‌یان دامەزراندووە، کە سنوری گەیشتبوە روباری دیجلەو فورات، لە دوایی‌دا فراوان بوو، تا گەیشتە لێواری رووباری عاصی، ناوی پایتەختی ئەم ووڵاتە واشوکانی بووە، کە شوێنەوارناس – مسیو هروزنی – ناوچەی – سەرکانی– کە دەکەوێتە سەر لێواری رووباری خابوور بە شوێنی ئەم پایتەختە دادەنێ، کە ئەمەش پێوەندیێ ئەم دانیشتووانانە بە کەلچەری هندو ئەوروپی بەهۆی ئەم کیشوەرە کۆنەوە دەخاتە روو، بەڵام ئەم ووڵاتە ئێرانی نەبووە .

هەروەها کسینوفۆن بە شێوەیەکی دیارو ئاشکرا ووڵاتی میدیا لە ناوچەکانی شاخاوی کاردۆخیان جیادەکاتەوە، کە دەڵێ: ئەوەی یەکەمیان دەکەوێتە بەری رۆژهەڵاتی رووباری دیجلە لە باکووری عیراق‌دا و ئەوەی دووەمیان لە ناوچەی بوهتان کە نێوی (Ta kaedovxzia Oey) لێناوە . لەم بارەدا گەر باوڕمان بەوەدا هێنا، کە کورد نەوەی کاردۆخیان بن یەکسەرو بە زمانی کوردی دوابن، ئەوسا دەبێ ئێمە واز لەو تیوری‌یە بێنین، کە دەڵێ کورد وەکو گەلێک وەیا وەك زمانێك بۆ میدییەکان دەگەرێتەوە، کە مینورسکی لە ساڵانی دوایی ژیانی‌دا هەولێ چەسپاندنی‌دا . (١٧) لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بڵێین، کەوا

میدیی‌ەکان کاریگەری‌یەکی راستەوخۆیان هەبووە لەباری گۆران . شێوەی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە ، کە ئێرانی نەبوون‌و لە هەرێمە شاخاوی‌یەکانی باکووری وولاتی نێوان مسیۆبۆتامیاو بەری رۆژ هەلاتی ئاسیای بچووك‌دا ژیاون ، بەلام ئەم گۆرانە دوای سەدەی شەشەمی پێش زایین (دوای رووخانی نەینەوا لە سالی ٦١٣ ب.ز.)بوەو ئەوەی شایانی باسە کسینەفۆن لە کۆتایی سەدەی پێنجەمی پێش زایین‌دا بەم وولاتەدا تێپەریووە بۆیە نابێ دان بەوەدا بنێن ، کە کاردۆخی ئێرانی بن و گۆرانێکی تایبەتێی نەتەوەییان دوای ماوەی سەدەیەك هاتوەبەسەر .

لەپالْ ئەوەش‌دا نێوی کاردۆخیان لە زۆر بۆنەدا لەگەلْ خێلەکانی ئێرانی نەهاتووە دوای ئەم کاتەش وە سەر بە-دەسەلات‌دارێتی نە ئێران و نە ئەرمەنیش نەبوون ، هەر وەکو لە سەرەتای ئەم بابەتەدا باسکرا بەلام چەمکی کردك ، ئەگەرچی لە لایەن (سترابون)ەوە باس نەکراوە(١٨) ، بەراستی لەو چەمکە فراوانە دوور ناکەوێتەوە ، کە هێرۆدۆت بۆ هێزەکانی کارداکیس بەکارهێناوە : ئەم هێزانە لە ئەو چینە شەرکەرە نیزامی‌یەی سوپای دارای هەخامەنشی پێك‌هاتووە ، کە لە بنچینەدا لەوکەسانەدا دروست‌بووە ، کە سەر بە خێلی شوانکارەی ئێرانی جۆراوجۆرو تیرەی کۆچەر بووە بەنێوی کارا (Kaea) کە لە وشەی کورد دەچێ لەرووی واتای چینی لە سەدەکانی نیوەراست‌دا وەیا قوزاق ، کە لەگەلْ رووس‌دا بوون لە شەرەکانیان‌دا ، بۆیە رەسەن‌و تایبەتێی دیاری‌کراوی نەتەوەییان نەبووە .

لە لایەکەکی ترەوە گەر (کارد خۆی) بەنێوێکی ئەتنیکی نەتەوەیی بۆ کۆمەلێك خەلك دابنێن ، ئەوا ئەو ناوە بۆ نێوێکی جوگرافی نەك نەتەوە پەرەی سەندووە . ، بەواتا ناوی کورد بەشێوەیەکی پەرەسەندوی ناوی کاردوو وەیا قردو ینیە ، نێوی قردو لە لایەن ئارامی‌یەکان بەکارهاتووە ، چونکە تێکەلاوێکی راستەوخۆیان بەم ناوچە جوگرافییەوە هەبوو کە لە شێوەی (بیت قردو) دابووە وە لە سەر دەمی ئیسلامی‌دا لە شێوەی (بقردی وەیا قردی) دابووە بەلام ناوی کورد لە سەردەمی ساسانی‌یەوە . هەر وەکو خۆی ماوەتەوە . ئەمەش ئەو راستیە پیشان دەدا ، کەوا هیچ پێوەندییەك لەنێوان ئەم دوو ناوەدا نی‌یە .

کۆنترین سەرچاوەیەکی ، کە نێوی کوردی بەشێوەی ئێستەی تێدا هاتبێ لە سەردەمی ساسانی‌دا بووە (سەرەتای سەدەی سێیەمی زایینی) ، بەلام هیچ جۆرە سنورێکی جوگرافی ئەم ناوچەیەی دەست نیشان نەکردووە ، کە تێی‌دا ژیاون . هەر وەکو لە نامەی ئەردوانی پێنجەم دوا شای پورث فرتی‌یان ، دیارە ، کە بۆ ئەردە شێری کوری پاپەگ -دامەزرێنەری دەولەتی ساسانی – ی ناردووە ، ئەم ناوە هەموو هۆزێکی کۆچەری گرتۆتەوە بێ رچاوکردنی رەچەلەکی نەتەوەییان .(١٩) لە کتێبی (کارناهك اردشیر بابکان)دا ناوی مادك Madik – کە پاشای کوردان‌بوو ، و دژی ئەردەشیر بووە دێ ، واتای پاشایەك لە پاشایانی ئەو تیرانە دەگەیەنێت ، کە ئێرانی بەنێوبانگ بووە لەرووی پێك‌هێنانی کارگێری لە سەردەمی فەرمان‌رەوایی پورثی یان‌دا (٢٠) . (بارعبرایی) نێوی کارداوایە (Kardawayea) و کوردانەیە (Kurdanaye) نێوێکی نەتەوەییە بەجیا لەیەك هێناوە کە ئەمەی دواییان بەرامبەری وشەی (کوردان)ی ئێرانی‌یە بەخستنە سەری نیشانەی (آن) ی کۆی ئێرانی لەگەلْ نیشانەی ناسیاری سریانی (آبە) ئەمەش بە روون‌و ئاشکرا دیارە ، کە دەلێ :– (کوردانایە ئازاد بوون و لەم کاتەدا لە لایەن عەرەبەوە موسلمان‌کران ، چونکە پاشایەك لەنێوانیان‌دا هەلکەوت کە نێوی (مهدی چاوەرێ کراوی) ی لە خۆی نابوو ، جا نێوی مەسیح‌و گیانی قوودس وە کۆمەلێك خەلکی لە خۆی کۆکردبۆوە و بە چیاکانی وولاتی کارداوایە دوورگەی ابن عمر – نێوێکی جوگرافییە نەك نەتەوەیی .

ج.ر. چەکیان هەلگرتبوو و فەرمان‌رەوایەتی مأمونی هێنابووە لەزرە ، بۆیە سەرۆکی سوپای – حسن ، – ی ناردە بەرەنگارکردنی ، کە لە ئەنجام‌دا لە تۆری عابدین دا بە دیلی گرت لە کاتێك‌دا ، کە دیری (قلرنامین) ی رووت دەکردەوە و کوردانایە / کورد – نێوێکی نەتەوەبیە – ج.ز/بەزین .

هەروا بار عبرایی) بەردەوام دەبێو دەلێ :– (لەسەردەمی معتصم‌دا (٨٤٢) زایینی پێشەوای کوردایە (Kurdaye) هەمان ناوە بەبێ نیشانەی کۆی ئێرانی (– آن)– ج.ر./ لە وولاتی قاردو Qardu یا قردودا/ شێوەی پەرەسەندووی کاردو وەیا کردووە ج.ر.(٢١) یافی بووە .

بەپێی ئەوانەی سەرەوە . ناتوانین بیروراکانی درایڤەر وەرگرین ، کە نێوی

ئەوەد کاردۆخیان بەیەکەوە دەبەستێت هەروا نێوی کاردۆخییان بەکارداکای سۆمەری بەهۆی بەستنەوەی بەزاراوەی ــمی (کاردو) ، کە واتای بەهێز وەیشەرکەر دەبەخشێت (٢٢) هەروا ئەم ـونەی بەناوی یونانی و رۆمانی ناوچەی کوردیینی شاخاوی بەستەوە ، کە پێی گوتراوە (Ta Tun Gordyaiun Khuria)

لەگەل نەبوونی بەڵگەی تەواو دەربارەی بنچینەی ئەو پێوەندییە رەگزیو زمانەوانییە ناتوانرێ کورد (وەکو گەل ونێوو واتا) بە کاردو (وەکو کۆمەڵە خەڵکێكو نێوێکی جوگرافیو واتایی) بە قایمی ببەسترێ ، چونکە لێکۆڵەرەوەی ئەم بابەتە روو بەرووی دوو باسی نادروستو نارێك دەبێت ، بەڵام لە کاتی زانینی راستی ئەم ناوە بە رێگەی بەشوێندا چوونی رووداوانی مێژوویدا لە وولاتی کوردستاندا هەروا تێگەیشتن لە نێوەرۆکی کە واتای کۆچەر دەبەخشێ ئەم رووداوانە راستو واقیع دەبن ، بۆیە ووتەکانی ابن الأثیر دوور لە راستی نینو لەم چەمکە دوور ناکەونەوە کاتێ کە ئەو کوردانە بەخێڵی کۆچەر نێودەبات وەك دەربارەی سووتانی پەیامبەر برایم دەڵێ :—

(عبدو للەی کوری عومەر دەڵێت کە پیاوێك لە عەرەبی ئێران دەستی بۆ درێژکردبوو ، ووتوویانە ئایا فارس عەرەبییان هەیە ؟ ووتویەتی بەڵێ کوردان عەرەبی فارسانن و ئەم پیاوەش ناوی هیزن بووە . . . . هتد) .(٢٤)ئەوەی گومانی تیدا نییە ، ئەوسا نیوی (الاعراب) لە کۆچەران نراوە ، نەك لە کۆمەڵێك ، کە تایبەتێتی نەتەوەیی دیاریکراوی هەبووە ، کە چەندین کۆمەڵانی کۆچەری گەلانی تری گرتۆتەوە ، بەڵام مانای ووشەی کاردو لە بەکارهاتنیدا لەگەڵ ئەوەی فراونتر نەبوو هەر وونیش بوو لە دوای ئەوەی وولاتی بقردي نێوی جەزیرەی (ابن عمر) ی لێنرا ، بەڵام واتای زمانەوانی ووشەی کاردو لە زمانانی سامیدا ،کە واتای بەهێزو شەرکەر دەبەخشێ ، و شەی گورد (Gurd) بەرامبەر بوو لەنێو زمانانی ئێرانیدا وە گۆرد (Gord لەنێو زمانانی هیندو ئەوروپی یەکانی تردا .

بەم جۆرە لەگەڵ بەسەرچوونی رۆژگار ، ئەم زاراوانە لەم زمانانەی لە پێشوو نێوبراوداو پەیدابوون ، کە نێوی کۆمەڵە خەڵكو خێڵی کۆچەر بوونو ژینیان بە کۆچەرایەتی بردۆتە سەرو چەند تایبەتێتکی هاوبەش یەکی خستوونە دوور نییە ئەو خێلانەی ، کە بە نەژاد ئێرانی بوون بەرەو وولاتی کوردستان هاتبنو هەمان تایبەتێتیشیان هەبوویێ وەك (ئاساگارتیا ، ماردی ، سکیثي ، کیمیریو هی دی لە سەردەمی میدی) هەروا ئەو هۆزو خێزانانەی ، کە سەر بە خێزانی پاشای ساسانی بوونو لە ناوچەی کەرخا بیث سلوخ ، ژەنگار ، چیای داسنو هێندێك شوێنی دی لە ناو چەی وولاتی بیث جرمی و حذیب نیشتەجێ بوون ، بەڵام لەم وولاتانەی هەرەدوایی لە دواتردا روویان لێ کردو تێیدا مانەوە (٢٦) لەبەر ئەمە بۆیە ف . مینورسکی هەر وەکو لە (دار المعارف الاسلامیة)دا لە ساڵی ١٩٢٧ دا نووسیویەتی دەڵێ : کورد لە رۆژهەڵاتەوە رۆژ ئاوایی فارس هاتوونەتە رۆژئاوا نێوە راستی کوردستان لە ئەنجامی سەرکەوتنی میدییەکان بەسەر ئاشورێکانو . وولاتانی بچووکی تردا لەم ناوچانەدا . . .(٢٧) ئەم بیروڕایەیڤ . مینورسکی کزە ، چونکە چۆن گەلێك لەبەر رۆژهەڵاتی ئێرانەوە بەرەو رۆژ ئاوا بێتو لەنێو کوردستاندا بڵاوبێتەوە ، ئەو خێڵە شەرکەرو بەهێزو یەكگرتووانە بتوانیت بخاتە ژێر دەسەڵاتداریتی خۆی ، لە کاتێکدا نە ئاشورو نە ئورارتو بەدرێژایی مێژووی دێرینیان نەیانتوانیوە بەسەریان دا دەن و بیان خەنە ژێر فەرمانڕەوایەتی خۆیان . کاردۆخی یەکێك بوو ، لەو کۆمەڵانە . کە نەکەوتونەتە نە ژێر دەسەڵاتداریتی ئێرانیانو نە ئەرمەنان هەروەکو لە سەرەتای ئەم لێکولینەوەیەدا باس کرا .

لە راستیدا کورد وەکو نێوێك لە ناوچە شاخاوێکانی کوردستاندا پەیدابووە . بۆ ئەوەی واتای خێلانی خاوەن بنیاتی کۆمەلایەتی بگەینێت ، کە بە خێلاتی کۆچەری ئێرانی دەچێت . بێ ئەوەی تەماشای بنچینەو رەچەڵەكو زمانانی بکرێت ، بە واتایەکی دی . کورد لە باشورو نێوەراستی ئێراندا باپیرەی گەلی کوردی کوردستانی ئەمرۆ نەبووە بەڵکو ئەسڵی نێوی ئەم گەلە بووە .

بەواتا نێوی کورد بە واتای ئابوری ئێرانی بۆ بەری رۆژئاوای ئێران (چیاکانی زاکروسو کوردستان) گۆزراوەتەوە لە ئەنجامی هاتنی خێلانی ئێرانی لە رۆژ هەلاتو باکوری رۆژهەلات بۆ رۆژئاوا . کە لە دەوروبەری سەدەی نۆزدەمی پ .ز . بەهەر حاڵ چەمکی ئەم نێوە لە رۆژئاوای ئێراندا بلاوبۆوە بە بلاوبوونەوەی زمانانی ئێرانی لەم ناوچەیەدا . لە لایەکی ترەوە هەر وەکو کسینوفون دەربارەی کاردۆخییان وتوویەتی کەوا خێلی

[redacted]

نیشتەجێبوونو خەریکی کشتوکاڵی بوونو بەشێوەیەکی پێشکەوتوو لەوانە دروستکردنی مەی (٢٩) .

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم سەروکە یۆنانییە سەری لە جۆری خانو بەری ئەرمەنیان سورماوە ، بەڵام هونەری بنیاتنانی لەلای کاردۆخیان لەچاو نەتەوەکانی دەوروبەریاندا پێشکەوتوو بوە ، بەرگریکردنی ئەم جووتکارانە لە نیشتمانی خۆیان نیشانەو بەڵگەی پێوەندییانە بە خاکیانەوەو پارێزگاری لادێکانیانە . کە ئەم هەڵوێستە لەلای کۆچەران نابینرێ . هەروا ئەم سیفەتە لە ماوەی سەدەیەکدا ، یان دوو سەدەدا لە هیچ کۆمەڵێکدا پەیدا نابێت ، بۆیە ئەم خێڵە وا هاتۆتە بەرچاوی سوپای یۆنانی لەو رۆژانەی ، کە بەم ناوەدا تێپەربون ، کەوا دانیشتوانی کۆنی ناوچەی بوهتانی ئەمرۆن . ئەمانەو لەگەڵ ئەو راستییانەی ، کە لەوەوبەر باسکران ، ناتواندرێ باوەر بەوە بهێندرێ ، کەوا کاردۆخی ئێرانی بن و خێڵێك بووبن و لە ئێرانەوە هاتبنە ناوچەی بوهتانو باری ئابوریو کۆمەڵایەتی گەیشتبێتە رادەیەکی پێشکەوتن ، کەوا دیاردەی ژیانی رۆژانەیان جێگەی سەرسورمان بێت لە لایەن یۆنانێکانەوە لە کۆتایی سەدەی پێنجەمی پێش زایین .

لە هەمان کاتدا دانیشتوانی نا ئێرانی دی دراوسێی کاردۆخیان بوون ، کە لە بەری رۆژهەڵاتو باشووریدا دەژیان وەکو گوتی ، لۆلۆیی ، خالدی ، مانایی . مامۆستا توفیق وەهبی لەو باوەرەدایە ، کە ئەمانە هیچ پێوەندێکیان بە گەلی کوردی ئەمرۆدا نییە ، کە لەرووی زمانەوە بەر کۆمەڵە خێزانی ئێرانی دەکەوێت (٣٠) .

ئەمانەو کە کاردۆخیان یەکێکە لەمانە رۆڵی خۆیان چ زۆرو چ کەم لە قۆناغی تایبەتێدا لە مێژوودا بینیوە بۆ تەواوکردنی مەرجەکانی نەتەوەیی بۆ کورد ، بەڵام نەگەرانەوەی باری زمانەوانی وەیا ژیاری بۆ ئەسڵی نائێرانی ئەوە رەت ناکاتەوە ، کەوا زمانی کوردی پێوەندی بە جیهانی ئێرانییەوە نەبێت نەزانین بوون ووشەیەك لەم زمانەدا لەنێو زمانی کوردی ئەمرۆدا ئەوە ناگەنێت کەوا نییە ، بەڵکو لە راستیدا کەم تەرخەمیو پویتە پێ نەدان بە لێکۆڵینەوە بە کەلەپورو زمانی ئەم کۆمەڵە کۆنانەی ، کە وولاتی کوردانی ئەمرۆیان کرد بۆ شوێنی خۆیان ، باوەکو ئەم کەلەپوورە کەمیش بێت ، بۆیە بایەخ هەر بە ناوەکان دراون لەم زمانانەدا لە هەموو شتێك زێتر گەر واتای سامی ( کاردو) واتای پاڵەوان ، بەهێزو شەرکەر ببەخشێت ، بێ گومان ئەم ووشەیە هەر یەك کۆمەڵە خەڵکی دیاری کراوی ناگرێتەوە . لە سەرەتادا وە بەتایبەتی کاتێ ، کە زۆر بەی خێڵاتی نیوە درندە بە ئازایەتیو پاڵەوانێتی لە نێو کومەڵانی شەرکەردا باسیان دەکرێت . بە واتایەکی دی ئەم ووشەیە لەنێو زمانانی سامیدا هەبووە ، بەر لەوەی ، کە چەند کەسێکی ناسراو بگرێتەوە ، بەڵام کور بە چاوپۆشیش لە هۆی جوگرافی ، کە باری دەروونیان پێشان دەدا ، بەواتا شاخاوی بن ، یا دەشتەکی ، هێزێکی شەرکەر بن ، یا ئاشتی خواز ، لەجیهانی ئێرانی وەیا سامی بن ، مەبەست لەم ووشەیەدا کۆچەر بووە .

بۆیە ئاشورییەکان نێوی کاردو (قەردو) یان لەو شاخاوییە شەرکەرە ئازایانە ناوە لەگەڵ ئەوەش ، کە جیاوازی زمانەوانی ، رەگەزیو کۆمەڵایەتی لە نیشتەجێی شاخاوێکاندا هەبووە ، ئەم جۆرە کۆمەڵانە لەلای ئێرانیانیش بەنێوی گورد (Gurd) هاتووە ، کە هاوواتای گۆرد (Gord ی هیندو ئەوروپی بووە و دوور نییە لەوەوەیش ووشەی گارد (Guuard) ی ئینگلیزی داڕێژراوەبێ .

ئەگەرچی نێوی ( کوردو کاردو) لەرووی فۆنیمەوە لێكدەچن ، بەڵام لەیەکەوە دانەڕێژراون ، بۆیە دەتوانین هەست بەو جیاوازییە بکەین لە لایەن مێژوو نووسانی یونانیو رۆمانی لە کاتی بەدیارخستنی وولاتی کاردو خۆی (کسینوفون) و ناوچەی گوردوینی (Gordyene) ، کە هێندیك جار بە کوردوینی (ordueni) ناسراوە وە بە تایبەتی لە لایەن (دیودوروس) ، سترابو ، بلونارخ ، بلینوگو هی دی) لەدوای تێپەربوونی چەند سەدەیەك لەسەر پەیدابوونی سەرهەڵدانی نەتەوەیی کورد ، ئەو ولاتەی ، کە دەکەوێتە باکوری میسوپۆتامیاو رۆژئاوایی ئێرانو بەشێك لە ئەنازۆڵ بە کوردستان نێوی دەرکردووە . (لەرووی ئەوەی کورد دانیشتوی ئەم ناوچەیەن) لە سەرەتای سەدەی سێزدەمدا[٣١] هەروا سوڵتانی سەلجوقی (سنجر) ئەو ناوەی لە بە شێکی زۆری ئەو وولاتەی ناوە جگە دیاربەکر (وولاتی کوردوینی) ، بەڵام گەرۆکی ئیتالی مارکۆ پۆلۆ (١٢٥٤ – ١٣٢٣) ز . ناوی کورد بەکارد (Card) تۆمارکردووەو ووتویەتی لە فارسدا وولاتێکی زۆر هەیە ، کە ناوەکانی ئەمانەن یەکەم : «کاسیین کە لە ناوەوەیە ، دووەم کاردستان . کە دەکەوێتە بەری باشوور»[٣٢] بێ گومان

مارکو پۆلۆ لەم ناوەدا مەبەستی کۆمەڵە مرۆڤێکن ، کە بە کورد ناسراون لە مێژوودا بەگەڵ گۆرانێکی کەمدا لە کۆکردنیدا لەو سەردەمەدا . ئەم کۆمەڵە خاكو زمانێکی هوبەشی هەبووە .

شەرەفخانی بەدلیس لە کاتی خۆیدا ئەو پێوەندییەی نێوان ئەم دوو ناوە روونکردۆتەوە ، کاتێ کە دەڵێ «یەکێتی خێڵی کوردان کە بە رۆژەکی نێودار بوون دەسەڵاتدارێتی لەسەر باشووری گۆمی واندا لە سەدەی دەیەمدا هەبووە . لە کاتی پەیدابوونی ناکۆکی نێوان ئەم خێڵانەو پاشای گورجی – داودی دووەم ، رۆژەکییەکان توانیان (کروکی) کە نەوەی کاردۆخییانن ج . ر ./ئازاد بکەن»[٣٣] ئەو ئازادکردنە ئەو پێوەندییە مێژوویە درێژە دەگرێتەوە ، کە ئەم خێڵانەی بەیەکەوە دەبەست لەنێوان خۆیاندا بۆیە ئەم ئازادکردنە بە رێکەوت نەبوو . ئەم پێوەندییە لە سەردەمی پورتو ساسانیدا بەهێزکرا بە واتا لە سەردەمی پەیدابوونی مەرجی بابەتانە بۆ سەرهەڵدانو پەیدابوونی نەتەوەی کورد لەسەر ئەم بنکەیە دەتوانین هێندێك بیروباوەری زانای روسی ن . ی . مار وەرگرین ، کە دەڵێ : – «زمانی کوردی لە یافشی بۆ ئێرانی گۆرا»[٣٤] ، بەڵام لە راستیدا ئەم دیاردەیە هەموو کورد ناگرێتەوە ، بەڵکو کۆمەڵە نائێرانێکان دەگرێتەوە ، کە نیشتەجێی ئەم وڵاتە بوون بەتایبەتی کاردۆخێکان ، کە لەگەڵ یەکێتی خێڵانی رۆژەکی کوردی تێکەڵ بوون .

هەروا دەربارەی کاردو هێندێك دەنگو باس باوەرپێکراو هەیە ، هەر وەك مەشیحا زخا (لەو قەشە یەکەمانەیە ، کە مێژووی هەولێریان لە سەدەی پێنجەمی زایینیدا تۆمار کردووە)[٣٥] . باسی کردووە ، لە کاتێکدا ، کە لەو هێرشە دەدوێ ، کە لەشکری پورتو وڵاتی حەذیەب بە هاوکاری یەك لە نێوەراستی سەدەی دووەمی زایینیدا بردیانە سەر وڵاتی کاردوی شاخاوی بۆ دامرکاندنی راپەرینەکەیان و هەروا هەرچی پێوەندی بەم رووداوە هەبووە لەگەڵ ئەنجامەکانی دەخاتە روو و دەربارەی دەڵێ (کاردوخێکان هێرش خۆیان بۆ سەر ئەم لەشکرانە وەستاند ، لەگەڵ نەتوانینیان بۆ داگیرکردنی شارەکانی پاشا – ارشاك ، ئەمەش لە ئەنجامی ئەم هێرشە چاوەروان نەکراوە بوو بۆ سەریان ، کە هێندێك نەتەوەی تری بەربەری درندانە کردیانو هەوڵیان دا شارەکانیان وێران بکەنو بسوتێننو تالانیان بکەنو ژنەکانیشیان سەتك وبەدیل کەن)[٣٦] .

بەپێی ئەو دەستنووسە باسکراوانە . و . فلجیفسکی ئەوە روونده‌کاتەوە ، کەوا هێندێك کۆمەڵی درندە ، کە لە ئەسڵی ترن لە وڵاتی کاردودا ژیاون[٣٧] فلجیفسکی لەم روونکردنەوەیدا پشت بەو هەڵانە دەبەستێ ، کە لەم دەستنووسانەدا لە دیارکردنی سنووری وڵاتی کاردووا هاتووە ، کەوا سنووری کاردویان شاری ئیسفون بووە لە باشوورەوەو هەولێریش لە باکوورەوە . بێ گومان وڵاتێکی ئاوای شاخاوی هەبوو ، بەڵام لە راستیدا ناوچەی بۆتان بووە بەڵام لەم کاتەدا ناوچەییکی فراوانتریش گرتۆتەوە لەچاو ئەو کاتەی ، کە کسینوفون پێیدا تێپەریوە ، بەتایبەتی لەلای باشوورەوەو بەپێی ووتەکانی ستیفانی بیزەنتیو بتلیموسو هی دی وڵاتی کوردوێنی نەکەوتۆتە نێو ئەم ناوچەوە[٣٨] .

ناوی کاردوو کوردوێنی (قەردو کورد) تا ماوەیەکی کورت هەر بەکارهاتووەو ئەوەی یەکەمیان لە کۆتاییدا وونده‌بێو بۆ ئەوەی ماوەی بۆ ئەوەی دووەم جێ بێڵێ ، تاوەکو واتای نەتەوەیی بۆ گەلی کورد لە شێوەی کورد+ون= کوردان ، هەر وەکو جورج ئامرتول[٣٩] بۆیچووە بیەخشێ . لەبەر رۆشنایی ئەوانەی لەمەو بەر باسکرا ناتواندرێ دژ بە بیروڕای نولدکە ، هارتمانو وایسباخ بوەستین کاتێك ، کە دەڵێن ، هیچ پێوەندییەکی زمانەوانی ئەتنوکفیزی لەنێوان کاردو کوردا نییە ، بەڵام ئەوەش ئەوە ناگەیەنێت ، کەوا کورد یەکسەر لە کیرتییانەوە هاتووە ، هەروەکو لە سەرەتای ئەم لێکۆڵینەوەدا قامکی بۆ درێژکرا وەك دەنگوباسیان لە سەردەمی سلوکییان[٤٠] دا هاتووەو تیتوس لیفوس لە شێوەی کیرتیوی[٤١] نێوی هێناونو ستڕابوو[٤٢] دیسانەوە یادیان دەکاتەوە لە وڵاتی گۆردوێنی (Gordyene) ، کە سنووری لەنێوان شاری ئامید (دیار بەکر) و موشدا بۆ دادەنێ بۆ ئەوەی لەم کیرتییانەی[٤٣] جیاکاتەوە ، کە لەم ماوەیە بەدواوە لە وڵاتی کوردستاندا بڵاوبوونەتەوە وپاشان دەنگوباسیان بەهۆی دەستنووسی دێری دیانانی ئەم وڵاتە لە سەدەی نۆیەمو دوای ئەوەدا وە بەتایبەتی لە لایەن بار عیبرائیو توماس مەرگە وهی دیدا دێ[٤٤] . ستڕابوون بێ ووردبوونەوە نەژادی گۆردوێنی بۆ کاردوخیان دەگەڕێنێتەوە ئەگەر چی جیاوازی جوگرافی لە ناوچەی نیشتەجێ بوونیاندا هەبووە ، هەروا ستڕابوون بێ

ووردبوونەوە لەرووی فراوان کردنی خاکی وولاتی گۆردوێنی سنوورەکەی دەگەیەنێتە تورس ، سوزوفینیو ئەرمینیا ، کە لەگەڵ ووتەکانی کسینوفۆندا رێك ناکەوێت کاتێ ، کە سنوور بۆ ناوچەی کاردۆخیان پێشان دەدا .

ئەو بەڵگانەی ، کە لەمەوبەر باسکران ئەم راستییانەی خوارەوە دەخەنە روو : -

١ - نەژادی کورد بۆ کۆمەڵە خێڵی تایبەتی وەك کیرتی ، کاردۆخۆی ، کارداکاو . . . هی دی ناگەرێتەوە یەکسەر ، بەڵکو پێوەندێکی رەگەزیو کەلچەری لەگەڵ ئەم هەموو کۆمەڵانەو دانیشتوانی کۆنی وولاتەکەیان لە قۆناغانی دیاریکراوی مێژوودا هەیە . .

٢ - ناوی کورد شێوەی پەرەسەندووی ناوی کاردو یان کردو (قەردو) نییە .

٣ - نەژادی کورد ئێرانیو نائێرانییە ، چونکە وولاتەکەیان نیشتمانی خێڵی نائێرانی بووەو رەگەزی ئیرانیش بەسەریدا زاڵ بووە .

٤ - مێژووی ووشەی (کورد) پێش گەلی کورد کەوتووە لەرووی کاتەوە ، چونکە ئەم ووشە بە واتایەکی تایبەتی بەکارهاتووە بەر، لە پەیدابوونی مەرجی نەتەوەیی . ●

**تێبینیو سەرچاوە**

١ - نولدیکە (ثیودور) Th.Noldeke لە ١٨٣٦/٣/٢ لە هامبروگ هاتۆتە جیهانەوەو لە ١٩٣٠/١٢/٥دا کۆچی دوایی کـردووە . دن بـەنـێوبـانگترین رۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی دەژمێردرێ .

لە ساڵی ١٨٦١ لە شاری گوتینگن (Gottingen) دا دەبێتە مامۆستا ، لەدوای ئەودا لە ساڵی ١٨٦٨ دا لە کیل (Kiel) دا دەبێتە پرۆفیسۆر کاری لە زمانانی سریانی ، عەرەبیو فارسیدا کردووە هەروا هەر چ لێکۆڵینەوەیەکی کۆن ، کە لە کتێبانی سریانیو مندجیو مێژووی قورئانو هی دی :

1 E Geschichte (مێژووی قورئان) des qorans (1860)

2 – Grammatik der neu syr. Sorache am Urmiasee Und Kurdistan (1868)

(رێزمانی سریانی دەربارەی زەریای ورمیو کوردستان ، ١٨٦٨)

3 – Mandaiche Grammatik...

1875رێزمانی مانداعی

٢ - کیرتی Cyrti = vezloc

خێڵی ئێرانین ، نوسەرانی کلاسیکی (رۆمانو یۆنان) باسیان کردوون ، لە میدیاو فارس ژیاون (بڕوانە سترابو ، کتێبی یازدەم ، بەشی سێزدەم S t rabo, × 1, 13,3 هەروا کتێبی پازدەم ، بەشی سێیەم Strabo × r, 3,1 ئەمانە لەپاڵ رۆمان ، سلوقییاندا شەریان لەگەڵ پاشاکانی پرگامون ساڵانی ٢٢٠ - ١٧٠ پ . ز کردووە (بڕوانە تیت لیفوسو پولیبوس . Liry × lii, 58,13, × × × vii.40,9 Poly bius,v,52,5

٣ - وایسباخ (فرانز هیزبلك)

لە شاری (Chemnitz) کارل مارکس ئێستە لە ئەڵمانیای دیمۆکراتی لە ١٨٦٥/١٠/٢٥ دا هاتۆتە گێتییەوە لە ١٩٤٤/٢/٢٠ دا جلی ژیانی داکەندووە . یەکێکە لە رۆژهەڵاتناسەکانی ئەڵمان . لە ساڵی ١٩٠٥ دا لە لایبزك دا بوو بە پرۆفیسۆر ، پسپۆری رووداوانی مێژوویی ، کە پێوەندی بە ئەخمینی ، عیلامیو گەلانی کۆنی رۆژهەڵاتی دی هەبووە لە بەرهەمەکانی :

1 + Dle Achamenideninschriften Weiter Art..... 1890

2 – Die altper.Keilinschriften in Umschrift und ubersetzung ( 2 Tle., 1893 – 1980., W.Vang)

3 – Die Sumer.Frage (1898) , Veitrage zur Kunde des IrakT Arabichen (2 Tle,. 1908-30).

4 – Die Keilinsch iften der Achameniden (1911, Nachdruck 1968)

٤ - بڕوانە ئەم وتارەی درایفەر :

G . K.Driver .. The name Kurd and its Philological Connexions.Journal of Royal Asian Society.

L ondon 11923,PP.393-403.

هەروا لە هەمان گۆڤاردا ئەم ووتارە بەم نیۆنیشانەی بلاوکراوەتەوە :

...,...,Studien in Kurdish history. J. R. A. 3 . 11, 1922, P, 461

٥ - کاردۆخیان لە سەرووی رووباری دجلەژیاون ، سنووری ناوچەی نیشتەجێ بوونیان لە باکوورەوە رووباری کینتریتیس (بهتان سوی ئێستە لە تورکیەدا) بووە هەر ئەم رووبارە بەری رۆژ ئاوای گرتبۆووە دوای ئەوەی دەرژابە نێو دجلەوە ، باشووری ئەم وولاتە لە دەورووبەری گوندی مەنصوریەی ئەمرۆ بووە . بۆیە

ئەم وولاتە بوهتانی (بۆتان)ی ئەمرۆ دەگرێتەوە بروانە ووتاری وایسباخ ، کاردوخۆی .

P .H.Weissbach., Kardukhoi. Rea Encyclopadis Paulys. W issowa,X,2.Stuttgart 1919. Col.1933.

٦ – کسینوفۆن (زینۆفۆن)(٤٣٠ پ . ز . – ٣٥٤–پ .ز .) ، (کوری (جریلوس) ، کە مێژوونووس و پێشڕەوو نووسەرێکی گریکی بوو . لە ئەثینا هاتۆتە جیهانەوە ، لە خێزانێکی دەولەمەند (ئورستوکراتی) پەروەردە بووەو یەکێك بووە لە خوێندکارانی سوقرات و سەر بەویش بووە .

کسینوفۆن چوەتە نێو لەشکری کۆرشی بچوکەوە ، بۆ ئەو هێرشەی ، کە دەکرا سەر ئەردە شێر (artaxerxes) – پاشای فارسی هەخامەنشی بێ ئەوەی بزانێ مەبەست لەم لەشکر پێك هێنانە چیە .

لە راستیدا ئەردەشێر لەدوای باوکی – دارای دووەم (٤٢٥ پ–ز – ٤٠٥ پ – ز) بو بە پاشای ئیمپرا تورەکەی .

دارا کورێکی دی هەبو کە نێوی کۆرش بوو . هەر کە ئەردەشیر بە پاشا داندرا (٤٠٥–٣٥٨ پ .ز .) کۆرش هەوڵی لە نێوبردنی ئەم برایەی خۆی داو سەرنەکەوت ، بەڵام دایکی بەزەیی پێدا هاتەوە ، بۆیە براکەی لێی خۆش بوو و فەرمانڕەوایی ناوچەی مەرزەبانی یەی ئاسیای بچووکی دایێ . کۆرش خاوەن هیوا بوو ، باوەڕ بەخۆ بووو ئارەزووی لە دەسەلاتداریێ بوو . بۆیە بە نهێنی سوپایەکی لە گریك و فرس و بۆبەر کۆکردەوە بەو نێوەی بەسەر چەند یاخی بوویەك دادەدا ،

ئەردەشیر لە پێتە ختەکەی کە تیسفون بوو ، کۆرشیش (ساردیس)ی کردبۆ پێتەختی لیدیاو نیشتەجێبوو بوو تێیدا . لەوێوە لەشکری کۆرش بەری کەوت ، تا گەیشتە فورات و چۆنێو خاکی میسوپوناميا لە نێزیك ثاپساك Thapsacus و لە جەنگی کوناکسادا کوژرا .

هەر کە کۆرش کوژرا و لە دوای ئەودا سەرۆکی ئەم هێرشەش – برکسنۆس بە پێشڕەویان هەڵبژێردراو توانی سەرۆکایەتی پاشماوەی لەشکرەکە بکات ، کە نێزیکەی دە هەزار سەرباز بوون و بەرەو ترابیزوس (ترابزۆنی ئێستە لە تورکیەدا) لەسەر لێواری رووباری دجلەدا دەرویشتن و بە وولاتی کاردوخۆی شاخاوی تێ دەپەڕین جا ئەرمینیە لە ساڵی ٤٠١– پ .ز . – ٤٠٠ پ .ز .) کسینۆفون رووداوانی ئەم هێرشە لە کتێبێکیدا تۆمار کردووەو نێوی ناوە (ئەناباسیس) . لە دوای ئەمەدا لەلای پاشای (تراقی) کاری کردووەو هەروا هاوبەشی ئەو هێرشەی کردووە ، کە بەسەر ئەثینادا کراوە . کاتێ ، کە شەڕی نێوان ئەثیناو سبارتە هەڵگیرسا ، کسینوفۆن ڕووی کردە شاری کرفینتێ ، تا لەوێ کۆچی دوایی کرد .

کسینوفۆن بێجگە لەم کتێبە بەرهەمی تری مێژووی هەیە .

٧ – کسینوفۆن ، ئەناباسیس ، کتێبی سێیەم ، بەشی چوارەم ، وەرگێڕی بولگاری ، سوفیا ، ١٩٤٢ .

٨ – کسینوفۆن ، هەمان سەرچاوەی پێشوو ، کتێبی حەوتەم ، بەش نۆیەم ، هەروا تەماشای بیروڕای فلجیفسکی بکە لەم سەرچاوەی خوارەوەدا .W ilchevsky. Kurdi. vdeniye v Etnicheskuyu Istoriya Kurdskogo Naroda. Izd. an CCCp. EMoskova E Leningrad 1961. هەروا چاومان بە هەمان بیرورا دەکەوێ لە لایەن ئەکوپۆفەوە ، کە لەو نامەی دکتۆری یەی دەری بڕیوە کە بۆ پلەی پرۆفیسۆری پێش کەش کردووە .

G . Akopov., Kriticheskaya Istiriya Problemi Proiskhojdeniya Kurdov , Erevan 1969. Str . 35 E 36

٩ – K.K.Kurdoev ., O nekotonikh Toikovaniyakh Svedenii Ksenofonta O Kardukhakh.Jug E Osetinski Nauxhno E Issledovatelskii Institut AN GSSR.

oprosi Iranskoy I obshchey Filo-lgii.1977. Str.188,

١٠ – گ . کوردۆییف . هەمان سەرچاوە ، لاپەڕە – ١٨٨

١١ – ك . کوردۆییف . هەمان سەرچاوەی پێشوو

١٢ – هەمان سەرچاوە لاپەڕە ١٨٩

١٣ – هەمان سەرچاوە . لاپەڕە – ١٩٠

١٤ – ئەم ناوە بۆ یەکەمین جار لەسەر یەکێك لە پلیکانەکانی پەرستگەی سۆمەرییەکاندا بەدەرکەوتووەو پێشان دراوە ، کە بۆ نێزیکەی دوو هەزار ساڵێك پێش زایین دەگەڕێتەوە ، ئەوسا ناوێکی جوگرافی بووە تیورو دانجین نیشانەکانی شی کردۆتەوە ، بەم شێوەی خوارەوە Thureau Dangin, Notice sur

La Troisieme Collection de Tablettes, Revue D Assyriologie et D, Archeologie Orientale Tom , No 3 Paris 1902 , P.101

١٥ – دەنگ‌وباس خێڵە ئێرانی‌یەکان بۆ یەکەمین جار لە نووسینەکانی ئاشوری‌دا هاتووە ، کە لە سەدەی نۆیەمی زایین بووە . تەماشای ئەم سەرچاوانەی خوارەوە بکە .

– . Herzfeld ., The Persian Empire. Wiesbaden 1968 P.18

I . M . Diyakonov., Istoriya Midii . L 1956 , Str. 76.

شالمنسار لە ساڵی شازدەمی فەرمان ڕەوایەتی‌دا کاتێ کە دەنگ وباسی ئەو هێرشەی ، کە بردوویەتی سەر وڵاتی بارسوا لە ساڵی ٨٤٤ پ .ز . تۆمارکردووە باسی ئەم خێڵە ئێرانیانەی کردووە

هەروا باسی میدی‌یەکان لە ساڵی ٨٣٦پ–ز کردووە . بەواتە لە ساڵی بیست‌و چوارەمی فەرمان‌ڕەوایەتی بروانە :–

24 – T . cuyler young jr ., the iranian migrasion in to the zagros . irAN . Gournal of ritish Inst . of persian studies , OL . , 1967 , P . 11.

١٦ – بروانە ووتارەکانی قەیسەر صادر ، کە لە ئەندامی کۆمەڵەی (العاديات السورية) بوو لە گۆڤاری (المقتطف) دا بڵاوبۆتەوە ، بەشی یەکەم لە بەرگی نەوەدو سێدا (یونیو ، ١٩٣٨ ربیعی دووەم ، ١٣٥٧ کۆچی ، لاپەرە ٤٢ – ٤٧ ، بەشی دووەم لە بەرگی نەودو سێیەم ، یولیو ، ١٩٣٨ ز ، لاپەرە ١٩٩ – ٢٠٣ لەژێر نێوی (کەڵتەری مبنانیان) ، بەڵام دەربارەی زمانی میتانی بروانە ئەم سەرچاوەیە :–

B . I . ARAE ., K voprosu O Prarodine drevneyshikh migratsiyakh Indo E Iranskikh narodov . Drevnii ostok I antichniy mir . Moskovz 1972 . str . 26 E 37.

١٧ – لەپاڵ ئەو ووتارە بەنرخەی ، کە ڕۆژهەڵات ناسی روسی – ڤلادیمیر مینورسکی دەربارەی کورد لە ئینسکلۆپیدیادا لە ساڵی ١٩٢٧ دا بڵاوی کردۆتەوە ، کە لە کۆتاییدا نەگەیشتبۆ ئەنجامێك پێوەندی بە گەلی کوردەوە بووبێ وەیا لەو ناوانەی ، کە لێوەی نزیکن ، بەڵام مینورسکی دەربارەی ئەم بابەتە لە ساڵی ١٩٣٥ دا سنوری بۆ هەوڵویستی خۆی داناوە لە باوەڕەکەشی‌دا ڕاست‌بووە . هەڵوێستی مینورسکی دەربارەی نەژادی کورد لەو نامەیەی‌دایە ، کە بۆ یەکەمین جار لەگەڵ ئەم لێکوڵینەوەیەو بڵاودەکرێتەوەو کە بە زمانی فارسی نووسیویەتی‌و بۆ مێژوونووس‌و نووسەری کورد بەهەشەتی • حسین حوزنی موکریانی ناردووەو لەنێوی دا باسی :–

(سەختی‌و گرانی بەدیارخستنی و سنوور دانانی نەژادی کورد دەکا ، چونکە بەرهەمی چەند خێڵو هۆزی جیاجیان ، ئەم دیاردەیە لەلای رووس‌و ئینگلیزو فەرەنسی‌و هتد بەرچاو دەکەوی) .

مینورسکی لە . پشتی نامەکەیدا باسیناوی کوردو واتاکەی دەکا ، کە زۆر ڕاستی بۆ چووەو دەڵی کەوا فارسەکان شوانکارەو خێڵە کۆچەرەکانیان بەم ناوە ناوە وە لە ڕاستیدا ئەم کۆچەرانە ئەسڵی کورد نین ، بەڵکو ئەم ناوە لە زمانی فارسی‌دا واتایەکی گشتی هەبووە ، کە نێوی ئەو کۆچەرانە بووە ، کە لە خێوەتان‌دا ژیاون ، کە لە ڕووی زمانەوانی‌و نەتەوەوە لەگەڵ گەلی کوردوا جیاوازیان هەیە . لەگەڵ ئەوانەدا هەموو مینورسکی دەربارەی ئەم کێشەیە لەم دوایەدا بیروڕای خۆی گۆڕی ، کە ئەم بیرەی لە دوا و وتاری خۆی ، کە وەرگێڕانەکەی لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورددا لە ساڵی ١٩٧٣ دا بڵاو بۆوە بەرچاو دەکەوێ .

١٨ – لە ڕاستیدا ستڕابون ئەم ناوەی نەهێناوە ، کە مامۆستا ڕەشید یاسەمی دەڵێو پرۆفیسۆر کۆردوییف یش لایەنی دەگرێ ، کە بۆ چەمکی ناوی (گۆردیینی)یە و گوایە ستڕابۆن گوتوویەتی کۆردیینی بەناوی (کاردۆخ) یان کراون لە کۆندا ، ناوهێنانی ئەم ناوە جۆرە دەبێتە هۆیەکی دیارو ئاشکرا بڕوانە چاپی ئینگلیزی :–

Strabo ., Geography x vl 7 , o 76 , X1 12 ; hondon , 1954.

١٩ – با وەکو ناوەڕۆکی نەتەوەیی ئەم ناوە لە سەدەکانی یەکەمی ئیسلامدا بڵاوبۆوە ، بەڵام واتای چینایەتی‌و کۆمەڵایەتی کۆنی لە لایەن هێندیك گەڕۆکی موسڵمانان هەروەکو ڕابوردوو بەکارئەهات ، بۆ وێنە (طبری) باسی ئەو نامەیە دەکات ، ئەردەشێری پاپکان لە ئەردوان – دوا پاشای فرثیانەوە پێی گەیشتووەو بە کوردی نێو دەبا ، کە مەبەستی کۆچەر بووەو دەڵێ :–

(لە کاتێکدا ئەو ئاوابوو پەیامبەرێك لە

ـردەو نەوە هاتە لایو نامەیەکی لەوەوە
ـوو . ئەردەشێر خەڵکی کۆکردەوە
ـمەکەی بۆ خوێندەوە ، کە دەڵێ :-(تۆ
ـت ـە بەرەی خۆت درێژکردووە خۆت
ـێو بردنت نێزیك کردووە ئەی ئەو
کوردەی ، کە لە خێوەتی کورداندا
پەروەردەی بووی ، کێ ڕێگەی لە
سەردانانی ئەوتاجەی داوی ، کە لەسەر
سەرتە ، ئەو وولاتەی ، کە داگیرت
کردووەو بەسەر پاشایانو خەڵکەکەیت
دداوە . . . هتد)

لە راستیدا مەبەستی ئەردوان لە بەکارهێنانی ئەم ناوەدا هیچ نەتەوەیەك نەبووە ، بەو چەمکە نوێیەی ، کە ئەمڕۆ بۆ نەتەوە دەکرێت ، بەڵکو مەبەستی ئەو خێڵە کۆچەرە ئێرانییانە بووە ، کە خەڵکی شارانو چینە خانەدانەکانی لەروی رۆشنبیریو نەژادەوە کەمتر بوون ، بروانە (تەبەری ، تاریخ المرسل والملوك الجزء الثانی – مێژووی پەیامبەرانو پاشایان ، بەشی دووەم – چاپی دووەم – قاهیرە – لاپەڕە(۳۹)

هەروەها تەماشای چاپی لیدن بکەن ، بەشی یەکەم ، ل – ۸۱۷
M . G. D.E GOEGE, 1879 E 1881

دەربارەی ناوەڕۆکی نانەتەوەیی نێوی کورد ، بروانە (إبن حوقل)

لە لێکۆڵینەوەی (زموم وطوائف الاكراد في منطقة فارس :-
کتاب مسالك وممالك ، تصنيف ابن حوقل .
Sir William Uuseley, 7800, P. 56, 83

۲۰ – لەکتێبی (کارنامك)ی ئەردەشیرێ پاپەکاندا هاتووە ، کەوا یەکێك لەو کەسانەی ، کە لەگەڵ دامەزراندنیدەوڵەتی ساسانی بووە (ئەردەشێری پاپەکان ساڵی ۲۲۸ ز.) مادك شای کوردان بووە کورد لە تێکستی پەهلەویدا (Koerd) ، ج.ز.بروانە :
Darb Dasxur Peshotan Saiyana.
□ediR ., The Karname i Artakshir i Papalan,
ombay, 1895 , 6, P.22

لە وەرگێرانێکی تردا نێوی بەم جۆرە هاتووە ( کردنشاه مادی) ،بروانە

کارنامە أردشیر بابکات ، به اهتمام محمد جواد مشکور ، تهران ، ۱۳۲۹ خورشیدی ، ۱۹۵۰ م لاپەرە – ۱۹ (لە راستیدا نێوی پاشاکە بەم شێوەیە نووسراوەMadik ، بروانە
The Noldeke., Geschichte des Artachsvir i Papakan.
Gottingen 1879 . P.48

۲۱ – بروانە
The chronography Grogory Abul Faraj
ar Hebraeus.

eing the First part of his political history of the World.
Ed.
y . Ernest A. Wallis
udege, vol. I oxford University press
1932 . P 131 , 139.

بار هیرایوس لە لای عەرەبدا بە أبی الفرج الملطي وەیا مغریان گریگورس کوردی سریانی بە نێوبانگ بووە ، ۱۲۲٦ – ۱۲۸٦ ز

۲۲ – درایفەر ، سەرچاوەی پێشوو ، لاپەڕە – ۳۹۳

۲۳ – بڕوانە سترابو ، سەرچاوەی پێشوو .

۲٤ – ابن الأثير ، الكامل في التاريخ . الجزء الاول ، چاپی لیدن ، ۱۸٦٦ ، لاپەڕە – ۷۰

۲۵ – هەمزە ئەسفەهانی ، لاپەرە ، ۱۵۱ .

۲٦ – لەگەڵ رامیاری ساسانییەکاندا لە بەهێزکردنی بەری رۆژ ئاوایی ئیمبراتۆریەتیان بەرامبەر بە بێزەنتییان . هێندێك خێزانی خانەدانی ئێرانیان ئەم ناوچەیەدا نیشتەجێ کرد . ئەم بزوتنەوەیە ، هەروەکو میخائیل مۆرۆنی بۆی دەچێ لە سەدەی سێیەمی زاینیدا دەستی پێ کردوو .(۱۲) دوازدە . هەزار خێزانی سەر بەماڵی شا لە شارانی ئیستخرو ئیسفەهانی لە نیسیبیندا نیشتەجێکرد . لە کاتێکدا ، کە ئەم شارە . لەلایەن رۆمانەکانەوە لە ساڵی ۳٦۳ ز. داگیرکرا قوبادی یەکەمیش ٤۸۸ – ٤۹٦ . ٤۹۹-۵۳۱ ز بە هەمان کردەوە هەستا لە لادێکانی باکوورو باشووری عێراق . بروانە :-
Michael G. Morony., The offects of the Muslim conquest on the Persian Population of Iraq . IRAN . Journal of the
ritish institute of Persion studies studies vol. XI
1976 .P.41

(طبری) باسی هێندێك ئەو دەنگ وباسانەی کردووە لە بەشی دووەمی ، چاپی دووەمی ، لاپەڕە شەشەمی کتێبەکەی کە لە قاهیرەدا چاپکراوە لەپاڵ ئەو خێزانە خانەدانانەی ماعن ، کە لە

کرخاویێپ سلوخ (کەرکوك) کە لەگەڵ بەرەبەیاندا لە دەوروبەری ئاگر کۆدەبونەوە بۆ نوێژکردن لە سەدەی شەشەمی زایینی‌دا ، ئەوا دانیشتوانی زۆربەی دێ‌یەکانی دەوروبەری ناوچەی حذیب‌و بیت جرمی (هەولێرو کەرکوك) لە تیرەی ئێرانی بوون‌و ئایینی‌یان زەردەشتی بوو جا ویانی ، کاروباری ماعن‌یەکان لە لایەن موبذەوە هەڵدەسورا هەروا قەشەی دێری دیان ، کە لەم ناوچەیەدا بلاو بێوە . زۆربەی هەڵسورێنەری دێرو کەنیسەی بیت جرمی‌و حوذیب‌و ناوچەکانی داسنی‌و بیت عبهی‌و هادی لەرووی نەژادو زمانەوە ئێرانی بوون ، بەلام باوەڕیان بە ئایینی دیانان‌دا هێنابوو ودەنگ‌وباسیان بە ئارامی نووسیبێوە ، هێندێك لەمانە باسی چەوسانەوەی خۆیان کردووە لە سەردەمی جۆراوجۆری فەرمانڕەوایی ساسانیان‌دا وەك (هسپس قەشەی روها) مامۆستای کوری دیسان ، کە لەسەر دەستی ئەودا باوەڕی بەم ئاینە هێناوەو (شاهدو ست جاتلیق) کە لە دوای سمعانی کوری سەباعین دا هەڵبژێرراو لەگەڵ (١٢٨) قەشەوا بە دیل گیراو کوژرا .

لەدوای کوشتنی ئەندریا قەشەی دێر ماری‌و داود بەسری‌و عەبد یەشوع‌و ئیبراهام تسنتری‌و هی دی لەسەردەمی شاپوری دووەم لەنێوان ساڵی ٣٣٩ – ١٤١ – ٣٤٢ زایینی .

زۆربەی ئەوکەسانەی ، کە بوونە سەر بە دێر نێوی ئارامیان لە خۆیان ناوە ، لەوانە (أفراهاط) ، کە فەرهادەو نێوی یەعقوبی لە خۆی ناوەو بنکەی قەشایەتی لە نێزیك موصڵەوە بووە . لە ساڵی چوارەمی چەوسانەوەدا (قەشە نرسی) شەهید کراوە ، کە لە شاری قذ لە بیت جرمی لە ساڵانی یەکەمی فەرمانڕەوایی بارامی پێنجەمدا (میهر شاپورو فەیروزو هی دی) لە هەمان ناوچەدا شەهید کران . بەلام (ئیسحاق ئەنتاکی) کە سەری لە رۆمەر چەند شارێکی تری داوەو بۆتە قەشەی شاری ئامەد لە بنچینەدا خەڵکی دەوروبەری شاری (وولاتی کوردوینی) بووە هەروا (برسوما) لە بیت تردو (وولاتی کاردو – جەزیرەی ئیبن عومەر) هاتۆتە جیهانەوە لە پایە بەرزو هەڵبژاردەی دێرەکانی بیت ئارامیا جاثلیق بابی کوری هورمز بووە جاثلیق صبر یشوعی یەکەم نێودر بووەو لە سەرەتادا لە ناوچەی شارەزووردا شوان بووەو لە نەسیبین‌دا فێرە خوێندەواری بووەو بۆتە قەشەی لاشوم (داقوق ئێستە ، کە لە نێزیکی کەرکوکە ، هەروا کسرەی دووەم ئاثیالی شارەزووری لە دار داوەو هی دیش .

لە پاڵ ئەمانەدا هەموو نووسراوەکانی بیت عبهی (ئەو ناوچانەی دەکەونە سەر زێی گەورە)و مەرگە (المرج) ، کە دەکەوێتە باکوورو رۆژهەلاتی ئەو ناوچانە ، ئەوە پیشان دەدا . کەوا خانەدانەکانی ئێرانی لەم ناوچانەدا ماڵ‌و سامانێکی زۆریان بەم دێرانە بەخشیوە .

بێگومان مەبەست لەم ئێرانی‌یانە ، چ لەنێو شاران‌و چ لەنێوان لادێ‌یان‌دا بن ئەو خێڵە کوردانەو سەرکردەکانیان دەگرنەوە ، کە لە باشووری کوردستاندا بوون .

٢٧ – V. Minorslty., The + Encyclopedia of Ishan Leyden + London, 19,P 113.

٢٨ – هێندێك خێڵی جۆراوجۆر ، کە لەم ناوچەیەدا ژیاون ، بە دیالێکتەکانی ئێرانی رۆژئاوا دواون‌و لەرووی باری ئابووری‌دا بایەخیان بە پیوەندی شوانکارەو شەڕیان داوە بەنێو کورد نێوداربوون ، هەر وەکو (اصطخری) باسیان دەکاو دەڵێ : (ژمارەی کۆلانەکانی کوردان زۆرە ، بەلام ئەم ناوە لە هەموو فارسان نراوەو ژمارەشیان لە پێنج سەد هەزار خێوەت زیاترەو پیشەوەری‌یان شوانکارەیە لەسەر شێوەی عەرەب) .

بروانە : – اصطخری ، المسالك والممالك لێکدانەوەی محمد جابر عبد العال الحسینی ، قاهیرە ، ١٩٦١ ، لاپەرە – ٦٨ .

٢٩ – کسینوفۆن ، ئەناباسیس ، کتێبی چوارەم ، بەشی یەکەم ، وەرگێرانی بولگاری ، لاپەرە – ٩٩ .

٣٠ – توفیق وەهبی ، کۆڤاری کوردیکا ، ١٩٦٨ ، لاپەرە ٢٣ ، بە زمانی ئینگلیزی .

٣١ – لە کتێبی (نزهت القلوب) ی حەمەدوڵلای مستەوفی قەزوینی نێوی کوردستانی هێناوە ، قەزوینی لە ساڵی ٧٤٠ کۆچی/١٣٤٠ زایینی‌دا کتێبەکەی تەواوکردووە . بروانە کتێبی (نزهت القلوب) ، ووتاری سی‌هەم ، لێکۆڵینەوەی گای لیسترایخ ، چاپی لیدن ، ١٩١٣ ، لاپەرە ١٠٧ و دوای ئەو .

بەلام ئەم نێوهێنانەی نێوی کوردستان وەنەبێ بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا هاتبێ ، هەروەکو دکتۆر ئەورەحمانی قاسملۆ وای بۆ چووە ، بروانە : –

A bdul Rahman Chassemlou., Kurdistan Akurdovia- Bratislava,1964,Str.11.

جوکه گەڕۆکی ئیتالی – مارکۆ پۆلۆ
:۱۰۲٤ – ۱۳۲۳)ز . نێوی کوردستانی بە
... بەر ئەم کاتە بردووە ، کە وەکو
... لە وولاتانی فارس هێناوە ، کە
... بەری باشوورو رۆژئاوای ئێران ،
... کتێبی مارکۆ پۆلۆ ، بڕی یازدەم بە
... ئیتالی : –

M arcoo Polo v Tiano. De...
Merauiglie Del Mondo Per Vedu...
Trevige 1640.

هەروا وەرگێرانەکەی بە زمانی
...نگیزی : –

T he Travels of Marcoo Polo. A
Venetion,in the therteenth Centur...
Translated form the Italian with
notes.
By William Marsden,F.R.S. and
. C.London 1818 P,74

۳۲ – بروانە مارکۆ پۆلۆ ، لاپەڕە –
۱۱ ، بە زمانی ئیتالی ، لاپەڕە – ٤٧ –
بەزمانی ئینگلیزی .

۳۳ – شەرەف خانی بەدلیسی دەڵێ :
–

منقول‌است ، که در این ، عصر
حاکم بدلیس‌و حزوتاویت نام شخص از
حکام کرجستان بود ، روزکی ولایت
بدلیس و حزورا زو تخلص کردانیدو بروایتی
بدلیس‌را از عشیرت کروکی حزورا کرجی
کرفته اند . . . هتد) .

بڕوانە
کتێبی شەرفنامە – شەرەف خانی
کوڕی شەمسەدین بەدلیسی ، کە بە
چاودێری ولادمیر بە ولیامینوف زرنوق
ناسراوە ، چاپی بطربوگ بەرامبەر ساڵی
۱۳۷٦ کۆچی ، لاپەڕە ۳٥۸ .

۳٤ – بە زمانی رووسی : –
O. Vilehevs. Kurdi.M- 196,str. 142.
B . Nikitin, Kurdi.M. 1964,str. 46.

۳٥ – مشیهازخا ، یەکێك بووە لە
رەبەنانی وولاتی هەولێر ، لە سەدەی
پێنجەمی زایینی‌دا . دەنگ‌وباسی چۆنیەتی
بلاوبوونەی ئاینی دیانانی لە ناوچەی
ئەوبەری دجلەدا (هەولێر ، کرخاییت
سلوخ – کەرکوکی نوێ)ی نووسینوەتەوە .
ئەم دەنگ‌وباسانە دەربارەی وولاتی
فرنی ، پێوەندی بە وولاتی حوذەیب‌دا بووە
هەروا هێندێك دەنگ‌وباسی تریشی
باس‌کردووە .

36 – Die Chronik Von Arbele Von
Eduard Sachau.Berlin 1915. P. 48.

37 – O.Vilchvsky., Kurdi.M - I
1961,Str.110

۳۸ – وولاتی کۆردوئاییا (Korduaia)
لە بەری باکووری رۆژهەلاتی‌دا دراوسێی
کاردوخیان بووە ، هەروەکو
(میتلوستورجیوس)ی نووسەر باسی
کردووە . ئەم نووسەرە لە شاری قەیسەر لە
تورکیا لە ساڵی ۳٦۸ زایینی‌دا هاتۆتە
جیهانەوەو یەکێك بووە لە مێژوو نووسانی
دیانانی .

بیزەنتی نێوبراو مێژووی دێری لە دوازدە
کتێبدا نووسیوەتەوە . دوای گەڕانەکانی بۆ
بەری رۆژهەلاتی ئمبراتۆریەتی بیزەنتی بەلام
بەتلیموس ، کە بە دامەزرێنەری زنجیرەی
بەتالیسان لە میسردا دەژمێردرێ‌و سەرۆکی
ئیسکەندەری مەکدۆنی بووە . ئەم دوو
نێوەی (کوردۆینی‌و کاردو بە جیاجیا لە یەك
هێناوە . هەروا سیتفانی بیزەنتیش .
بڕوانە .

F.H.Weissbach. Karduchoi. Paulys
Real Encyclopadis. Stuttgart
1919,X, 2 Col. 1937

۳۹ – جیورجیوس ئامرتول (Georgil
Monachi) نووسەرێکی یۆنانی بووە لە
بیزەنتەو لە سەدەی نۆیەمی زایینی‌دا ژیاوەو
کتێبیکی لە ساڵی ۸٦۷ زایینی‌دا داناوە ، کە
بە چۆنیەتی پەیدابوونی بوون‌دا
دەست‌پێ‌دەکات ، تا ساڵی ۸٤۲ی
زایینی . هۆی دانانی ئەم بەرهەمەشی
باوەڕی بە مێژووی دێری دیانان بووە .
زانستی زێتر بڕوانە : –

Georgii Manachi., Chronicon, ed: C.
de Boor
V.I -2, Lipsiae 1904

٤۰ – بڕوانە ووتاری مینورسکی لە
دەزگای ئیسلامی ، بابەتی کورد ، لاپەڕە
۱۱۳۳ لە چاپی ئینگلیزی

٤۱ – دەربارەی کیرتییان ، بڕوانە :
تیت لیفوس ، کتێبی یازدەم ، بەشی
دووەم ، هەروا کتێبی حەوتەم لە وەرگێڕانی
فەرەنسی .

لەلای ئیبن الصبری دا ئەم نێوانە لە
شێوەی کارتاویە هاتووە .

٤۲ – بڕوانە جوگرافی‌یەی سترابۆ ،
کتێبی حەوتەم ، بەشی شانزدەهەم ، چاپی
ئینگلیزی .

٤۳ – سترابۆ ، کتێبی یازدەم ، بەشی
دوازدەم ، چاپی ئینگلیزی .

٤٤ – بڕوانە : –

The Bistoria Monastica of Thomas
Bishop of Marga.A.B.840.
Edited by Ernest A Wallis Budge
LOTT. D.
London 1893. P.69.

# خانزادو لەشکری (١)

أسعد عەدۆ



بەشی زۆری خوێنەران لە مێژووی میرانی سۆراندا شارەزایان هەیە . بەڵام هەروەك دەزانین فۆلكلۆر ، گۆرانیكی بەسەردا دێ بەدرێژایی ئەو ساڵانەی كە بەسەزیدا تێدەپەڕێ . بۆیە منیش وا ئەم دەقە فۆلكلۆری‌یە دەخەمە بەردەستی ئێوەی خۆشەویست بۆ ئەوەی هەر یەكێك لە ئێمە بیروڕای خۆی بەسەر دەربڕێ‌و سەیری ئەو جیاوازییانە بكات كە لە نێوان ئەم دەقەو ئەو دەقەی بلاوبۆتەوە بەتایبەتی لە كتێبەكەی[2] حوێ‌خۆشبوو مامۆستا «محمد توفیق وردی» دا .

**[«لەشكری» سەركردەی سوپای سۆران بووە ، بەڵام «مام بەكرۆكەكان» توانیویانە «لەشكری» توندبكەن بۆ تۆڵەوەرگرتنەوە نە سلێمان بەگ ! بۆیە لە كاتی ڕۆیشتنی سلێمان بەگ‌و لەشكری بۆ لای والی[3] بەغدا . لەو ماوەیەدا لەشكری توانی ئاگری دووزوبانی لەنێوان والی‌و میری سۆران بكاتەوە ، تا بووە هۆی كوشتنی سلێمان بەگ «بە تێكەڵاوكردنی ژەهری مار لەگەڵ قاوە»] . لێرەدا واز لە دەقی مامۆستای ناوبراو دەهێنم .**

لە كاتی گەڕانەوەی میری سۆران لەلای والی بەغدا . . لە ڕێگادا بە تەئسیری ژەهرەكە مردووە[4] : «لەشكری» لەگەڵ سوپاكە دەگەڕێتەوە هەریر . لە دوایی تازیەدا خانزادە خان خوشكی سلێمان بەگ بووە بە میری سۆران‌و لەشكریش سەركردەی سوپای سۆران . بەڵام لەپاش ماوەیەكدا بۆ خانزادە خان ڕوونبۆتەوە كە لەشكری بووە بە هۆی كوشتنی سلێمان بەگ .

كاتێ لەشكری بۆی ڕوونبۆوە ، كە خانزادە خان ڕووداوی كوشتنی برای بیستۆتەوە . . لەگەڵ چەند سەربازو سەركردەی تایبەتی خۆی هەڵات بۆ ناو یەزیدیەكان .

لەپاش ماوەی دوو ساڵ لەسەر ڕۆیشتنی لەشكری ، خانزادە خان ئاگر لە دڵی بەربوو بۆ تۆڵەكردنەوە . گوایە خانزاد بانگی پیاوێكی گەورەی خۆی كردووە . . تاكو نامەیەك بنووسێ بۆ لەشكری ، تیایا ڕوونی‌بكاتەوە **«كە بگەڕێتەوە بۆ هەریرو خانزادیش ئامادەیە خۆی لێت مارەبكات ! چونكە خانزاد توانای نیە بەتەنیا میرایەتی سۆران بكا»** لە كاتی گەیشتنی نامەی خانزاد ، لەشكری بڕوای كردووەو بڕیاری‌داوە بگەڕێتەوە هەریر .

كاتێ خانزاد لەشكری بردەوە ماڵ لە جێگای تایبەتی خۆی داناو بانگی مەلای كردوو خۆی لە لەشكری مارەكردوە[5] !

وە بە لەشكری گوتووە : **«من تا ئێستا ڕەشپۆشم . . ئەم شەوە با وابێ تاكو تازییەی خۆم دەرەوێنمەوە»** .

لەشكریش لەسەر قسەی خانزاد ڕازی‌بووە ، پێش ئەوەی ڕۆژ هەڵبێ . خانزاد جل‌و بەرگی سووری بەسەرخۆ هەڵكێشاوەو چۆتە سەربانی قەسرێ ، چاوەڕوانی ئەوەی دەكرد كە لەشكری بچێتە دیوانێ . .

لەشكری كاتێ لە خەو هەڵسا ، سەری بڵندكردوو دیتی خانزاد بە جلی سوورەوە لە سەربانی قەسرێ‌یە ، گوتی : «بێ ئافات بێ[6] » ، لەشكری هاتە دیوانێ‌و خانزادیش لە جێگای تایبەتی خۆی دانیشت . ئینجا خانزادە خان ڕووی‌كردە لەشكری‌و پێ‌ی ووت : **«لەشكری لە چیت كەم‌بوو ؟ . . دەستووری موكەڕەمت هەبوو ، بۆ وات كرد ؟ !»** .

خانزاد بانگی سەربازانی كردو دەستوپەلی لەشكری‌یان بەست‌و بەرەو داری سێدارەیان برد . . بەڵام لەشكری داوای لە خانزادە خان كردو گوتی : **«خانزادێ سۆران بەگۆڕێ سلێمان بەگ ، فرسەتم بدە چەند بەندو باوم هەیە دەیڵێم‌و ئینجا لەسێدارەم بدە !»** .

خانزادیش داواكەی جێ‌بەجێ‌كردو . . لەشكریش دەستی‌كردە گوتنی ئەم بەیتانە :[7] .

**سەرم دێشێ ، درم بە دەردە . . قەوی[8] بە دەردە ، دەردە . .**

**ئەگەر سەرەكم بۆ لایێ یەزیدێ «ژەنگار»[9] ێ وەبەردە ئاغای خۆم بریندار دەبوو بەسێ ڕمان . لە برینە كی دەهاتەوە كێمە ! لەبرینێدی دەهاتەوە خینە ! لە برینێدی دەهات خیزاوكە دەزەردە !**

**گەڕاینەوە بۆ سەر زێ‌ی «بادینان» لە تۆزو خوبارو گەردێن وەردە لەزێ‌یێ بادینان هەربردین . .**

**هاتینە «خاروان‌و ڕەشوان[10] » ێ .**

**لە ڕەشوانێش هەر بردین . . هاتینەوە «دێرێ»[11] .**

**لە دێرێش هەر بردین . .**

**چوینە «ئاژگەو زرگوزان»**

**لە ئاژگەو زرگووزانێ هەر بردین . . چووینە سۆركێ**

«ماوەران»[12] .

له سۆرکی ماوەران هەر بردین . . چوینه مامه «جەلکه»[13] یێ ڕەنگین ، له مامه جەلکەیێ ڕەنگین . . وەکی ئاورێ خۆم دەداوە .

ئاغای خۆم (٥٠٠) سواری لەگەردا بوو ، هەموو «ماین» کەوێتی قاپ ڕەشن ، سەر زینێ گوراو بە دوونیان لێ دەدا . .

وەکی ئاو ڕێدکەم دەداوە . . ئاغای خۆم (٥٠٠) سواری لەگەردا بوو هەموو ماین بۆرەییێ خار خار سەر زینێ مەخمەری کەسکیان لێ دەدا . .

وەکی ئاورێدکەم دەداوە ، ئاغای خۆم (٥٠٠) سواری لەگەردا بوو هەموو ماین شینکی قەزوانی سەر زینێ مەخمەری زەردیان لێ دەدا

وەکی ئاورێدکەم دەداوە ، ئاغای خۆم (٥٠٠) سواری لەگەردا بوو هەموو ماین شیٚی موتلەق ئەمینی کللكو بژی له جگان لەگەردا . .

وەکی ئاورێدکەم دەداوە ، ئاغای خۆم (٥٠٠) سواری لەگەردا بوو هەموو ماین ڕەشی له تەوری عارەبستانی لەگەردا .

ڕەختو ڕێشمەی ئالتونیان لێ کەدا .

لەشکری دەرێ بە خۆم سەراوو ! بووم له کێروشکەکی کردمه دیاردی له دەنگی تەپروکه ڕەنایی ، گازی سەر بازان ، چریوەی . بازو شەهینان هەریان دەستاند لەبۆ دارێ خشویێ .

زەویێ چل پشکی ، کانێ خاتوونان ، دارێ خرە گرێسان له عاردەکی بە کوچكو کەرەكو هووردە کە بەرییان بەرامبەرێ کۆشکێ «عەیشێ حوسێن بەگان» ئەو خانەو ێرانە له بارەکی تۆزێ وەردان .

سەرم دێشێ ، درم بە ژانە ، قەوی بەژانە ، ژانە .
ئەگەر لەبۆت بە سۆنەی[14] سەرکەسك هەردەرێم .
هێوارانو سبەینان خۆدا وێتە گۆل گۆلەی .
زاردەر بەندی بەبانە .

ئەگەر لەبۆت بەقورنگێ گۆزەر هەردەرێم له عاسمانێ حەوتەمین چووخەی له تەنیشتێ دەبوون بە گۆچانە .

سلێمان بەگی میری دەیکردە گازی : لەشکری گۆراییت کەوێ له چاوان . ئەتوو بگێڕەوە لەسەر هەنگان لەسەر قۆران .

لەوان عەگیدو بە گلەران .
هەمووان بگێڕەوە بکەوە خەراتو خەران بەخشان !
سەرم دێشێ ، ئەگەر درم بە ژانە ، دەچوومە
مەجلسێ سلێمان بەگی قوولی بەگان .

لێم ڕادێخستن چەند تەکە نموو مافوورو سوجادەی ئەسلێ خوورەسان لەسەروان ڕا یەخانم دادەنانەوە نۆسەد جووت کورسی پێنچەکە زێڕنیشان !

لەسەروان کورسیان دادەنیشتن ئاغەو بەگلە روخان ،
هەموو گەوری قاقومی لەسەر ملانەو باسقەندی یارسەمەن ،
مۆرنێ کارەبایان دەکەتەوە سەر لێوان .

چەند خورامو نۆکەر ڕاوەستابوون هەموو مل بەرزێ «داودی» دەست بەشیرو مەتاران بەدەست هەندەکان وەبوو ئافتابو مەسینە . بەدەست هەندەکان وەبوو قاوەو فنجان .

هەندەکیان بازیان لەسەر چەنگان .
هەندەکان تاژیان [15] دەرستان .
دەچوومە هۆدەیەکی لەبۆم دینان نۆسەد جووت .
دەبانچەی ئیپك فارس ئەسل کارخان .
ئەگەر دەچوومە هۆدەیێ دیکە لەبۆم دینان
نۆسەد جووت خەنجەری نیرۆیی کرمان .
ئەگەر دەچوومە هۆدەیێ دیکە لەبۆم دینان .
نۆسەد جووت شیری قاپلەمەی ئەسلێ شێخان .
ئەگەر دەچوومە هۆدەیێ دیکە لەبۆم دینان .
نۆسەد جووت ڕمی نەسیری سەروبن تۆپ زێڕ نیشان .
ئەگەر دەچوومە هۆدەیێ دیکە له بۆم دینان .
نۆسەد جووت مەتاری سۆری ڕەوغەنداری ئەسلێ حەیزەران .
ئەگەر دەچوومە هۆدەیێ دیکە له بۆم دینان .
نۆسەد جووت زرێ داودی تارقە هوورد ئەسلێ خوورەسان .
ئەگەر دەچوومە تەویل خانەی سلێمان بەگی قولی بەگان .
له بۆمدینان نۆسەد جووت کەوێتی قاپ ڕەشی بۆرەیی خار خار شینکی شاسەیوان .
ئەگەر دەچوومە هۆدەیێ دیکە لەبۆم دینان .
نۆسەد جووت زینی مور سح ئەسلێ قایش هەمەدان .

ئەگەر دەچوومە هۆدەیێ دیکە لە بۆم دینان .

نۆسەد جووت ڕەختو ڕێشمەی بەنێمچەو دووبارە دەکەنەوە سەرملێ مەعنەگان .

کاکە لەتپری ڕاوێندەدا ڕاوێ خۆم دەهاویشتە کۆنێ هەریرو هەریر بەگیان

ڕەزگەو ماوەران باشورێ فاتمێ

کادێواری ، زاردەر بەندی بەبانە .

هەندەکان دەیانگۆت شای ئەسکەندەر ! هەندەکان دەیانگۆت جمجە سلتان ئەوی بناسیا دەیگۆت ناوەڵلا ئەوە سلێمان بەگی شاقوولی بەگانە .

سەرم بەگارە ، درم هەربەگارە ، قەوی‌بەگارە .

ئەگەر ڕۆژێ عەزیزو مبارکم لێ هەردەهات شەوق‌و شەبەقێ .

خۆی دەداوە لە گەرێ شەدادو نەمرودان ! لە ڕەزێ سوورە دیو کۆشکێ عەیشێ حوسێن بەگان ، لە وان .

تاقانو پەنجەران‌وشانە شینان‌و حورو سیان دەیکردەوە وارا . دەچوومە مەکتێبخانەی سلێمان قوولی بەگان .

چەند ئەفەندی دانیشتبوون لەسەر کورسێ نەسەندەری .

ئەمریان دەنووسی پایە بەپایە دەیاننارده خوارە .

ئەگەر دەچوومە مەجلسی سلێمان بەگی قوولی بەگان .

چەند وەزیر دانیشتبوون هەموو کەوری قاقومی لەسەر ملانەو

باسقەندی یار سەمەن ومۆرنێ کارە بایان .

دەکەوتەوە سەر لێوان دەیان کردە تەکبیرو مشاوەران و مەهارا .

ئەمان سەد حەیف‌و دوازدە مخابنێ دونیایێ دەمینێ لۆیەکەکی وەکی سلێمان بەگی بەگی میری .

لەشاری بەکاولە بەغدایێ بەفنجانەکە ژەهرە مارێیان کرد شرارە .

پاش تەواو بوونی لەشکری لە گوتنی ئەم بەیتانە ، خانزادەخان فەرمانی‌دا ، پارچە پارچە گۆشتی لە لەشی بکەنەوە تا دەمرێ ! !

**پەراوێزو فەرهەنگۆك**

(١) ئەم دەقەم لە کاك عەزیز شێخ مەحمەد عەزێز وەرگرتووەو تۆمارم‌کردوە ، تەمەنی نزیکەی (٥٠) ساڵە لە گوندی بەحرکە لەدایك بووە .

(٢) خانزادو لەشکری .

(٣) مامۆستا ووردی دەڵێ لە ئەستەمبۆلەوە پلەیەکی بەرزتری بۆ هاتبوو ، والی بەغدا لەدوای سلێمان بەگی ناردبوو کە بچێت پلەکەی وەربگرێت .

(٤) هەمان سەرچاوە دەڵێ سلیمان بەگ لە شاری هەولێر نێژراوە .

(٥) گوایە خانزاد خۆی لە لەشکری مارەکردووە بەلام بۆ بەیانی کوشتویەتی .

(٦) کاتی خۆی باوبووە ئەگەر میر جلی سۆر بەسەر خۆی هەڵکێشێ نیشانەی تۆڵە کردنەوە بووە .

(٧) بێ ئافات : وەك دوعایە ، بۆ ئەوەی هیچ شتی خراپ نەبێ .

(٨) ئەم بەیتانەی من نووسیومە لە کتێبەکەی مامۆستا ووردی‌دا نیە جگە لە ٨ — دێر .

**فەرهەنگۆك** :

٩- درم — دڵم

١٠- قەوی — زۆر

١١- ژەنگار — سنجار ، شەنگار

١٢- خاروان‌و ڕەشوان : دوو گوندن سەر بە ناوچەی هاوینەهەواری «صلاح الدین»ە .

١٣- دێری : گوندێکە سەر بە هاوینەهەواری «صلاح الدین»ە .

١٤- ئارگەو زرگووزان : دوو گوندە لە ناوچەی خۆشناو .

١٥- ماوەران : گوندێکە لە خۆشناو «گەورەترین قوتابخانەی هەبووە ، ئەویش بنەماڵەی حەیدەرییەکان پێوە هەڵسابوون

١٦- مامە جەلکە : گوندێکە لەسەر ڕێگای «هەریر»ە .

١٧- کەسك : سەوز

١٨- تەور : تەویلە ، خان

١٩- سۆنە : مراوی .

٢٠- گاز : بانگ .

٢١- تەکەنەموو مافور : لاکێش لە دیوەخان ڕادێخرێ .

٢٢- تاژی : تانجی .

٢٣- شەدادو نەمرودان : گەریەکە لە ناوچەی خۆشناوەتی .

# مەترسی بۆمبای نیۆترۆن

شێرکۆ فتح الله عبد الله

لەو دوایی‌یەدا دەربارەی بۆمبای نیۆترۆن لە لایەن رۆژنامەوگۆڤارو ئێستگەکانیَ جیهاندا زۆر نووسراو وترا ، سەرەرای ئەوەش زۆر لە گەورە پیاوانی سیاسی باسی‌ئەکەن ، وەك هۆیەك میللەتانی پیَ ئەترسێنن ، جا بە سوپاسەوە ئەم کورتە باسە دەربارەی بۆمبای نیۆترۆن پێشکەش بە خوێندەوارانی کوردی بەرێز ئەکەم ، هیوام وایە سوودی لیَ وەربگرێت .

لەبەر ئەوەی بۆمبای نیۆترۆنی دوا ئەنجامی تەکنۆلۆجیاو دوا قۆناغە کە تا ئێستا زاناکان توانیویانە بیگەنیَ ، بۆیە پێش ئەوەی باسی هیدروجین بکەین هەندیَ لە بۆمبای ئەتۆمی بدوێین .

**بۆمبای ئەتۆمی «القنبلة الذرية»**

کاری بنەرەتی بۆمبای ئەتۆمی بۆ جۆرێك لە جۆرەکانی کارلێك‌کردنی ناووکی‌یەکان دەگەرێتەوە کەپیَی دەووترێت کارلیك کردنە کەرت بووەکان «تفاعلات الانشطار» ئەمەش بریتیە لە دوو کەرت‌بوونی ناووکە زۆر قورسەکان‌و ناووکێکی تازەی مام‌ناوەندیی زیاتر دامرکاویان لیَ پێك‌دێت وە لەگەلَ ئەوەش بەشێك لە ووزەی ئەو ئەتۆمانە دەردەچێت بۆ نموونە لەسەر ئەو کارلێك کردنە «یورانیۆم ٢٣٥» پێك‌دێت .

رووداوی ناووك کەرت‌بوون دروست‌ئەبێت کاتێك کە ناووکی توخمی (یورانیوم ٢٣٥) بە نیۆترۆن بەردومان‌بکرێت وە لە ئەنجامدا لە کەرت‌بوونی ئەتۆمی یورانیۆم دوو نیۆترۆن پەیدا دەبێت . کە ئەمانیش ئەبنە هۆی بەکەرت‌بوونی دوو ناووکی تری یورانیوم دوایی چوار وە هەشت بەم جۆرە ژمارەی ئەتۆمەکانی یورانیۆمی بەکەرت‌بوو زۆردەبێت کە ئەوەش پیَی دەووترێت «زنجیرەی کارلێك‌کردن» وە لەبەر ئەوەی ئەم رووداوە زۆر بەخێرایی ئەبێت بۆیە ژمارەیەکی زۆر گەورە لەو



ئەتۆمانە کەرتدەبن‌و لە ئەنجامدا وزەیەکی زۆر دەردەچێت . ئەوەش زۆر لە «فرنە ناووکی‌یەکان»دا روودەدات ، وە ئەبێ یورانیۆمی ۲۳۵» کە لە بۆمبای ئەتۆمی بەکاردێت بەتەواوی پشبێت . وە شتێکی بنەڕەتی ماوە کە ئەویش بارستایی یورانیۆمی بەکارهێنراوە لە بۆمبای ئەتۆمی ، پێویستە لە بریکی دیاریکراو کەمتر نەبێت کە کریتیکال سایز «کبر الحرج»ی پێ ئەووترێت تا زنجیرە کارلێك کردن بەردەوام بێت .

$$_{92}U^{235} + {}_{0}N^{1} \longrightarrow {}_{56}B^{138} + {}_{36}K^{95} + 3\,{}_{0}n^{1} + \text{وزە}$$

**مەترسی لە بۆمبای ئەتۆمی** :

۱ – لە ئەنجامی راستەوخۆ تەقینەوەی بۆمبای ئەتۆمی گەرمایی‌یەکی زۆر بەهێز پەیدا ئەبێ کە توانای تواندنەوەی کانزای هەیە لەو جێگەیەی لێ‌ی ئەتەقێت ، وە سووتانێکی زۆر پەیدادەبێت‌و ماوەیەکی دوور ئەڕوات‌و زیان بە هەموو لایەکەوە ئەگەیێنێت .

۲ – لە ئەنجامی کشانێکی کتوپڕ لە هەوا ئەشوێنی تەقینەوەکە شەپۆلێکی پەستن دروستدەبێت . ئەم شەپۆلەش بە خێرایی دەنگ ئەڕوات ، یانی (۳٤۰ م‌چرکە) ، هەروەك دیوارێکی رەق‌و بەتین هەموو شتێك تێك‌ئەدات‌و خانو ئەڕوخێنێت‌و دارستان لە ڕەگ‌و ڕیشەوە هەڵئەکەنێت‌و ئەیسووتێنێت .

۳ – لە کاتی تەقیندا هەندێ تیشك دەردەچێت لەوانە «تیشکە گاما» وە هەروەها نیۆترۆنە خێرایی‌یەکان بە چڕی‌یەکی زۆر بەرزەوە ئەوەی ئاشکرایە تیشکە گاما یەکسەر ژیان ناهێڵێت وە نیۆترۆنەکانیش وا ئەکەن کە هەندێ توخم لە هەوا بگۆڕێن بۆ توخمە تیشکاوەرەکان وە هەندێکیان ئەمێننەوە تا ماوەیەکی

زۆر درێژ وەکو «سترونتیوم» کە لەگەڵ هەوا دەگواسترێتەوە وە هەروەها لەگەڵ باران ئەکەوێت ئەوەش دەبێتە پیس‌بوونی «تلوث» ئاوو خواردەمەنی واتە بەپێی قەوارەو ووزەی بۆمباکە ، تا ماوەیەکی زۆر ، لە دەوروو پشتی ئەو شوێنەی بۆمباکەی لێ تەقیوەتەوە ، ژیان لە مەترسی‌دا ئەبێت .

**بۆمبای هیدرۆجینی :**

بنچینەی ئیش‌کردنی بۆمبای هیدروجینی جۆرێکی ترە لە کارلێك‌کردنە ناووکی‌یەکان پێی ئەوترێت یەك‌بوونە کارلێك‌کردن ، «تفاعلات الاندماج» ئەمەش ئەوەیە کە ناووکە سووکەکان دەتوانن لەگەڵ یەکتریدا یەك‌بگرن‌و ببنە یەك ناووکی قورستر و دامرکاوتر وە بەم یەکبوونەش ووزەیەك دەردەچێت . وە دوو جۆر یەکبوون لەناو خۆردا ڕوودەدات کە هەردووکیان سەرچاوەی ووزەکەیەتی ، وە ئەنجامی هەریەکەیان پێکهاتنی ناووکی هیلیۆمە لە چوار ناووکی هایدرۆجین‌و دەرچوونی دوو پۆزیترۆن لەگەڵ بڕێکیش ووزەکە هاوتای جیاوازی‌ی ئەو بارستاییەیە لە کارلێك‌کردنەکەدا بەشداردەبن لەگەڵ بارستایی ئەوانەی کە لێ‌ی دێنە بەرهەم .

$4\,{}_{1}H^{1} \longrightarrow {}_{2}He^{4} + 2 + {}_{+1}e^{0} +$ ووزه

وە بۆمبای هیدروجینی لە ڕێگای ئەم کارلێك‌کردنە یەکبوونەوە ووزەیەکی زۆر دێنێتە بەرهەم ، وە دەتوانرێت ئەم بۆمبایە زیاتر لە بۆمبای ئەتۆمی رووخێنەر بکرێت چونکە ئەو ووزەی یەك گرام بەو یەکبوونە دەیدات زیاترە لەو ووزەیەی کە بە کەرت‌بوون دەدیدات ! ئەمە لە لایەك وە لە لایەکی تریشەوە دەتوانرێت بڕێ ئەو مادانەی بەشداری کارلێك‌کردنەکە دەکەن بەبێ ترس زیادبکرێن . وە لە ڕاستیدا بڕێ لەو ماددانەی بێ سنوورن بە ژمێرە دیاری ناکرێن چونکە ئەو ماددانەی لە کارلێك‌کردنە یەکبوونەدا بەشداری دەکەن پێویستی بە کریتکال سایز نیە چونکە یەکبوون زنجیرە کارلێك‌کردن نیە .

وە لەو کارلێك کردنانەی کە لە بۆمبای هیدروجین دا دەشێت ڕوو‌بدات بەرهەم‌هێنانی گەردە ئەلفاو بڕێکی بێ شوماری ووزەیە لە ئاوێتەی لیسیۆم‌و هیدروجین‌دا ${}_{3}Li^{6}\ {}_{1}H^{2}$ بەڵام ئەم کارلێك‌کردنە روونادات ئەگەر ${}_{3}L^{6}{}_{1}H^{2}$

نەخرێتە بەر پلەیەکی گەرمی یەکجار زۆر بەرز «١٠٠ سەد ملیۆن پلەی سەدی» و ژێر پاڵەپەستۆیەکی زۆر گەورە ئەویش لە ڕێگای بۆمبای ئەتۆمی‌یەوە دەبێت کە وەك تەرەقەیەك بۆ تەقاندنی بۆمبای هیدروجینەکە بەکاردەهێنرێت :

${}_{3}Li^{6}\ {}_{1}H^{2} \longrightarrow 2\,{}_{2}He^{4} +$ ووزه

هێزی بۆمبای هیدروجینی زۆر قۆناغ لە سەرووی بۆمبای ئەتۆمی‌یەو هێزەکەی نەك بە دە هەزار تەن لە ماددەی «تی ، أین ، تی» بەڵکو ملیۆنەها تەن یان بە جۆرێك کە بۆمبای هیدروجینی قەبارەی بێ سنوورە وە ئەتوانرێت گەورەبکرێت بەهەرچۆنێك لە سنووری تەکنۆلوجی گرانەکان بەس . . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بۆمبایەکی تر هەیە کە مەترسی زۆرترە پێی دەووترێت :

**بۆمبای گەورە «القنبلة العظمى»**

ئەم بۆمبایەش لە بۆمبایەکی ئەتۆمی بچووك لە ناوەڕاست بڕێکی دیاری‌کراو لە هیدروجین‌دا پێك‌دێت ، لە دوایی‌دا بە بەرگێك کە چینێکی ئەستوورە لە یورانیۆم ئەپۆشرێت کە ئەویش دیسانەوە بە بۆمبایەکی ئەتۆمی کۆتایی‌دێت ، وە پێویستە بزانرێت کە ئەو هیدرۆجینە «ثلاثي»یە تریتیۆم کە ڕێژەی لە هەوای زۆر کەمە وە ئەتوانرێت جۆرێکی تر لە هیدروجین «دیتریۆم» بەکاربهێنرێت کە ئەویش هیدروجین «ثنائي» یە وە ڕێژەیەکی زۆرتری لە هیدروجین «ثلاثي» هەیە ، وە هەروەها ڕێژەیەکی تەواوی لە ئاوی دەریاو ئۆقیانوسی هەیە .

**تیشکە لێزەرو بۆمبای هیدرۆجینی :**

لەو هەوڵدانانەی کە کراوە بەکارهێنانی تیشکە لێزەر بۆ تەقاندنی بۆمبای هیدروجینی بە جۆرێك کە دەستگای تیشکە لێزەر لە جیاتی بۆمبای ئەتۆمی دابنرێت لەناو بۆمبای هیدروجینی وە بەم جۆرە تیشکە لێزەرەکە ووزەیەکی زۆر بەرزی هەیە (فۆتۆنەکانی ووزەیان سەد ملیۆن جار بەقەدەر ووزەی فۆتۆنی ڕووناکی ئەبێت) ، ئەتوانێت هیدرۆجینی ناو بۆمبای هیدروجینی تا پلەی دیاری‌کراو گەرم‌بکات .

**بۆمبای نیۆترۆنی :**

بۆمبای نیۆترۆنی بریتیە لە سەرێکی ناووکەیی گەرمایی «رأس نووي حراري» بۆ تەقاندن بەهۆی تۆپێك کە لەسەر شێوەی ڕۆکێت ئامادەکراوە .

بۆمبای نیۆترۆنی بریتیە لە بۆمبایەکی هیدروجینی بچووك‌و بە چینێکی ناووکەیی ئەستوور لە سوپر هیدروجین پێچراوە یان

بەشێوەیەکی تر تێکەڵێکە لە دیتریۆم «هیدرۆجینی گران» و ترتۆم «هیدروجین کە کێشی ئەتۆمی ٣» وە ئەگەر ئەو بۆمبایە تەقی ئەوسا هیدروجین تووشی گۆرانێکی نوێ ئەبێت لە «ناووکە کەرتبوون» لەو ئەنجامەدا لێشاوێك لە نیوترۆنی ئاراستەکراو بلاّوئەبێتەوە وە دەبێتە هۆی کوشتنی هەموو دانیشتوان لەو ناوچەیە بەبێ ئەوەی خانووبەرە یان تانگ تێك‌بچێت، بەراوردی لەگەڵ سەری ناووکەیی ئاسایی، واتە هەموو کارەکانی تەقینەوەی بۆمبای نیوترۆنی لە کاری تیشکەکان ئەبێت بەلاّم کاری تری زۆر کەمە.

کاتی تەقینەوەی بۆمبایەکی هیدروجینی کە ووزەکەی «١٠ کیلوتەن»ی هەبێت ئەمانەی خوارەوە ڕووئەدات: –

١ – لە ڕادەی (١٠٠) مەتر لە پنتی تەقینەوە تێکدان هەموو خانوبەرێك وتانك‌و ئۆتۆمبیلێك ئەگرێتەوەو مەترسی تیشك چەند سەعاتێك یان چەند ڕۆژێك بەردەوام ئەبێت، جا بۆیە هەر لە ساتی تەقاندن هەموو ئەو دانیشتوانەی لەناو ئەو بازنەیەن کە نیوەتیرەی سەد مەتر بێت ئەمرن.

٢ – لە ڕادەی (١٥٠٠) مەتر لە پنتی تەقینەوە کاری تیشکەکان تا چەند سەعاتێك ئەمێنێتەوەو تەقینەوەکە ئەبێتە هۆی ئەوەی زیانێکی زۆر لە خانوبەرەکان بدات.

٣ – بەلاّم لە ڕادەی «٢٠٠٠» مەتر کاری تیشکەکان زۆر لاواز دەبێت، کەچی لە ئەنجامی تەقینەوەدا زیانی مادی زۆر دەبێت. بەلاّم کاتی تەقینەوەی بۆمبای نیوترۆنی لە هەمان بەرزایی پێشوودا کاری جیاوازی دەبێت:

١ – لە ڕادەی «٣٠٠» مەتر لە پنتی تەقینەوەدا تێکدانی هەموو خانووبەرێك دەگرێتەوەو هەموو دانیشتوانی ئەو ناوچەیە بەهۆی نیوترۆنەکانی کە دەردەچن ئەمرن، بەلاّم پاش تێپەربوونی چەند چرکەیەك تیشکەکان بزردەبن‌و نامێنن.

٢ – لە ڕادەی «٩٠٠» مەتر لە پنتی تەقینەوە کاری هێزی تەقینەوە زۆر گەورەو بە ترس دەبێت‌و تیشکەکان لە هەمان کات‌داو لە ماوەی (٤٨) سەعات‌دا ئەبنە هۆی کوشتنی هەموو دانیشتوانی ئەو ناوچەیە.

٣ – لە ڕادەی «١١٠٠» مەتر لە پنتی تەقینەوە کاری پەیدابوو لە ئەنجامی تەقینەوە مەترسی نامێنێت واتە لەو ڕادەیە هیچ زیانێکی مادی وا ڕوونادات بەلاّم کاری تیشکەکان لە ماوەی (٦) شەش ڕۆژدا ئەبێتە هۆی مردنی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە.

٤ – لە ڕادەی «١٥٠٠» مەتر لە پنتی تەقینەوە بە هیچ جۆرێك زیانی مادی ناگاتێ بەلاّم دوای تێپەربوونی دوو یا سێ هەفتە دانیشتوان بەهۆی تیشکەکەوە ئەمرن.

٥ – لە ڕادەی پێشوو زیاتر تا کەمتر لە (٥) پێنج کیلۆمەتر لە پنتی تەقینەوە کاری تیشکەکان نابێتە هۆی مردنی دانیشتوان بەلاّم زۆر شت وەکو نەخۆشی کەوتنی موو، سووربوونەوەو دەرچونی خوێن لەژێر پێستە، تێکچوونی هاوینەی چاو، شێرپەنجە «السرطان» بە هەموو جۆرەکانی‌یەوە، واتە دانیشتوان بێ هێزو ئیفلیج ئەبن.

لە بەراوردی پێشوودا دوو شتی گرنگمان بۆ بەدیار دەکەوێت: –

أ – بۆمبای نیوترۆنی نابێتە هۆی تێکدانی خانووبەرە، تەنها لە ناوچەیەکی تەقینەوەی کەم نەبێ بەلاّم کاری تیشکەکانی ئەبێتە هۆی کوشتن‌و نەمانی هەموو گیانەبەرێك کە لەو ناوچەیەن واتە هەموو گیانلەبەران لەناو خانووبەرەکاندا بە لاشەیەکی مردوو ئەمێننەوە.

ب – بۆمبای نیوترۆنی کاری تیشکەکەی دیاری‌کراوەو بە پێچەوانەی بۆمبا ناووکی‌یەکانی تر زۆر نامێنێتەوە کە کاری تیشکەکانیان‌و مەترسی گیانلەبەر کوشتنیان تا چەند ساڵێك دەمێنێتەوە ئەوەش بێ گومان یارمەتی هێرش‌بەر ئەدات بۆ گرتنی ئەو ناوچەیەو دەست‌بەسەراگرتنی دوای ماوەیەکی کەم، واتە گرنگی‌یەکی زۆری هەیە لەبارەی ئابووری‌و سەربازی‌یەوە.

لەو باسەدا خوێندەواری بەرێز مەترسی ئەم جۆرە چەکەی بۆ بەدیارکەوت بەلاّم نابێت ئەوەشمان لەبیر بچێت کە خەباتی میللەتان هەرگیزاو هەرگیز لەو جۆرە چەکانە بەهێزترە.

**سەرچاوەکان:**


1 – Teacher's edition Modern Physics
Holt Rinchert And Winrston, Inc
New York, Toronto-London

٢ – مجلة حراس الوطن/العدد العاشر/السنة الثالثة والعشرون تشرين أول ١٩٧٨.

٣ – مجلة «الف باء» العدد ٤٦٥ لسنة ١٩٧٨

٤ – الفيزياء العصرية/ ناجي عبد الصاحب

٥ – ندوة تلفزيونية عن القنبلة النيوترونية/د. عبد الواحد

٦ – مجلة العلم والحياة العدد ٦٨ سنة ١٩٧٨.

بوّچی ده خه وین وخه وچ کارِیګ ده کانة

سرِته ندروستیمان ؟

خەڵك وا راهاتوون کە بڵێن مرۆڤ
زیندوو وەك پارچەی مەکینەی
هەمیشەجوڵاوە وایە. بەڵام ئەوە نازانن
کە پارچە مەکینەکە وەك مرۆڤ وایەو
هەمیشە پێویستی بە چاودێریو پاراستنەو

محمد علی قەرەداخی
کردوویە بەکوردی

سەرپەرشتییەو تا کۆنتر بێ زیاتر پێویستی بە پاککردنەوەوڕۆنو گریزو گۆڕینی هەندێ پارچەی کۆنو سواوە . ئەمەیش رێك وەك مرۆڤ وایەو شانەو پارچە وردەکانی لەشی مرۆڤ کە چوونە ساڵەوەو نزیکە سووانو پووان بوون لەشی مرۆڤ خۆی بە شێوەیەکی فیزیولوجی ئەو پارچانە دەگۆڕێ ، یان مرۆڤەکە ناچار دەبێت بچێت بۆ نەخۆشخانەو بپرسێ بزانێ چی سوواوەو چی نزیکە لەکار بکەوێت تا فریایان بکەوێ ؛ چونکە مرۆڤ تا زیاتر ماندوو بێت زیاتر پێویستی بە گۆڕینی ئەو شانەو پارچانەیە . ئاشکرایشە هیلاکی ئاسایشی دەوێو ، تینوێتی بە ئاو دەشکێو ، برسی بە خواردن تێر دەبێو ، بێخەوی‌و خەوهاتن ، خەو دەرمانیەتی .

جا ئەگەر ئەم ئاڵو گۆڕە نەبێت لەش تێکدەچێت‌و کێش‌و تەرازووی لەنگ دەبێت‌و ئەنجام باش نابێت .

هەندێك گیانلەبەر هەن دوو هەفتەی بەرگەی برسێتی دەگرن بەڵام هەفتەیەك بێ خەو هەڵناکەن . کە واتە (خەو) چیەو خەوی رێك‌و لەبار کامەیە ؟ کەمخەوی چی لێ پەیدا دەبێت؟

لێك‌دراوەتەوە مرۆڤێك کە حەفتاو پێنج ساڵ بژی تێکڕا نزیکی (٢٠) ساڵ لەو تەمەنەی بە خەودا دادەشکێ . هەروەها بۆ زانایان دەرکەوتووە کە باشترین کاتی خەو خەوی زوو سەر لەئێوارەیە . وەك زانیویانە کە یەکێك لە شەوا شەش سەعات بخەوێت لە رۆژی داهاتوویدا پێویستی بە ئەرکێکی زیاتر هەیە تا بتوانێ کارەکانی ئەنجام بدات‌و لە داهاتوودا بەرهەڵستی کەم دەبێت‌و بێتوانا دەبێت . دەرکەوتووە کەخەوی مرۆڤ لەگەڵ یەکێکی دیکەدا لەوە ناخۆشترە کە خۆی بەتەنها بخەوێت ؛ چونکە هەر جموجووڵێکی هاوسەرینەکەی دەبێتە هۆی ئەوەی ئەم بشڵەژێنێو خەوی لێ تێك‌بدا .

هەروەها بێخەوی دەبێتە هۆی ئاڵۆزی بیرو دەروونو تا لەش‌و بیری مرۆڤ ماندووتر بێ خەوەکەی زەحمەتتر دەبێت ، هەروەها جێگەی زۆر نەرم‌وشلیش خەو لە مرۆڤ تێکدەدات‌و باشترین نوێن ئەوەیە نە زۆر نەرم‌و نە زۆر رەق بێت ، وە ماندوێتی ئەقڵو بیر لە هەموو شت زیاتر خەو لە مرۆڤ دەتارێنێ .

ئەوەیش روون بووەتەوە خەوی خۆش‌و لەبار ئاسایش ئەدا بە هەموو ئەندامەکانی لەش‌و بە گوێرەی پێویستی خۆیان دەیانحەوێنێتەوە ؛ دڵ کە لە کاتی بێداریدا لە دقیقەیەکدا (٧٥) جار لێدەدا لە کاتی نووستندا دێتە سەر (٦٠) جار ، پلەی گەرمی لەشی مرۆڤ لە خەودا دێتەخوارەوە ، هەناسەدان لە دەقیقەیەکدا لە (١٧) جارەوە کاتی خەو دێتە سەر (١٢) جار . وەك هەندێك جێگەی لەش لە کاتی نوستندا زیاتر خۆدەکەونو خۆشتر لەکار گەرم دەبن ؛ وەك (غوددە) ی عەرەقکردنو دەرکردنی ئەو زیادانەی لە کاتی کاردا لە لەشدا خڕدەبنەوەو رێگەی دەرچوونیان نیە .

زانایان دەربارەی خوێن پێشتر دەیانوت لە کاتی خەودا کەمتر هەڵدەقوڵێ بۆ لای مێشك ، بەڵام ئیستە لەو قسە پاشگەز بوونەتەوەو دەڵێن هەندێ جار زۆر هەڵدەقوڵێو هەندێك جار کەم .

دوای ئەمانە با بزانین کەمخەوی لە چیەوە پەیدا دەبێت‌و ، ماوەی خەوی ئاسایی بۆ لەشی ساغ چەندە ؟ ئاشکرایە پزیشکەکان لە هەموو کەس زیاتر بە تەنگ لێکدانەوەی حاڵی مرۆڤەوەن لە کاتی خەوو بێداری‌و ساغی‌و نەخۆشیدا ، دوای چاودێری‌و سەیرکردنیان بۆیان دەرکەوتووە ئەندازەیەکی دیاری‌کراو نیە بۆ خەوو هەرکەسێ بە گوێرەی هەڵکەوتنی لەشی خۆی دەخەوێت‌و کاتی مام‌ناونجی بەسەر کەسدا ناسەپێ ؛ زەلامی وا هەیە رۆژی دە سەعاتی خەو دەوێت ، کچی هی وایش هەیە پێنج سەعاتی بەسەو دوای ئەوە کە لە خەو هەڵدەستێ تێرخەوەو لەشی ئاسوودەیە ، جاری وایش هەیە دەبینین زەلامێك لە کاتی کارداو لە پشت مێزەکەیەوە خەو دەیگرێت‌و خەوەنوچکە (وەنەوز) دەیباتەوەو چاوێکی بۆ گەرم دەکات کەچی دوای ئەوە لەشی زۆر ئاسوودە دەبێت‌و ماندوێتیەکەی نامێنێ .

زانایان لەم مەسەلە کۆڵیونەتەوەو ئەوەیان شی‌کرووەتەوە کە :

ئایا خەوی پچڕپچڕ جێگەی خەوی سەرومڕ دەگرێت ؟ دوایی لەمەیشدا لە یەك قسەدا یەکنەکەوتوونو دەڵێن ئەمەیش بە گوێرەی هەڵکەوتنی لەش‌و بۆهاتنی‌و ، توانای لەش‌و بیری ساف دەبێت‌و تێکڕا کاتی ئاسایی لە نێوان شەش تا حەوت سەعاتدایەو هەندێ لەش بەم ئەندازە کە سەرومڕ بخەوێ تێرخەو دەبێت‌و کابرا بە تێرخەوی هەڵدەسێت ، وە هەندێ کەس ئەگەر بە دوو جار هەر جاری سێ سەعات بخەوێت تێرخەو دەبێت . ئەم شێوە نوستنە لە هەندێ قوتابی زانکۆدا تاقی‌کراوەتەوەو دەرکەوتووە کە ئەگەر بە دوو جار – هەر جاری سێ سەعات – بخەون لەوانە بە نیشات‌و تەواناو ئاسوودەتر دەبن کە سەرومڕ شەش سەعات خەوتوون .

خەو بارێکی (غەریزی)یەو هەموو گیانلەبەرێك پێویسی بە حەوە ، گیانلەبەر

ێخەو بکرێت درندەیەکی ترسناکی تێـەردەچێت .

خەو لە مرۆڤ هەراس بکرێت لە عە ڕیزەیەکی سروشتی بێبەش دەکرێتو لەم ێخەویەوە گەلیٚ نەخۆشی دەروونیو ئـۆزی بیری روون دەداتو هەندیٚ جار ێهۆشیو برسکانیشی لەگەڵدا دەبێت .

زەلامی بێخەو بینراوە خۆی کردووە بە سەیرەکەیدا — کە لە نزیکی ماڵەکەیدا وەستاوە — و جلو بەرگەکەی داکەندووەو ـگی کردووە لە ژنەکەی نانی بۆ تێبکات بە حەیاڵی ئەوەی لە ماڵەوە دانیشتووە . زەلامی وەهایش بینراوە کە زۆر گەرما ووەو گرە سەرو چاوی هەڵقرچاندووە ، پەرداخیٚ ئاوی لە بەردەمدا بووە بەسەر مێزەکەیەوە هەستاوە خۆی داکەندووەو دەرپێی مەلەی لەپیٚ کردووە وای زانیوە گۆمیٚ ئاوی لەبەردەمدایە !

ئەم کارانە لە یەکیٚ روو دەدەن چەند رۆژیٚ نەخەویٚ ، بەڵام خەوی بچربچڕو ناوبەناو دەبێتە هۆی ماندووکردنی لەشو بیرو زوو پیاو دەبات بە پیری پیریەوە . لەمەوە دەردەکەویٚ ئەوە راست نیە کە دەوتریٚ مرۆڤ تا پیر ببێت خەوی کەم دەبێتەوە ؛ چونکە وەك خواردن لە کاتی برسێتیداو ئاو لە کاتی تینوێتیدا پێویستی لەشن خەویش وایەو مرۆڤ هەرکاتیٚ هەستی بە بێخەوی کرد دەبیٚ بخەویٚ . دەبینین هەندیٚ کەس شەش حەوت سەعات دەخەون کەچی کاتیٚ هەڵدەستن هێشتا ماندوونو هەست بە لەشگرانیو بارقورسی دەکەن ئەمەیش ئەوە دەگەیەنیٚ کارێکی قورسیان کردووەو دەبیٚ زیاتر بنوونو لە وەختی نیوەڕۆدا لە شوێنێکی ئارامو بێدەنگدا سەرخەویٚ بشکێنن ، دوای تاقیکردنەوە دەرکەوتووە ئەم رێگە بۆ خەوزڕاوانو کەمخەوان کەڵکی زۆری هەیەو هەست بە ئارامو ئاسایشێکی باش دەکەن .

شایانی باسە زۆر لە پزیشکە تایبەتیەکان لە نەخۆشخانە گەورەکاندا چارەسەری هەندیٚ دەردی بێدەرمانی وەك :

تەنگەنەفەسیو برینی گەدەو دوازدەگریٚو عەرەقخواردنـەوەی هەمیشەییو هەندیٚ نەخۆشی پێستو دەروونیان . . . بە خەو کردووە بە جۆرێك نەخۆشکانیان ناوبەناو (٢٤) سەعات یان زیاتر خەواندووەو ئەم چارەسەرە لە کاتێکدا بە داو دەرمان نەکراوە بەم شێوە زۆر کەڵکی لیٚ وەرگیراوە . وە بەراورد دەری‌خستووە کەمخەوان لە کاتی کاری رۆژانەیاندا زیاتر بیرئاڵوز دەبن بە تایبەتی کاتی ئێوارە کە زۆر ماندوو دەبن ئاڵۆزیەکەیان زیاتر پەرەدەسێنیٚ .

وەك دەرکەوتووە چاوگەرمکردنو تەرخەوشکاندنێکی کاتی کار هەندێك ئارامیان ئەکاتەوە ئەمەیش ئەوە دەگەیەنیٚ کارکردن رەگو مۆخیان ماندوو دەکاتو هەستیان کول دەکات . بۆیە دەبیٚ ئەو جۆرە کەسانە لەکار کەنار بگرن یان بچنە نەخۆشخانەی تایبەتی .

گەلیٚ جاریش دایکە گەنجەکان بە هۆی گریانی منداڵی تازەبوویانەوە شەونخوونی دەکێشنو ماندوو دەبنو تووشی خەوزڕانو کەمخەوی دەبن وایان لێدیٚ منداڵەکەیشیان پێویستی بە هیچ نیەو خۆیان خەویان لێناکەویٚ . ئەو دایکانەکەوایان بەسەردێو خەویان دەتاریٚ دەبیٚ چارەسەریان بۆ بدوزرێتەوەو ئەمانە هەندێکن لەو شتانەی سوودیان پیٚ دەبەخشن : شەو پەرداخیٚ شیری گەرم بخۆنو لە شوێنێکی گەرمدا خۆیان بشۆنو کاتی خەو دیاری بکەنو ئێوارانو پێش خەوتن زۆر نەخۆنو خۆیان بپارێزن لە گوێگرتنی بەرنامەی رادویٚو سەیرکردنی تەلەفزیۆنو خوێندنەوەی چیرۆکی سەرنجڕاکێش . وە مرۆڤ بەوەدا دەزانیٚ تێرخەو بووە کە لەخەو هەستا ماندوێتی حەسابێتەوەو مێشکی ئاسوودە بووبێت .

وەك گوترا بێخەوی زیانی گەورەی هەیە بە تایبەتی لەسەر مێشكو دەروونو دەرکەوتووە ئەوانەی (٦٠ تا ٩٠) سەعات بیخەو بکرین مێشکیان زۆر ماندوو دەبێتو لەشیان دائەزیٚو هۆشو بیریان نامێنیٚو خۆیان پێناگیریو بێخوو و خدە دەبن . بۆیە رێدەکەویٚ بێتاوان پاش ئەوەی دەخرێتە بەر لێکۆڵینەوەی سەرومڕو خەوی لیٚ‌نەتارێنریٚو هەراسی لیٚ‌هەڵدەگیریٚ ناچار دەبێت دان بنیٚ بە گەورەترین تاوانداو مۆری بکات — لە کاتێکدا هیچیشی نەکردووە — چونکە دەیەویٚ بەهەر نرخێك بێت تاویٚ سەر بنێتەوە خوایەکرد دوای ئەوە دنیا ئاو دەیبرد !

راهاتنی مرۆڤ لەسەر خەوی ئاسایی پەیوەندیبە دۆخی کومەلایەتیو ئاوو هەواو هەستو بیری مرۆڤ خۆیەوە هەیەو خەوتنی زۆر لە کاتی دیاریکراوداو هەستان هەرکاتیٚ بیەویٚ بە راهاتن دەبێتو کەڵکی زۆریشی دەبێتو وای لیٚ دیٚ کاتیٚ خەوی هات دەخەوێتو کاتیٚ ویستی هەڵسیٚ لە خۆیەوە هەڵدەستیتو کاروباری رێك دەبێت . . بۆیە پزیشکان لە کاتی بیرئاڵۆزیو کەمخەویدا خواردنی حەبی خەو پەسەند ناکەن ؛ چونکە لەوانەیە ئەو کارە چەندبارە بێتەوەو مرۆڤ وای لیٚ بیٚ بەو حەبانە نەبیٚ نەتوانیٚ بخەوێت .



# گویای هونەرمەند وشۆڕشگێڕ

عبدالمجید عبدالرحمن

ئیسپانیا وولاتێکی خاوەن رۆشنبیری‌و فیکرو ئەدەب‌و هونەرێکی ڕەسەن بووە بە درێژایی مێژووی. بۆیێ لە مێژووی شارستانی مرۆڤایەتی بەشداری‌یەکی گەشی کردووە، وەك پیکاسۆو گویا Goya فیلازکویز (Velazquez) وزورباران Zurbaran وئەلگریکو EL-Greco وموریللو Murrillo . . . ناوی لە کاروانی هونەری نیگارکێشاندا گەشەدار بووە.

نەك هەر ئەمە بەڵکو لە ڕاستی‌دا گویا یەکێکە لەو هونەرمەندە شۆڕشگێڕانەی کە دەورێکی فیکری‌و فەلسەفی مەزنیان هەبووە لە «فراژین – تطور تطویر» کردنی فیکری ئەوروپایی‌و کارکردنی لەسەر بیروڕاو هەڵویست‌و ڕەوشت «أخلاق»ی نەوە دوواهاتووەکانی ئەوروپا. گۆیا ڕووبەڕووی تەنگوچەڵەمە روحی‌یەکانی مرۆڤ بووەو بە قوولی تێفیکریوەو بەراوردی کردوون‌و بڕیاری یاخی‌بوونی داوە، بەڵام گویا لە یاخی‌بوونیا پەنای بردووە بۆ هێزە تاریك‌و نادیارەکانی دەروونی مرۆڤ. بێ گومان توندو تێژی‌و شۆڕشگێڕی گۆیا لە «هاندەرێکی – دافع» یکی سادی‌و ئاژاوەیی «فوضوی» توندەوە بووە، ئەگەر بە ووردی سەرنج لەو سەردەمە بدەین کە گۆیا تیا ژیاوە، بۆمان دەرئەکەوێ، کەلە سەدەی هەژدەی زایینی دەست بە ڕەفزکردنی بهاکانی مەسیحیەت‌و ئایین وبیروڕاکانی ئاسمان کراوەو، بەتایبەتی لە فەرەنسا دیدرۆو مونسکیوو ڤولتیرو جان جاك رۆسۆ مەرکیز سادەوە . . ئەمانە بناغەیەکی «عقلي» و «ناعەقلي» یان دروست‌کرد، بو شۆڕشێکی فەلسەفی‌و فیکری‌و هەروەها ڕێگایان خۆش‌کرد بۆ شۆڕشە مەزنەکەی فەرەنسا کە لە «١٤ – ٧ – ٩٧٨» بەرپا بوو، بۆیێ گۆیا بەهۆی نیگارەکانی‌یەوە هێزی عەقلی خۆی دەرخست، بە شێوەیەکی واقیعی «فراژین – تطور» کراو، بۆ ئەوەی بە هێزو توندوتیژیەوە، هەروەك «ئەندرێ مالرۆ» ئەوە دەردەخا کە «عەقلی

ـوموه – العقل الباطن – بووه هۆی ێکچوونی گۆیا» .

بەلأم سادیزمی گۆیا تێکەڵ بە «ئیرۆسیزم – Irosism – الحبیة الجنسیة» ەیەکی قوول بووه ، ئەمەش لە کۆمەڵگای دواکەوتووی ئیسپانیای ئەو سەردەمە شتێکی زۆر سەیرو غەریب بوو . ئەمەش مـەی ئەوەمان پێ دەبەخشێ کە هێزی جینسی هێزێکی مەزنو گەورەیەو توانای کونکردنو پەیداکردنی گرێ کوێرەو ێ ەزەیی و «سادیزم» ی هەیە ، کە ئەمانەش ڕێگا بە هێزی ڕەشو تاریكو وێرانکاری و یاخیبوون ئەدەن بۆ ئەوەش ڕموشتو خووی ئایینی خاوێن بشێوێنن و فرۆیدویزم بلاوبیتەوە .

هێزەکی نادیار – المجهول – زاڵ دەبێت بەسەر عەقڵو سروشتو غەریزەی مرۆڤ ، بۆیێ ناوی «خودا» لە نێو کارو بەرهەمەکانی بلیمەتانی ئەم چاخە «سەدەی هەژدەهەم» دا وونبوو ، کەچی هێزی شەیتانی و تاریکی وا دیارکەوت وەك بڵێی زاڵبوبێت بەسەر بوون «وجود» دا .

گۆیا ئەو نادیار «المجهول»ەی وەك هێزێکی شەیتانی بەرچاوکرد ، و «دووربینا – رؤیة – رۆی» کانی تەجسید کرد لە «وێنە ڕەشەکانی» دا ، و دوودڵی و پەشۆکاوی لە هەڵویستی مرۆڤ خۆی دەرخست : –

ئایا عەقلی تاکە مرۆڤ توانای هەیە بەرهەڵستی هێزی قەزاو قەدەر بکا .

کالفینزم (Calvinism) بڕوای وایە کە قەزاو قەدەری مرۆڤ پێشووتر نەخشەی کێشراوەو مرۆڤ دەسەلأتی نی یە لە داوی قەزاو قەدەر خۆی رزگاربکا ، کەچی گۆیا لەم بیروڕا ئایینیە یاخیبوو . بێ گومان گۆیا لەم هەڵویستانەیدا دڵی خۆی نەرمدەکردەوەو کلپەی ئاگری تەنگوچەلەمەی روحی خۆی دەکوژاندەوە ، بۆیێ توندو تیژی دڕندەیی و معاناتو ئازارو ئەشکەنجەو نەخۆشی ، هەموو وەسیلەیەك بوون بۆ رزگارکردنی سۆزی کلپە داری توندو تیژی دەروونی .

تەنیایی و نیگارکێشانو تەعبیرکردن لە «دووربینا – الرؤیة» ی ناوەوە – الباطن – ئەمانە بوونە بابەتی ئەو جیهانەی کە بە بۆیەو هێڵو فلچەوە خولقاندی . . تابلۆکانی ئازارو ئەشکەنجەی مرۆڤەو بەربەرەکانی و شۆڕشگێری و ئازار دەرئەبڕن ، هەروا سەروسیماو هیواو ئاواتی چاخەکەی بە روونی تیا دەرئەخات ، گۆیا بە بەهرەو توانایی و لێهاتوویی خۆیەوە شارەزایی لە هەموو کەلەپووری «عەقلی و ناعەقلی» چاخەکەی و پێشووتری پەیداکرد بۆ ئەوەی ببێت بە وەسیلەیەك بۆ دەربڕینی ناوەوەی مرۆڤ ، بۆیێ گۆیا وەك ڤولتیرو روسوو سادو مارکسو فروید بلیمەتێکی مەزنی چاخی خۆی بووەو کارێکی تەواوی لە سەدەی بیستەما کردووە ، ئەو سەدە پڕ ترسو سامو زانستو تەکنولوجیاو هێزی ئاژاوەیی و هێزی شەیتانی و تاریکی و هێزی بۆمبای زەری و نیوترونی . .

وا بزانم ئەم پێشەکیە فەلسەفیە کورتە ئەوەی بۆ دەرخستین کە «گۆیا» نیگارکێشەکی ئاسایی نییە ، بەڵکو ژیانو بەرهەمی کارێکی زۆریان بەسەر جیهانی ئێستاماندا هەیە ، بۆیێ بایەخێکی زۆری پێ ئەدرێ . «ئەندرێ مالرۆ» ی نووسەرو فەیلەسووفی بەرزی فەرەنسا ، چەندەها لاپەرەی بۆ دەرخستنی بیروڕاو هەڵویستەکانی گۆیاو کارتێکردنەکانی سەدەی بیستەمو تەنگوچەلەمەی روحی مرۆڤی ئەورووپا تەرخانکردووە .

فرانسیسکو دی گۆیا لە ساڵی ١٧٤٦ لە شاری سارآگوتا لەدایكبووە . باوکی جووتیارەکی هەژارو ڕەنجبەرێکی دەستکورتە بوو ، بەلأم بە سەلیقە توانای هەبوو نیگاری ڕێکوپێك بکێشێ ، کە بینی کورەکەی توانای نیگارکێشانی تیا هەیە ، یەکسەر ناردی بۆ لای هونەرمەندێك بۆ ئەوەی بەهرەی گەشتر بێ . گۆیا بۆ خوێندنو فراوانکردنی بەهرەی بۆ شاری سەرکیشا چووەو پاش «٦» ساڵ بۆ ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی مەدرید چوو ، گەشتێکی هونەریی لە رۆما – ئیتالیا – کرد . . . وبەوردی تەماشای شاکارە نەمرەکانی هونەری ئیتالیای کرد ، و لەپاشانا بوو بە عەمیدی کۆلیجی هونەرە جوانەکانی مەدرید . «گۆیا» لە ژیانی دڵی خۆی بە هیواو خۆشەویستی جوانی سروشتو خاوێنی پەیوەندی مرۆڤایەتی پڕکردبوو ، هەرچەند لە ژیانیا زۆر هەژاری و دەربەدەری چەشت ، بەلأم هیوای بە میللەتی ئیسپانیاو خەباتی قەت کزنەبووە ، بۆیێ گۆیا وەك میللەتێکی پاڵەوانو ئازاو دلێر تەماشای میللەتی ئیسپانیای دەکرد لە خەباتیدا دژی هێزی ناپلیۆنو داگیرکەرە فەرەنسییەکان .

گۆیا خۆی لە وەزیرو گەورەپیاوانی زەمانی خۆی نزیك کردەوە ، بۆ ئەوەی دەنگی دلێری میللەت بە حکومەت بگەیەنێت ، ئەم برادەرانەی لە ئاسانکردنی باری گوزەرانی زۆر یارمەتیان دا بەلأم ئاواتەکانی بۆ گەشەکردنو پێشکەوتن بەدی نەهاتن ، بۆیێ هێزە ناوەوەکانی تووندو تێژ – سادیزم – بوەوەو

هیواکان ڕمانو زیاتر پەشۆکاوی‌و نیگەرانی‌و تفت‌و تاڵی دایگرت . . تا دوا هەناسەی ژیانی تەنیا سەبووری بە فلچەو بۆیەو هێڵەکانی دەهات ، وە لە بەر ئەوەی گۆیا پەیوەندی قووڵی لەگەڵ میللەت‌و گەورە پیاوانی چاخەکەی هەبوو ، بۆیێ کرا بە نیگارکێشی تەلاری مەلیکی ئیسپانیا ، لێرە گۆیا دەستی بە ڕەسم‌کردنی وێنەی خزم‌و کەسانی مەلیك چالزی چوارەم کرد .

بەلاّم گۆیا ئوسلوبەکی تیژکردن‌و سوخریەتی بەکارهێنا بۆ دەرخستنی چینە ئوروستوکراتی‌یەکان . . . تەنیا ئافرەتێك نەبێ «دۆق ئەلبا» کە گۆیا زۆر خۆشی دەویست‌و بە شێوەیەکی جوان وێنەی کێشا . . . بەلاّم ئەم ئافرەتە زوو مردو لە تاوا گۆیاش بە تەنیایی‌و خەمباری مایەوە . .

گۆیا ، بە پەرۆشەوە ، حەزی دەکرد میللەتی ئیسپانیا پێشکەوێ ، و بە بەختەوەری‌و کامەرانی بژی ، بەلاّم ئەم میللەتە لە بارەکی هەژاری‌و دوواکەوتوویی دا دەژیاو ئەفسانەو خوورەوشتی پڕوپوچی نالەبار بوو بوە تەگەرە لە بەردەم هێزی پێشکەوتنا . هەروا توندو تیژی‌و خوێن ڕشتن لە فەرەنسای شۆرشگێرا میللەتی ئیسپانیای ترساند ، بۆیێ هیزاکانی گۆیای دووچاری شکست‌بوونەوە کردبوو . هێزی توندو تیژی دەروونیان زیاتر هان‌دەدا تیژکردن لە ڕەفتاری هەموو کەسێك کە «ناوەوەو دەرەوە – الباطن والظاهر»ی یەك نەبوون ، ولەم بوارەدا گۆیا هونەرمەندێکی درو قاسی‌و دڵڕەق بوو ، هێزی تاریکی‌و شەیتانی و سادی پاڵی‌پێوەدەنا بۆ تەعبیرکردنی توندو تیژ تا رزگاربوون لەم هێزە ڕەش‌و تاریکانە .

هەرچەندە گۆیا زۆر جار لە ژیانا تەنیا بوو ، بەلاّم بەشداری لە جموجوڵی گشت میللەتی ئیسپانیای سیاسی‌و کۆمەلاّیەتی دەکرد ، لە ساڵی ١٨٠٨ لە شەری پارێزانی‌و بەرگری‌کردن لە وولاّت‌و سەربەخۆیی دژی ناپلیۆن‌و هێزەکانی دەورێکی مەزنی هەبوو . چەندەها جار چووە شەرو بە دووربینەك تەماشای گۆرەپانی شەری دەکردو نیگاری دەکێشا . وێنەی جەنگە پڕ ترس‌و سام‌و کارەسات‌و برسێتی‌و نوشوستی‌و پەشۆکاوی دەروون‌و هەتیوبوونی مندال‌و جگەرسوتانی دایك‌و باوکانی تیا ئەکێشا . . بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا گۆیا ئومێدی وابوو کە جەنگ تەواو بوو میللەتی ئیسپانیا ڕزگاربێ لە چنگ مەلیکی زۆردارو دەوڵەتێکی دیموکراتی میللی پێك‌بێت . . بەلاّم ئوتوکراتی مەلیکی کۆنەپەرست دامەزراو زامی گۆیا قوولتر بووە ، چونکە بورجوازیەتی ئیسپانیا لاواز بوو هێزی کرێکاران کزو نزم بوو ، بۆیێ هێزی دەرەبەگایەتی‌و ئوروستوکراتیەت بەسەر ئیسپانیا زاڵ‌بوو .

خەم‌و خەفەتی گۆیا هێندە زۆر بوون بۆیێ هەمیشە ماندوو دیار بوو ، بەتایبەتی پاش مردنی ژنی‌و منالەکانی کە ئەوسا لە تەمەنی ٤٥ ساڵی دابوو ، ئەمرو مردنی کورە خۆشەویستەکەی کارێکی ئێجگار سەختی خستە سەرشان‌و باری . . گۆیا وێنەی «چوارشانە – عملاق»ەکی کێشا کە چۆن کورە نازدارەکەی دەخوا . . ئەمەیە کابوسی ژیانی تفت‌و تاڵی . . . هیواکانی گشتیان ڕمان ، بۆیێ پەنای بردە خانووەکی تەسك‌و تاریك‌و شڕ لە دەرەوەی «مەدرید» ی پایتەخت‌و دەستی کرد بە نیگارکێشانی زنجیرەیەك لە «نیگارە ڕەشەکانی – الرسوم السوداء» کە بەرزترین ئاوات‌و ئومێدی جەماوەری دواکەوتوو دەرئەخەن . بەلاّم دیسان گۆیا توانای نەبوو دوورەپەرێز بوەستێ لە ژیانی گشتی میللەت ، بۆیێ ناچار لە ساڵی ١٨٢٤ دا چوو بۆ مەنفاخانە لە شاری «بۆردو» ی فەرەنسا .

گۆیا لە مەنفاخانەی‌دا وازی نەهێنا لە فلچەو بۆیەو هێڵ‌و تابلۆ . . چونکە ئەمانە تەنیا سەبووری‌یان ئەدا بە دڵی‌و یارمەتی‌یان ئەدا ئارام بگرێ لە ژیانی پڕ تفت‌و تاڵی‌و بێ‌هیوایی‌دا . . . بەلاّم مەنفاخانەش زۆر جار وەرسی‌دەکرد ، بۆیێ ڕای‌دەکرد بۆ پاریس‌و مەدریدو شارەکانی تر ، بەلاّم بە دڵەکی تاریك بۆ بۆردو دەگەڕایەوەو بەردەوام دەبوو لە ڕەسم‌کردن ، بە خێرایی وەك بڵێ مردن ڕاوەدووی ئەنا کە بە زووترین کات ئارەزووی خۆی بڕێژێ لەنێو هێڵ‌و بۆیەی تابلۆکانی‌دا . ئەم ژینە پڕ کارەسات‌و ئەشکەنجە بەردەوام بوو تا ساڵی ١٨٢٨ ، پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکا گشت تابلۆکانی ڕەوانەی کۆلیجی هونەرە جوانەکانی مەدرید کردبوو .

ئەم ژیانە سیاسی‌و کۆمەلاّیەتی‌یەی پڕ لە بێ‌هیوایی‌و نائومێدی‌و تەنگوچەلەمەی سایکۆلۆجی بووبوو ، و وەرس‌بوون لە خەباتی دژی کۆسپ‌و تەگەرەکانی سیاسی‌و کۆمەلاّیەتی‌و بەجی نەهێنانی ئاواتە مەزنەکانی لە ژیانێکی دیموکراتی‌و دادپەروەری کۆمەلاّیەتی‌و لەژێر کارتێکردنی فیکری فەرەنسی «رۆسۆ ، ڤۆلتێر ، مۆنتسیکۆ ، ساد ، دیدرۆ . . .» بوە هۆی توندو تیژی هەڵویستەکانی سادیزمی شەیتانی تاریك ، هەروەها ڕیانی خەون‌و

ـەتی نە شۆڕشەکی توندو تیژوەك شۆڕشی ـی تەموزی ١٧٨٩ی فەرەنسا ، وباری ـەو کەوتووبی میللەتی ئیسپانیاو ـەوبووبیو هەلپەرستی هێزە ـەسەڵاتدارەکانو باری قورسی جەنگو ـەگیرکردنی وولات لە لایەن هێزەکانی ـیپۆنەوە ، و ئەنجامەکانی شەڕو برسێتیو ـردنی ژنیو منالەکانی . . . و نەخۆشی خۆی ، ئەمانە گشت بوونە کەرەستەی جوزایەکی ئاژاوەیی – فەوضوي – و ـەرەللابوونو سەربەستبوون لە جوزاکانی ئایینو دەربڕینی هێزی ڕەشیو ـاریکی شەیتان .

لە ڕاستیدا ، نیگار ، هونەرەکی ـزتیو فەردیىە ، بەلام تەعبیر لە جیهانی دەرەوە دەکا . . نیگار بریتیىە لە . . شتەکان . . ڕووەکان . . پەیوەندی خەڵك . . دارو درەختو گیاندەرو سروشتو خانوو ، کە بە ڕەنگو هێلّ وبۆیەو فلچە زاتیەتی هونەرمەند تێکەلّ بە ژیانی کۆمەلایەتی دەکا ، نیگارکێشان بەدی‌نایەت بەبیّ جیهانی دەرەوە ، بوّییّ ژیانی کۆمەلایەتی سەرچاوەیەتی ، بەلام هونەرمەندی مەزن خاوەن دووربینای «رؤیا» ڕاستگۆیی ناتوانی بیّلایەن – محاید – بیّ ، بەلکو جیهانی دەرەوە دەبێتە وەسیلەیەك بۆ دەرخستنی سۆزو هەستو نەستو هەلّویستو بیروڕای زاتی خۆی . . . ئاواتو هیوا بەرزەکانی گۆیا لە وێنەکانی «خەلّکەکانی کابریکوس»و «کارەساتی جەنگ» و «نیگارە ڕەشەکان» دا بە جوانترین شێوە نیگارکێشراون ، ئەم نیگارانە پڕن لە ڕەمزو هێماو هەیەجانو دلّهەلّچوونو تووندو تیژی دەروونەکی خەستی ئاژاوەیی سادیی هونەرمەندێکی کارامە . گۆیا دەزانیّ چۆن ترسو لەرزی فەرەنسیىە داگیرکەرەکان دەربخا کاتیّ کە شۆڕشگێرەکانی ئیسپانیا بە تفەنگ دەکوژن . هەروا گۆیا دەزانیّ دووالیزم – ازدواجية – ی هێزەکانی خاوەن دەسەلاتو ئوروستوکراتیەت دەربخا . گۆیا هونەرمەندێکی واقیعی بوو ، بەلام نەك واقیعیىەکی ڕووتو وشك ، بەلکو واقیعیىەکی تەعبیریو خاوەن دووربینایەکی ڕوونو ڕۆمانتیکی ، هەروەها تۆزێك توخمی سوریالیزمی بەدی‌ئەکریّ لە تابلۆکانیدا . ژیانی میللەتو مناسبەو جەژنەکانی ، و ئاهەنگ و سروشتو خووڕەوشتی خەلّكو چەشتی ژیانیان ئەبینرێن لە تابلۆکانیدا . لە وێنەیەکدا چەند منالّی هەژار بە جلو بەرگی دڕاو لە بەردەم دارێکدا وەستاون ، یەکێك لەسەر پشتی یەکی بردا وەستاوە بۆ ئەوەی بەری دارەکە بخەنە خوارەوە ، ئەمەیە ئاواتی خۆشی هەژاران . ژنێکی هەژاری شڕ جلوبەرگی خۆی دەفرۆشیّ ، ئەمەیە کەساسیی میللەت ، ژنەکی تر «شەنگەبێر» مانگایەك دەدۆشیّ ، دیمەنی جوانو سەیری زۆرانبازیو ئاهەنگو قەلەبالغی بە جوانترین شێوە نیگارکێشراون ، وێنە هەیە کە لە «١٠٠» کەسی زیاتر تیا ڕەسمکراون ، ئەمە بەهرەو تواناو ئارامەکی زۆری دەویّ . . بەلام گۆیای تووندو تیژو کارامە دەزانیّ لە چ بەهرەیەکەوە واقیع دەربخا ، هەندیّ لە وێنەکانی شێوەی موبالەغەیان تیا بەدی‌دەکریّ ، بەلام ئەمەش تەعبیرەکی سایکۆلۆجیىە لە جیهانی ناوەوەی گۆیاو خەونو ئارەزووەکانی کە سنووریان نەبوو .

چەندەها پیاوی بەهێزو ماسولکە ئەستوور ڕووبەڕووی تەگەرەو بەرهەلّست دەبنو سەردەکەون . ئەمە هێزی دوژمنکارانەی دەروونی گۆیا دەرئەخا . هەروا وێنەی چەندەها بالّداری گۆشتخۆر وەك قەلە ڕەشو هەلّۆو بازی کێشاوە وەك ڕەمزێك بۆ هێزو ئارەزووەکانی سایکۆلوجی خۆی کە هەمیشە وەك بورکان توندو تیژ بوون .

لەگەلّ ئەمەشدا هێزی خەونو خەیالّو ڕۆمانتیکیو هێمنی شوێنی خۆیان هەیە لە دلّی مرۆڤ پەروەری گۆیادا . لە چەندەها تابلۆی ڕەنگیندا وێنەی چەند کچی جوانو قەشەنگی کێشاوە ، بە ئوسلوبێك کە هێزی ئیرۆسیزمی (irosism)الحبية الجنسية» هونەرمەند دەرئەخەن . لەراستیدا تابلۆو نیگارەکانی ئەم کارامەیە بە ووشەو رستە وەسفناکرێن ، بەلکو پێویستە مرۆڤ بە وردی تەماشایان بکاو بەراورد بکاو تیّفیکریّ . ئینجا بۆی دەرئەکەویّ کە گۆیا هونەرمەندێکی ئێجگار مەزنە ، کە ئوسلوبی ڕۆمانتیکیو واقیعیو سوریالیزمیو تەعبیریو انطباعي تێکەلّئەکات بۆ دەرخستنی پێچو پەنای شاردراوەی گشت سووچەکانی ژیان و میللەت . کە جیهانی تفتو تالی واقیع ئەبووە سەرچاوەی ئێشو ئازارو مەینەتی سایکۆلۆجی گۆیا ، ئەویش بەرەو ژوورەکی تاریك دەبەزیو چەکی خۆی «بۆیەو ڕەنگو فلچە»ی هەلّدەگرت بۆ ئەوەی لەگەلّ ژیانی تفتو تالّو نالەبار بجەنگیّ ، بۆیّ جیهانی گۆیا جیهانێکی خەستو چڕو پڕ لە ئازارو خەونو تاریکیىە .

گۆیا هونەرمەندێکی «بینەر – شاهد» ە کە تەعبیر لە چاخی خۆی دەکا

# مریام ماکیبا

# دەنگی ئەفریقیا !

نەوزاد احمد اسود
کردوویەتی بەکوردی

هونەرمەندی زنجی ی ئەفریقیا «مریام ماکیبا» هونەری وەکو چەکێك بەکارهێناو دژی رەگەزپەرستی‌و ئیمپریالیزم وەستا .

ئەم هونەرمەندە شۆڕشگێڕە ژیانی هونەری‌ی بە رۆژنامەگەرێتی دەست‌پی‌کرد . ناوبەناو لە گۆڤاری «مۆسیقای ئەفریقی» داکاری دەکرد . پاشان بەرەو تەمسیل‌کردن چوو ، لە فلیمی «بگەڕێوە بۆ ئەفریقیا» بەشداری کرد کە دەرهێنەری ناسراو (لیونیل رۆگوزون) دەری هێنا ، بیری ئەم فلیمە دژ بە بیروباوەڕی جیاوازی رەگەزپەرستی‌یە ، ئەم فلیمە لە ڤێستیڤاڵی سینەمایی – ڤینیسیا – ساڵی ١٩٥٩ خەلاتی ڕێزلێنانی پی‌درا ، «هاری بیلا فۆنت» ی ئەکتەرو هاوڕێی مریام کە لەو فلیمەدا بەشداری لەگەڵدا کردووە دەڵێ ، مریام بەهرەیەکی شۆڕشگێڕی وای تێدا هەیە تاکو ئێستا لەم دەساڵەی ڕابوردوودا لە هیچ ئەکتەرێکی دیکەمان نەبینیوە .

پاش ماوەیەکی کەم گۆرانی‌ی «باتا . . باتا»ی ووت ، ئەم گۆرانی‌یە دەرگای نەمری‌ی بۆکردەوەو لەهەموو دنیادا دەنگی دایەوە ، ئەم ناوبانگەش بۆی رەخساند کە بە هەموو کیشوەرەکاندا بگەڕێ‌و خەڵکێکی زۆرتر لە ڕێگای گۆرانی‌یە بەسۆزەکانی ناسی‌یان کە بەردەوام گۆرانی بۆ شۆڕش‌و خەبات دەڵێ .

ئەوەی شایانی باسە مریام ماکیبا بە «١٢» زمانی جیهانی گۆرانی دەڵێ‌و بەیەکێك لە ناودارترین گۆرانی بێژی ئەم چەرخەمان دادەنرێت . . هەر لە ساڵی (١٩٦٨)ەوە ئەو لە «گینیا» دادەنیشی‌و خەریکی کارە هونەری‌یەکانی خۆیەتی ، ئەمەو ژمارەیەکی زۆر لە دەوڵەتە پێشکەوتنخوازەکان بۆ هەڵوێستی خەباتگێڕانەی ڕێزیان لێ‌ناوەو ئەویش بەردەوام هەوڵ دەداو دژ بە جیاوازی رەگەزپەرستی دەوەستی‌و بەرگری لە مافی رەوای هاولاتی‌یە قولەرەشەکان دەکات ، دوازدە ساڵیش دەبێ چوونە ولاتی خۆی «ئەفریقیای خواروو»ی لێ قەدەغەکراوە .

مریام بە دەنگێکی هێمن‌و قورگێکی بەهێزەوە دەناسرێ . .

ئەو دەنگەی لە ناخێکی دڵسۆزانەوە هەڵ‌دەقوڵێ‌و وەکو بانگەوازێك وایە لە دوورەوەبێ‌و داوا لە ئەفریقیایی‌یەکان بکا پتر شۆڕش بەرپابکەن‌و نەخشەی خەبات بکێشن لە پێناوی سەرکەوتن بەسەر رەگەزی «سپی پێستەکان» کە دەسەلاتیان بەسەر گەورەترین بەشی کیشوەری رەشدا گرتووە .

گەلێ ولات گەراوەو چەوساندنەوەی ئەفریقی‌یەکانی بۆ هەموو دنیا ئاشکرا کردووەو موعاناتی گەلەکەی‌و ئازاری خوشك‌و برا رەشەکانی هەڵ‌دەگری‌و بە وشەی زەق‌و ئاوازی جوان گوزارشت لە هەست‌و نەستیان دەکات .

لەم دوایی‌یەدا لە پاریس ئاهەنگێکی تایبەتی‌یان بۆ ئەم کچە هونەرمەندە ئازایە کردەوەو گەلێ لە پەیامنێری رۆژنامەکانی فەرەنسا دیدەنی‌یان کردو مریامیش قسەی بۆ دەکردن‌و دەیووت :

– هۆی سەردانی ئەم جارەم بۆگێڕانی چەند ئاهەنگێکە بۆ ئەوەی بە جەماوەرە کۆچ کردووەکانی ئەفریقیا بگەم ، هەرواش‌بوو ، بینیم بەسەدان کرێکاری رەش ، لەگەڵ ئەوەی



# مریام ماکیبا !

بەریان ناخۆش و گیروگرفتیان دەهاتەرێ ، بۆ بینینی ئاهەنگەکە دەهاتن ، هەروا منیش شانازی بە جەماوەری خۆم دەکەم و خۆشم دەوێن لەبەرئەوەی بەبراو هاوڕێی دڵسۆزیان ئەزانم .

– هەروەها ووتی من بەهیچ جۆرێك وازم لە سینەما نەهێناوەو بەڵکو خۆشم دەوێ ، بەڵام لەبەر چەند هۆیەك لەکاتی ئێستادا وازم لە نواندن هێناوە . .

– ماکیبا دەربارەی مۆسیقای ئەفریقیا ڕای خۆی دەربڕی و ووتی من زۆر گەشبینم بەرامبەر بە مۆسیقای ئەفریقی چونکە بزووتنەوەی مۆسیقا لە ئەفریقیادا لە پێشکەوتن و بەرەوپێش چووندایەو لەلایەن زۆر لە گەنجەکانەوە هەوڵی بۆ دەدرێ و نیازی پاککردنەوەی ڕەسەنی مۆسیقاکەمانن . هەروەها ووتی هیوای ئەوە دەخوازم کە مۆسیقای ئەفریقی لە کارتێکردنی هەندێ ئاوازی ئەوروپی ڕزگاری بێت کە ئەمە لێدانێکی «ڕۆشنبیری ئیمپریالیزم»ە لە مۆسیقای ئەفریقیای دەدات .

بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٥٢٣ز–دا لە نامەکانی دەربارەی ـڤوادا ناوی «کەمانچە» هاتووە وە ئیتالیا بە وولاّتی پەیدابوونی کەمانچە دائەنرێ ، لە ڕاستیشدا کەمانچە لە لە پەرەپێدانی چەند ئامێرێکی ژێداری خاوەن کەوانەوە دروست‌بووە ، کە پێش ئەم هەبووە «ڤیولا دابراچۆ» واتە «ڤیۆلای شان» و «ڤیۆلا دگامیا» واتە «ڤیۆلای لاق» «چلو» . ڤیول یا ڤیولا یانی ژێ . ئەم ـوەش لەسەدەی چواردەهەمی زایینی‌دا پەیدابووە — لە ڤیۆلاشەوە دوو جۆر ئامێری ژێداری کەوانەدار دروست‌بوون «ڤیۆلای شانو ڤیۆلای لاق» لە کۆتایی سەدەی شانزدەهەم‌دا ئامێرێکی بچووك لە ڤیۆلاوە هاتەکایەوە بە ناوی «ڤیۆلۆن» یا «ڤیۆلۆنۆ» کە ئێستا ئێمە پی‌ی دەڵێن کەمانچە ، وە بە ئینگلیزی بەم ئامێرەش «ڤایۆلین» Violin وە بە فەرەنسی «ڤیۆلۆن» Violon بە ئیتالی «ڤیۆلینۆ» Violino وە بە ئەڵمانی «ڤیۆلینە» Violine وعەرەب «کەمان» و فارسی «ڤیاڵۆن» و کوردو تورك «کەمانچە» ی پی‌ئەڵێن . کەمان بە فارسی یان کەوان پاشگری «چە» لە زمانی فارسی‌دا بە واتای بچووك کردنەوەی دێ «واتا کەوانی بچوك» .

## کەمانچەو پێکهاتنی

کەمانچە ئامێرێکی ژێدارەو بە کەوان ئەژەنرێ وە پارچە سەرەکیەکانی لە سنوق دەنگ «ئەوەی دەنگی تیا ئەلەرێتەوە» و قۆڵێك کە بە نەخشێکی پێچاوپێچ کۆتایی دێ لەگەڵ چوار ژێ کە لەسەر ڕووی سنوق دەنگەکەوە بەهۆی پردێکەوە بەرزئەبێتەوەو بە شانەیەك لە بنەوە کۆتایی دێ لەگەڵ کەوانێکی لاکێشدا کە درێژێکەی «٧٥ سانتی‌مترەو قورسایی لەنێوان «٥٠ تا ٦٠» گرام دایە ، پێك‌هاتووە . ئەڵێن کەوان ولاّتانی ڕۆژئاوا لە ولاّتانی ڕۆژهەلاّتەوە وەریان‌گرتووە وە تا ماوەیەکی زۆریش هەر بە چەماوەیی بەکارئەهات تا لە ساڵی ١٧٨٠ ز–دا «فرانسۆ تۆرت» کەوانی لاکێشی بە شێوەو درێژی ئێستای بەدەست‌هێنا ، لە سەرڕووی سنوق دەنگەکە دوو کونی چون یەكو تەریب‌و پشتاوپشتی یەك هەن لە شێوەی پیتی (S) لاتینی‌دا . ئەشڵێن گوایە ئەم کونانە لەسەر ڕووی عود لە سەردەمی عەباسی‌یەکان‌دا هەبووە «سەدەی نۆیەمی زایینی» .

## گرنگی ئامێری کەمانچە

کەمانچە بچوکترین ئەو ئامێرەیە کە ناوی ئەمیان لی‌نراوەو لەناو گشت ئامێرەکانی تردا ئەم لە پێش‌ترەو لای سەرەکی ئاوازەکە «میلۆدی» لە «ئۆرکسترا» دا ئەم لی‌ی ئەدا کە هەمیشە دوو کۆمەڵی تیا هەیە «کەمانچەی یەکەم‌و کەمانچەی دووەم‌و کەمانچەو ئامێرەکانی هاوپۆلی نزیکەی نیوەی سەرجەمی ئامێرەکانی «ئۆرکسترا» ئەبن . وە کەمانچە توانایەکی بێ هاوتای لە دەربڕینی هەستی مۆسیقادا هەیە وەك :

| | |
|---|---|
| **فلیسکاندن «گلیساندۆ»** | Glissando |
| توندی «فۆرتی» | Forte |
| نزمی «پیانۆ» | Piano |
| پیزیکاتۆ | Pizzicato |
| پچر پچر «ستاکاتۆ» | Staccato |
| تریمۆلۆ | Tremolo |

وە کەمانچە هەرگیز نەوەستاوە لەوەی کە ئامێرێکی ژەنینی تاك بێت ، کاری کردۆتە سەر پەرەپێدانو گەشەسەندنی شێوەو باباتە مۆسیقی یەکانی وەك :

| | |
|---|---|
| کۆنشیرتۆی گەورە | Concerto |
| | Grosso |
| سۆناتا | |

# شانۆی بێهوودەیی



معتصم ساڵەیی





دوو پەیاگەندەکەو بۆزۆو لوکی لە ((چاوەڕوانی ی گۆدۆ))دا

## بەشی یەکەم

ئەگەربێتو باسی هەر ڕێبازو قوتابخانەیەکی ئەدەبیو هونەری بکەینو لەبارەیانەوە بدوێین ، دەبێت لەو بنجو بناوانەو پاڵپشتانە بکۆڵینەوە کە بوونەتە هۆی سەرهەڵدانو بڵاوبوونەوەیان بەهیچ کلۆجێك نابێت ئەو سەردەمو زرووفو بارودۆخی ئابووری ئەو ناوچەیەی کەسەریان تێداهەڵداوە پشت گوێ بخرێن .

باسکردنو لێکۆڵینەوەی هەر دیاردەو

بیرێکی تایبەتی بە شێوەیەکی ڕووت و
دابڕاو لە واقیعەکەی مانای کەم و کووری و
نەزۆکی و سەرنەکەوتووی باسەکە
دەگەیەنێت . دوان و باسکردن و
لێکۆڵینەوەی ڕێبازێکی فیکری و هونەری و
ئەدەبی وەك ڕێبازی بێهوودەیی
(عەبەثی) ؛ دەبێت ئەو هەموو بارو
زرووف و دیاردانە دەستنیشان بکەین
کەبوونەتە مایەی پەیدابوونی ئەم قوتابخانەیە
ڕێبازی بێهوودەیی‌ی ناماقوڵ لەدوای
پەنجاکانی ئەم سەدەیەی ئێمەدا
هاتەکایەوە ، بۆماوەیەك خۆی نواندو توانی
لە هەندێ وولاتدا بەتایبەتی وولاتە
سەرمایەدارە ڕۆژئاواییەکاندا ، کۆمەڵێ
نووسەرو ڕۆشنبیر لە خۆی کۆبکاتەوە .
هەروەها ئەم ڕێبازە بەداخەوە توانی
هەندێ لە نووسەران و ڕۆشنبیرانی جیهانی
سێهەمیش بگرێتە خۆی و لەگەڵ لێشاوی
لێخن و مەرگەمووشی‌ی خۆیدا ڕایانماڵێت و
لە واقیعە دڵتەزێنەکەی خۆیان دووریان
بخاتەوەو تووشی ئیفلیجی‌ی فیکریان
بکات .

ئەم ڕێبازە وەك زۆربەی ڕێبازو
قوتابخانە ئەدەبی و هونەرییەکانی دیکەی
کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەدەی بیستەم
لە شاری ( پاریس) ی پایتەختی وولاتی
فەرەنسە سەری هەڵدا .

( ناماقوڵ وەرگێڕانی زاراوەی (Absurd) ە
بەپیتی گەورە ، لەدۆخی ناودا ، ئەمەیش
زاراوەیەکی درامایی شانۆیی نۆڤیلییەو پشت
بە فەلسەفەی عەبەث دەبەستێت ، یاخود
عەبەثی (Absurdity) . وەکاتێك پیتی
یەکەم بچووك بێت ووشەکە بۆ سیفەتی
(هیچ و پووچ) ، ناماقووڵ) دەگەڕێتەوەو
ناوەکەیش دەبێتە (پڕو پووچی ،
دژبەعەقڵ) . لەبەرئەوەی ووشەی یەکەم ،
بەئینگلیزی و فەرەنسی ، دەستنیشانی ئەو
ئەدەبە دەکات کە پاڵپشتیەتی ،
واش پێویستە بە دوو بار وەربگێڕێت :
(ناماقوڵ) ، لەکاتی دەستنیشان کردنی
ئەدەب ، وە(عەبەثی) لەکاتی دەستنیشان
کردنی فەلسەفەدا)[1] ووشەی (عبث) ی
عەرەبیش پڕبەپێست و بەرامبەر بەووشە
فەرەنسییەکە نییە . هەروەها لەکوردیش‌دا
ناتوانین وو شەیەك دابنێین کە بە تەواوەتی
بەرامبەر ووشە فەرەنسییەکە بێت ؛ بەڵام
ووشەی(بێهوودە) لەلایەن هەندێ
نووسەرەوە بەکاردەهێندرێت ، یاخود
ووشەی (پڕوپووچ ، هیچ و پووچ) دەتوانین
بەکاربهێنین . . هەروەها ئەم ڕێبازە هەندێ
جار – بەزاراوەیەکی جیهانی –
بەرهەمەکانی بەشانۆی پێشڕەو (الطليعة)
ناودەبرێت . . ! کەگوایە وەك پێشڕەوێك
وایە بۆگۆڕین و تازەکردنەوەی شێوەو
ناوەرۆکی شانۆو دوابەدوایشیەوە چەند
تاقیکردنەوەیەکی کەش دێن هەر بۆ
مەبەستی ئەوتازەکردنەوەیە . . .

لەدوای دووەمین شەڕی جیهانی و
دوابەدوای ساڵەکانی پەنجا چەند
نووسەرێکی شانۆیی بە زمانی فەرەنسی
دەستیان کرد بەنووسینی شانۆیی بە
بێهوودەییە عەبەسیەکانیان وبوونە
مینبەرێك بۆفەلسەفەی بێهوودەیی‌ی
ناماقوڵ چەند نووسەرێك لەم ڕێبازەدا
ناوبانگیان دەرکرد وەك : سەموئێل
بیکێت و ئۆجین یۆنسکۆو ئارسەر
ئەداموڤ و جان جینێه بەرادەی یەکەم .
بەرادەی دووەمیش ئەو نووسەرە شانۆییانە
دێن کەهەمان جاریان دەدا بۆ هیچ و
پووچی و ناماقوڵی ژیانی مرۆڤ و
دەوروبەری مرۆڤ وەك : جۆرج
شەحادەو جیرۆدۆو ئانۆی و سالاکرۆو
ئۆدیپیرتی . . . .

دوابەدوای جەنگی دووەمی جیهانی ئەم
نووسەرانە لەفەرەنسەو بەزمانی فەرەنسی .
شانۆییەکانی خۆیانیان نووسی ئەوەی
شایانی باسە ئەوەیە ، ڕابەرە
بەناوبانگەکانی ئەم ڕێبازە هەر کەسو بە
زمانی فەرەنسی شانۆییەکانی خۆیانیان
دەنووسی و لە وولاتی فەرەنساشدا دەژیان ؛
بەڵام لە نەژادو ڕەگەزدا فەرەنسی نەبوون .
( سەموئێل بیکیت) ساڵی (١٩٠٦)
لەئیرلەندە لەدایك بووە ، (ئۆجین یۆنسکو)
ساڵی (١٩١٢ لەڕۆمانیا لەدایك بووە ، (
ئارسەر ئەداموڤ) لەساڵی (١٩٠٨) دا لە
خێزانێکی ئەرمەنی لە ڕووسیای قەیسەری
لەدایك بووە ، (جۆرج شەحادە لەساڵی
(١٩١٠) دا لەئەسکەندەرییە لەخێزانێکی
لوبنانی لەدایك بووە . ئەوەی نووسەرانی
عەبەثی لە خۆی کۆدەکاتەوە ئەو بیروباوەڕە
فەلسەفی‌یەیە کە هەموو پێکەوە بانگیان بۆ
هەڵدەدا . یەك ئامانج و یەك بیروباوەڕ
مەبەستی سەرەکی‌ی نووسەرانی شانۆی
ناماقوڵ بوو . ئەوبیرو باوەڕەیش لەوەدا
کۆدەبێتەوە کە ژیانی مرۆڤ و دەورو بەری
مرۆڤ بێهوودەو ناماقووڵە .

نووسەرانی ناماقووڵ لەدەرگایەوە
دەڕەوانە ژیان و جیهانی دەورو بەرکە گوایە
هەموو شت لەنێو بێمانایی و ناماقوڵیەتدا
مەلەدەکات و بەدەوری خۆیدا بەبێ هوودە
لە بازنەیەکی داخراودا دەسووڕێتەوە .
نووسەرانی ئەم ڕێبازە بڕوا بەهیچ شتێك

حگه له بڕوای هیچ‌و پووچی‌و ماقوولی شته‌کان‌و ده‌وروبه‌ر ـه شانۆی ناماقوولدا هه‌موو شتێك ڕه‌نگ وبۆی خۆی بزرکردووه. ـراوه‌و مه‌فهووم‌و بیرباوه‌ڕو ـه‌تێکیش بگرین ده‌بینین به‌بێ ـعی دانراوون‌و ده‌سنیشان ده‌کرێن. ـو باوه‌ڕێکی چه‌سپاو به‌دی ـت. هه‌موو شت ڕه‌نگی بێ‌مانایی‌و ـمی لێ‌نیشتووه.. ته‌نانه‌ت ـش بێهیوا ده‌س له‌ئه‌ژنۆ دانیشتووه‌و ـو مێشك‌و بواری بیرکردنه‌وه‌یش ـو ئیفلیجه، هیچ هیوایه‌کی ـشی لێ‌چاوه‌ڕوان ناکرێت به‌کورتی ـی نووسه‌رانی بێهووده‌یی مرۆڤ‌و ژیانی ـڤ شتێکی نائاساییه‌و دیارده‌یه‌کی ـی نیه، ئه‌وه‌ی بوونی هه‌یه‌و جێی ـمو بڕواپێکردنه؛ ته‌نها مردنه‌و به‌س. ـڤ بێ په‌رواو بێ هووده به ده‌وری ـما له گێژه‌لووکێکدا ده‌سووڕێته‌وه، له ـنێکی تاریکی وه‌هادا که هیچ ـوسکایه‌ك نیه ده‌وروبه‌ری‌و جێی پێی ـووناك بکاته‌وه. مرۆڤ‌و هه‌موو ئه‌و ـه‌ی ده‌وروبه‌ری مرۆڤ هه‌ر ته‌نها بۆنی ـردنیان لێ‌هه‌ڵده‌ستێت. ده‌توانین بڵێین ـم هه‌موو بیروڕایانه‌ی بێهووده‌یی‌یه‌کان ـگه‌ڵ ئه‌و هه‌موو بیروباوه‌ڕه ناعه‌قڵیانه‌ی که له پێش ئه‌م ڕێبازه‌دا سه‌ریان هه‌ڵدا، ـمموو ئاکامی چه‌ند هۆو بارو دۆخێکی ـیه‌تی بوون. به‌تایبه‌تی ڕێبازی ناماقوڵ له ـکامی کاره‌ساته جه‌رگ بڕه‌کانی جه‌نگی ـووه‌می جیهانی هاته‌کایه‌وه. ئه‌وه‌بوو له ـکامی جه‌نگی یه‌که‌می جیهانی ڕێبازی دادایزم دوابه‌دوایشیه‌وه ڕێبازی سوریالیزم

هاتنه‌کایه‌وه، له‌ئاکامی جه‌نگی دووه‌می جیهانیشدا بیروباوه‌ڕی وجودی‌و دوابه‌دوایشیه‌وه بیروباوه‌ڕی عه‌به‌سیه‌ت هاته‌کایه‌وه. ئه‌وه‌ی ئه‌م چوار بیروباوه‌ڕه کۆده‌کاته‌وه؛ ئه‌وه‌یه که هه‌ر چواریان به چاوی گومانه‌وه ده‌ڕوانن عه‌قڵ‌و بیری مرۆڤ‌و نائومێدیش له ژیاندا به‌ردی بناخه‌ی بیروباوه‌ڕیانه. وه هه‌ر چوار ڕێبازه‌که له‌و خاڵه‌یشدا یه‌ك ده‌گرنه‌وه که‌هه‌موو قه‌واره‌و بوون‌و دیارده‌یه‌کی بینراو هیچ‌و پووچ‌و مانابه‌خش نین‌و هیچ پێوانه‌یه‌کیش نیه بۆ هه‌ڵسه‌نگاندنی ئاکارو ئه‌خلاق‌و هه‌ڵس‌و که‌وتی ڕۆژانه‌ی مرۆڤ، به‌تێکڕا هه‌ر چوار ڕێبازه‌که له‌منداڵدانی هه‌ردوو جه‌نگه‌که‌وه له‌دایك بوون.

جگه له‌هۆی جه‌نگ‌و کارکردنی له نووسه‌رانی ئه‌ده‌بی ناماقوڵ، ده‌توانین بڵێین چه‌ند نووسه‌رو ئه‌دیبێك که له پێش ئه‌م ڕێبازه‌شدا به‌رهه‌مه‌کانیان نووسیوه، بوونه‌ته پاڵپشتێك بۆ ئه‌م ده‌سته‌یه‌و کاری ته‌واوی خۆیان کردوه‌ته سه‌ر به‌رهه‌مه‌کانیان. خۆیشیان ئه‌م شته‌یان زۆرجار دووپات کردۆته‌وه که‌سوودیان له‌و به‌رهه‌مانه وه‌رگرتووه.

یه‌کێك له‌ونووسه‌ره شانۆییانه‌ی که‌کاری ته‌واوی کرده سه‌ر نووسه‌رانی ناماقوول، نووسه‌ری شانۆیی سویدی (ئۆگێت ستراندبێرگ) بوو (١٨٤٩ – ١٩١٢) به‌رهه‌مه‌کانی ئه‌م نووسه‌ره ڕه‌نگ‌دانه‌وه‌یه‌کی ته‌واوی به‌سه‌رهات‌و سه‌رگوزشته‌ی تاڵو تفتی‌ژیان خۆی بوو. ئه‌م نووسه‌ره بۆ ماوه‌یه‌کی زۆر به هه‌ژاری‌و ده‌س‌کورتی ژیانی برده‌سه‌رو له خێزانێکی

په‌ره‌وازه‌و ده‌س کورتدا په‌روه‌رده ببوو. ستراندبێرگ هه‌ر له منداڵییه‌وه گیانی یاخی‌بوون له‌هه‌ڵس‌و که‌وت‌و بیروباوه‌ڕیا به‌دی ده‌کرا. له ژیانیدا بۆ به چنگ هێنانی گوزه‌ران گه‌لێ ئیش‌و کاری گرته ئه‌ستۆ، به‌ڵام سه‌رنه‌ده‌که‌وت تاگه‌یشته ئه‌و ڕاده‌یه‌ی که هه‌وڵی خۆکوشتن بدات. ستراندبێرگ ته‌نانه‌ت له ژن هێنانیشیدا سه‌رنه‌که‌وتووه که‌وا سێ جار ژنی هێناوه‌و له هه‌ر سێکیدا به‌ختیار نه‌بووه. له‌به‌ر ئه‌م هۆیانه‌یش بوو که‌زۆر زوو په‌نای ده‌برده به‌ر ژیانی بۆهیمی سه‌ره‌ڕۆیی. نووسه‌ر هه‌موو ژیانی به دوودڵی‌و ڕاڕایی برده‌سه‌ر، گومانی له‌نزیك ترین که‌س له هاوه‌ڵه‌کانی ده‌کرد.

پاڵه‌وانی شانۆیه‌کانی بریتین وه‌ك نووسه‌ر خۆی بۆهیمی‌و سه‌رلێشێواوو ڕاڕایین‌و هه‌رده‌م به‌بێ هووده‌یی ژیانیان ده‌به‌نه سه‌ر، وه‌ك له شانۆی (له‌ڕێگا) بۆ (دیمه‌شق) – ڕه‌نگ ده‌داته‌وه‌و به ڕوونی خۆی ده‌نوێنێت. ژیانی بێهووده‌یی‌و سه‌رلێشواویی بۆهیمی له پاڵه‌وانی سه‌ره‌کی‌ی ئه‌م شانۆییه‌دا به‌دی ده‌کرێت؛ که‌نووسه‌ر ناوی (نامۆ – الغریب) لێناوه. له‌شانۆگه‌ری‌ی (ستراندبێرگ) **دا کات‌و شوێن بزرن، ولەسەر واقیعێکی بێ‌مانا ئەندێشە نموونەی تازەبابەت دەچنێ، کەتێکەڵە لەبیرەوەری‌و تاقیکردنەوەو ئەندێشەی سەرکێش‌و هیچ‌و پووچی‌و گەلێك دەس هەڵبەستی بێ‌مانا. کەسەکانیش پارچە پارچەو دژوارو چەند لایەنن، کە دەبن بەهەڵم‌و چڕدەبنەوەو پەرەوازە دەبن‌و کۆدەبنەوە، بەڵام یەك هۆش هەیە کە**

**خۆی بەسەر هەموویاندا دەسەپێنێت ، ئەویش ئاگایی‌ی خەون‌دارە کە خۆیەتی)[٢] . گەربێت و بەراودێکی نێوان ئەپسن و ستراندبێرگ بکەین دەبینین ئەپسن لە نووسینەکانیدا ، خاوەن هەڵوێستێکی تایبەتی بووە ، لەکۆتایی ژیانیشیدا بەرە بەرە بەلای بیرو باوەڕی سۆشیالیستدا دایتاشێوە**

### براندیللووکاریگەری سەرەتا

دەتوانین بەئاسانی کاریگەو (لویچی بیراندێللۆی شانۆیی‌نووسی ئیتالیالي (١٨٦٧ – ١٩٣٦) لە شانۆیی‌نووسانی ناماقووڵ دەسنیشان بکەین ئەم نووسەرە وەك کەسانی شانۆییەکانی خۆی ژیانێکی زۆر سەخت و دژواری بەسەر بردووە . بە دەس کورتی و کەم دەرامەتی ژیانی بەڕێوەدەچوو لەلایەکی کەوە خۆی و ژنەکەی هەردەم بەناخۆشی و بەنارێکی ژیانیان دەبردەسەر تاگەیشتە ئەورادەیەی ژنەکەی بخاتە نەخۆشخانەی مێشکەوە .

دوو بەرهەمی شانۆیی‌ی ئەم نووسەرە بەسەر هەموو بەرهەمەکانی کەیداو زالن ناوبانگیان زۆر دەرکردووە یەکەمیان ( شەش کەس بەدوای دانەرێکدا دەگەڕێن – ساڵی (١٩٢١) لە شاری (ڕۆما) پیشاندرا . دووهەمیشان شانۆیی‌ی (هێنری‌ی چوارەمە کەساڵی (١٩٢٢) هەر لەشاری (ڕۆما) پیشاندرا . پاڵەوانەکانی شانۆییەکانی نووسەر خاوەن هەڵوێست و خاوەن هەڵس و کەوت و خاوەن خۆیان نین ، بەڵکو زۆر بەکزی و لەرزۆکی و نەگونجاوی دەژین و کاتیان دەبەنەسەر . دوور لەواقیع دەژین ، واقیعێکی تەسکی ئەندێشەیی‌ی وەهمی بۆ خۆیان هەڵدەچنن و تیایدا ئارام دەگرن .

لەبەرهەمەکانی نووسەردا (ڕاستەقینەی موتڵەق بوونی نیە مادامەکی هەموو شت لەگۆڕانکاریەکی بەردەوامدایە وەهەم و خۆهەڵخەڵەتاندن لە ڕاستەقینە بەهێزترو چەسپاوترە . ئەو کەسەی لە ئەندێشە لەدایك دەبێت ڕاستگۆ ترو بەهێزترو چەسپاوترە لەهەر ئادەمیزادێك ، چونکە یەکەم ناگۆڕێت و وەك خۆی دەمێنێتەوەو چەسپاوەو زیندووەو هیچ لەناوچوونێکیش نایگرێتەخۆی ، بەڵام دووهەمیان زۆر لەگۆڕاندایە . جیهانی وەهم و چنراو لەجیهانی واقیع و جیهانی هەست پێکراو)[٤] بەتامترو ڕاست گۆ ترە بۆئەوەی تێیدا بژێت .

بیراندێللۆ هەروەك خۆی چۆن لەواقیعەکەی خۆی بێزار بوەو پێی قایل نەبوو ، هەروەها دەیەویست کەسانی شانۆییەکانیش بەواقیعی هەست پێکراوی خۆیان ڕازی نەبن و سەرپێچی‌ی بکەن و لێی یاخی بین بە ڕێگای پەنابردنەبەر وەهم و خەیاڵ و ئەندێشە . دەبینین لەشانۆییەکانیدا ، شانۆییەکی دروستکراو دەخولقێنو پاڵەوانو کەسانی شانۆییەکەی ئەو تەمسیلە دروستکراوە دێنە کایەوەو جیهانێکی وەهمی ئەندێشەیی بۆخۆیان دروست دەکەن و تێیدا دەژین . ئەم هەڵوێستەیش بەرهەڵستیەکی سەلبی دروست دەکات نەك بەرهەڵستیەکی ئیجابی و واقیعی .

### ڕەمزیەکان و کافکا

ئەدەبی ڕەمزی بەو هەموو پێچەڵ پێچ و ئەم و مژییەوەی کە هەیەتی کارێکی تەواوی کردەسەر نووسەرانی ڕێبازی ناماقووڵ . بگرە کارتێکردنی بۆسەر ئەم ڕێبازە نوێیە لە هەموو کارتێکردنەکانی تر کەمتر نەبوو .

بێهوودەییە عەبەسیەکان سوودی تەواویان لە چیرۆکە هیمایە تەم و مژاویەکانی (ئەدگار ئەلان بۆ) ی نووسەری ئەمەریکی و (فرانز کافکا) وەرگرت بەتایبەتی دووهەمیان بەتەواوەتی سێبەری خۆی خستەسەر ئەم دەستەیە . چیرۆکە ڕەمزییەکانی کافکا ناعەقلانین و بەرادەیەکی زۆر لە واقیعی ڕۆژانەی مرۆڤ دووردەکەونەوەو شێوەیەکی تەم و مژاوی بەخۆیانەوە دەگرن و بەواقیعێکی خەوناوییەوە خۆیان دەپێچنەوە . لەچیرۆکەکانی (کافکا) دا کەسانی چیرۆك لە واقیع داپراون و لە ژیانی ڕاستەقینەی بێنراوی ڕۆژانەوە دوورن. بێ‌ناوو نیشان و پسوولەو هەوییەی تایبەتی دەژین ، هەر وەك لە چیروکی (القضیة ؟) دا دەردەکەوێت ، پاڵەوانی سەرەکی‌ی ئەم چیرۆکە بەبێ هوودەیی دەژی و هیچ ئامانجێکی تایبەتیشی نیەو ئاگاداری دەوروبەری خۆیشی نیە ، تەنانەت ناویشی نیەو تەنها پیتی ( ك ) ناویەتی لە چیرۆکەکەدا فەرمانی کوشتنی بەسەردادراوە ، خۆیشی نازانێت بۆچی و لەسەرچی و جەلادەکانی کێن و بۆچی ئەم حوکمەیشیان بەسەری‌دا سەپاندووە ؟

تا لە کۆتاییدا دوو کەس پەلەکێشی دەکەن و دەیکوژن .

وە لە چیرۆکی (شێواندن – المسخ) دا گریگۆری سامپسون بەیانیەك کە لە خەو هەڵدەستێت خۆی دەبینێتەوە کە بووە بە زیندەوەرێك و لەسەر گازەرەی پشت ڕاکشاوە هەروەك چۆن شەو خەوی

ـكەوتبوو . پاڵەوانانی ئەدەبی ناماقووڵ ـەت پاڵەوانانی چیرۆکەکانی (فرانز کافکا) ـوو نیشانو پسوولەو هەویەی تایبەتی ـەزیو بێ هوودەییش ژیانیانی پێکاوە .

ـەدەی جەنجاڵی ئێمە گەڵی دیاردەو ـویەری دژواری ناهەمواری جەرگ بڕی ـە خۆیەوە بینی ، لە پێش هەموویشیانەوە هەردوو جەنگی جیهانی دێن ، هەردوابەدوای جەنگی جیهانی ی یەکەمەوە ـەیێك بیرو باوەڕی ناعەقڵیانە هاتنە ـووەوە . ڕێبازی دادایزمو ڕێبازی ـوریالی گرنگترین ڕێبازی دژبەعەقڵ پێك ـەهێنن ، هەوڵو تەقەلای ئەوەیان دەدا کەهەموو ڕواڵەتو وێنەیەکی بینراوو ، هەموو پێوانەو بیروباوەڕو ئایدیۆلۆژیەتێکی ـەسنیشان کراو دامو داخان بکەنو هەڵیان بووەشێننەوە .

لەساڵی (١٩١٧) دا خەڵکی فەرەنسە چویان بە شانۆیی( دوو مەمکی ـیریزیاس) کەوت ، کە (گیوم ئەپولینێر) ـوسیبووی ، نووسەر ناوی شانۆگەرییە ـۆیرالیەکەی نا (درامای سەرووی ـروشتەوە) ئەم هەوڵدانە سەرەتایەك پێك دەهێنێت بۆ سەرهەڵدانو پێك هاتنی ڕێبازو ووشەی (سوریالی) تایریزیاس لە ئەفسانەی یۆنانی کۆندا پێغەمبەرێکی کوێربووە لە شاری (تیبە) دا ، ئەثینا) ی خواوەند لە بینایی چاو بێبەشی دەکات بەڵام توانای بینینی دوارۆژی پێدەبەخشێت ، ئەم کابرایە هەروەك لە ئەفسانەکەدا هاتووە گوایە وەك ژن دوو مەمکی شۆڕی داچەکاوی هەبووە . (ئەپولینێر) . ئەم ئەفسانەیەی بە بەرگێکی هاوچەرخانەوە نووسیەوە .

بەرادەیەکی سەرسوڕهێنەر ڕووداوەکان لەسەر شانۆ دەردەکەون ، لە سەرەتای شانۆگەرییەکەدا (تیریزا ) لە بازارێکی (زەنجبار)دا بە بەرگی کەیبانووی ماڵەوە دەردەکەوێت کە دانیشتووە . تیریزا بێزارە لە ژیانی ژنایەتی ی خۆی ، دەیەوێت لە واقیعی خۆی یاخی بێتو چیتر بە کاروباری ژنایەتی هەڵنەستێتو منداڵیشی نەبێت ، ئارەزووی ئەوە دەکات کە هەروەك پیاوێك ببێت بە سەربازێك یاخود ببێت بە وەزیرێك .

بەم شێوەیە وورینە دەکاتو دژ بە مێردەکەی هەڵدەستێت ، لەناکاودا (تیریزا) ڕیشو سمێڵی دەردەچێتو سینەی دەردەکەوێت بە دوو مەمکەوە کە بریتین لە دوو کیسەی پڕ لە با .

بەرەو بینەرانی شانۆییەکە هەردووکیان هەڵدەداو دەڵێت لەمەودوا پیاومو ناوم (تایریزیاس) ە ، لەگەڵ مێردەکەیدا جلو بەرگەکانیان ئاڵو گۆڕ دەکەنو مێردەکەی دەس دەکات بەمنداڵ بوون ، لەنێوان هەشت ڕۆژدا ئەو پیاوە (٤٠٠٥١)منداڵی دەبێتو هەڕەشەی گرانیو قاتو قڕی لە وولات دەکەن . لە دوواییدا پۆلیسێکی وجاغ‌کوێر(عقیم) دێتو دەیگرێتو دەکەوونە قسەکردنو دەمەقاڵێ ، تا ژنە فاڵچی‌یەك دێتو بەشانو باهووی منداڵ بووندا هەڵدەداو خۆیشی دەردەخات کە (تیریزا) یەو بە پەشیمانیەوە بۆ ماڵ گەڕاوەتەوە ، بەگورجی پۆلیسەکە بیروباوەڕی خۆی دەگۆڕێتو بڕیاری ئەوە دەدات کە دەبێ منداڵێکی زۆر لەمەودوا بخاتەوەو ، پەردە پێوە دەدرێت . لە ساڵی (١٩٦٠) دا لە چاوپێکەوتنێکی پرۆگرامی سێهەمی دەزگای ئێسگەی بەریتانی لەگەڵ ( یۆنسکۆ ) دا ، نووسەری بێ هوودەیی دەڵێت کەوا شانۆیی ( دوو مەمکی تایریزیاس) یەکێکە لەو کارانەی کە کارێکی زۆریان کردۆتە سەری(٥)

**شانۆیی ڤیکتۆرو . . ئارتۆی دەرهێنەر**

چەند دەرهێنەرێکی شانۆیی دەورێکی زۆریان لە ڕێ خۆشکردن بۆسەرهەڵدانی شانۆی ناماقوڵ بینی . لە پێش هەموویانەوە (ئەنتوان ئارتۆ) بوو ، ئارتۆ لەکۆتای ی ساڵی (١٩٢٨) دا شانۆیی (ڤیکتۆر یاخود کاتێك منداڵان کاروبار دەگرنە ئەستۆ) ی دەرهێنا . هەر دوابەدوای دەرهێنانی ئەم شانۆییە خڵپە خڵپو هەیسو بەیسێکی زۆری بەدوای خۆیەوە هێنایە ڕووەوە ؛ لەبەر ئەو هەموو ڕووداوە توند و تیژو مەنتیقە گاڵتەجارییەی نێو شانو گەریەکە .

لەم شانۆییەدا دوو منداڵی زەبەلاح دەور دەگێڕنکە یەکێکیان (ڤیکتۆر)ی نۆساڵانە ، ئەوی تریان (ئەستێر)ی شەش ساڵانی کچە هاوەڵی ڤیکتۆرە . هەردووکیان بە زمانێکی زۆر نارێكو هیچو پووچ نێوەندەکەیان بە بێ‌هوودەییو گەمژەیی بێ‌مانا دەدەنە قەڵەم . باوکی ڤیکتۆر دۆستی دایکی (ئەستێر)ە . دوای گوێ ڕایەڵ‌کردنی ڤیکتۆر بۆ قسەو باسی ژنێك دەربارەی خۆشەویستیو ڕاوەڕاوی ژن بۆی دەردەکەوێت کە لەجیهانێکی بۆگەندا دەژیت ، لە ئاکامی ئەم شتانە ڤیکتۆر بەلادا دێت دوای سلك ئێشەیەکی زۆر توندو تیژ . دوا بە دوای ئەم شانۆگەریەش (ئارتۆ) بەردەوام دەبێت لە

دەرهێنانی چەند شانۆگەرییەك . بەم شێوەیە (ئەنتوان ئارتۆ)ی دەرهێنەر هێڵەکانی شانۆی توندو تیژی (مسرح القسوة) دارشت ، ئەو خاڵانەی کە ئارتۆ لە پەرتووکەکەیدا کەبەناوی (شانۆو هاوتاکەی – المسرح ونظیرە)ـەوە بوو هەر هەمان خاڵن کەدوای بیست ساڵێك بەدوواوە رابەرانی شانۆی ناماقوڵ پەیرەویان دەکرد ، وەك ئەم خاڵانەی خوارەوە :

– دوورە پەرێزی لەشیکردنەوەی دەروونی

– خۆلادان لەو ڕێبازە سروشتیەی (ناچرالیزم – الطبیعیة) کەوا (کۆبۆ) وە لۆگنەریێ دەرهێنەرو . (گۆردن کریگ)ی ئینگلیزیو قوتابخانە فلۆرەنسیەکەی ، لەتێك شکاندنیدا هاوبەشی بوون .

– گەڕانەوە بۆ جادوو ئەفسانەکان (هەروەك شانۆی ئەندەنووسی لە دوورگەی بالی دا) .

– بایەخدانێکی بالاّ بە نواندنی شانۆییو جموجۆڵو تێل نیشان (ئەویش دوابەدوای سینەمای بێدەنگ لەسەر دەستی چەند هونەرمەندێکی وەکو چارلی چاپلنو برایان مارکسو گاڵتەجارانی سێرك دامەزرا .

– زاڵ بوونی ئەندێشەو خەون بەسەر دیمەنەکانی شانۆداو سەپاندنی گیانی شاعیریانە تیایدا[٦] .

لە پێش پەیدابوونی قوتابخانە تازەکان لەم سەدەیەی ئێمەدا ، (ئەلفرێد گاریێ) ئالاّی یاخی بوونی هەڵکرد وەك یەکێك لەشاگردانی شاعیرانی ڕێبازی رەمزی وەك (رابیۆ)و (مالارمێ) . ئەم نووسەرە لەساڵی (١٩٠٧) دا لەتەمەنی سیو چوار ساڵیدا کۆچی دوایی کرد . هەر لەساڵی (١٨٩٦)ـەوە دەستی کرد بە بەرپاکردنی شۆڕش ، لەپاش ئەوەی کەلەو ساڵەدا لەسەر تەختەی (ئۆڤەر) رۆمانی (ئوبۆی پادشای) پیشاندا ، (گاریێ) ویستی دابو دەستوورو نەریتی کۆن تێك بشکێنێت ، بەتایبەتی هەوڵی لەناوبردنی ڕێبازی سروشتی (الطبیعیة) دەدا . واقیعی کاتو شوێنی سڕییەوەو هەموو راستەقینەیەکی مرۆڤایەتی ی سەرەنگوم کردو ویستی هەموو بیرو باوەڕێکی ماقووڵو لەبەرچاوگیراو لەسەر شانۆ سەرەو قولپ بکاتەوە . ئەو ڕێبازەی کە (گاریێ) پەیرەوی دەکرد ، لە نووسینێکیدا کە بە ناوونیشانی (بێهوودەیی شانۆ – عبث المسرح) وەبوو دەری بڕی ، لەو نووسینەیدا (ئەلفرێد گاریێ) دەڵێ :

(پێویستە هەوڵی لەناوبردنی گەلی کاروباری زۆر ناقۆلاّ بدەین کەهەنو ، زۆریش داخراوونو ، بەبێ هوودەیی تەختەی شانۆ پڕدەکەنەوە . بەرادەی یەکەمیش مەبەستم : دیکۆرو ئەکتەرەکانە)[٧] .

چیرۆکی شانۆیی (ئوبۆی پادشا) لاسایی کردنەوەیەکی تەڵفیساوی ی چیرۆکی (ماکبەث) ، لەچیرۆکە کۆنەکەدا ئوبۆی دایك هانی مێردەکەی دەدا بە رەشەکوژی پادشای پۆڵۆنی لەناوبەرێت . (گاریێ) دەیەوێت کەسایەتی ئوبۆ وەك کەسێکی سەربەگۆبەند پیشان بدات ، کەهەر لەسەرەتای ئەم سەدەیەوە زۆرێك لەو کەسانە هاتنەڕووەوە بەشێوەی دیـــکـــتـــاتۆرو شەڕداگیرسێنو ڕەگەزپەرست ، هەروەك زۆریش لەوانە توانیان گەلێك کاروباری بەرزوبڵند بگرنە ئەستۆو خەڵکی داماو تووشی سەرسەختیو دەربەدەریو سەرلێشێواوی بکەن . (ئەندرێە بریتۆن)ی سوریالیست لەبارەی ئەم شانۆیەوە دەڵێت «مەزنترین شانۆیی یە کە دوارۆژی دەسنیشان کردووەو تۆڵەی بۆ سەردەمە تازەکان سەندۆتەوە» .

(گیلدرۆد)ی شاعیری رۆمانسیش دەچێتە پاڵ ئەو کەسانەی کە ڕێیان بۆ ڕێبازی ناماقوڵ خۆش کرد . ئەم نووسەرە لەنێوانی ساڵەکانی (١٩١٨ – ١٩٣٧) دا نزیکەی (٣٠) سی شانۆیی نووسیوە . بەلاّم زۆربەیان لەدوای شەڕی دووەمی جیهانی دا لە فەرەنسا لەسەر تەختەی شانۆ پیشان دران ، بەرهەمەکانی (گیلدرۆد) لەسەر بناخەی هیچو پووچی ژیانو ترسو لەرز لە مردنو بڕوا بە غەیبیات هێنان هەڵساونەتە سەرپێ . (یۆنسکۆ) یەکێك بوو لەو کەسانەی کەئەم نووسەرە کاری تەواوی تێ کردبوو . یەکێك لەو بەرهەمانەی (گیلدرۆد) شانۆیی ی (دۆن جوان)بوو بەلاّم بە شێوەیەکی ئەندێشەیی جیاواز لە (دۆن جوان)ە کۆنە باوەکە ، لەم شانۆییەدا دەزگیرانەکەی (دۆن جوان) لەباتی شۆخێك پیرەژنێکی قۆڵتاخی ناقۆلاّیەو تووشی نەخۆشی ی سۆزەنك هاتووە .

ئەمانە بەتێکرا هەموو ئەو تەقەلایانە بوون کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمو سەرەتای سەدەی بیستەمدا لە وولاّتە رۆژئاواییەکاندا سەریان هەڵدا ، هەرلە سەرهەڵدانی قوتابخانەی رەمزییەوە تادەگاتە ئەو قوتابخانەو ڕێبازو هەوڵە یەکتەنانەی کە

...وه سەریان بڵند کردەوە ، ... نیکرا شۆرشێك پێك دەهێنن کە ... گۆڕانی فۆرم و ڕوخسارو ناوەڕۆك ... یخی بوون لە ڕووی قاڵبی کۆن ... گرن . ئەوەی جێی شانازییەو ... ی ناکرێت ئەوەیە کە هەندێك لەو ... مو تاقیکردنەوانە دەورێکی باڵایان ... ەرووی گۆڕانکاری‌ی فۆرم و ... زەوە بەڵام ئەوەی جێی داخەو لە ... ی خۆیدا نییە ئەوەیە کە زۆربەی زۆری ... زو قوتابخانانە مەبەستی سەرەکییان ... ندنی وورەی مرۆڤە . بەرادەی ... کندنو وێران کردنی بیرو هۆش و ... ی مرۆڤ . دەیانەوێت ئەوە بسەلمێنن ... مرۆڤ گیانلەبەرێکی ئیفلیج و ... حوونەو بێ توانایە مرۆڤ دەستەوەستان ... منێت لە ڕەوتی پیرۆزی مرۆڤایەتیدا ... کردنو پێك‌هێنانو پێشخستنی ... نیەتو بەرزکردنەوەی ئاستی ... رانی ڕۆژانەی . هەموو ئەو کۆشش و ... کردنانە بۆ دەسگیرکردنو کۆت ... نی مێشك و گیانو لەشی مرۆڤ ... مموو ئەو قوتابخانە ڕۆژئاواییانە بەدی ... کرێن ، هەر لە ڕێبازی ڕەمزیەتەوە ... گرین تادەگاتە دادایزم و سوریالیزم و ... جودیەت و بێ هوودەیی تا دەگاتە ... ڕۆمان . . کەم کردنەوەی نرخ و پایەی ... زی مرۆڤ – کە لەڕاستیدا بەبایەخترین ... رمایە دادەنرێت – لای ڕۆشنبیرانو ... سەرانی بۆرژوای سەرلێشێواو . شتێکی ... ریییە لە شیعرێکیدا ڕێ نمایەکانی ... سەرانی سەرمایەداران وەعزەکانی ... رەبەگەکانی جارانمان یاددەخاتەوە کە ... ردەم دژی بزووتنەوەی بیرو مێشك و

هۆشی مرۆڤ دەجەنگانو هێرشیان دەبردنەسەرو لەپڵ و پایەی مرۆڤ و عەقڵی مرۆڤیان کەم دەکردەوە . وەك ئەوەی کەدەیان ووت هەر هیچ نەبێت مرۆڤە ، چارەنووسیشمان هەر مردنە . خاك و خۆڵ دووا مەڵبەندمانە . ئەو کەسەی زۆر ئازیزترێت لامان یەك دوو خاکەناز خۆڵ زیاتر دەخرێتە سەر سنگی ، هەردەم ئەم ووتانە سەرگوزشتەی دەرەبەگە کۆنەکان بوون . بەڵام هەموو ئەم باسانە دەخرانە ڕوو و دەدرانە بەرگوێی خەڵکییەوە لەپێناوی هێنانەدیی و چەسپاندنی بەرژەوەندی تایبەتی‌ی خۆیان بوو ، بۆئەوەی کەس پرکێشیان نەکات و دەس بە ڕیشیاندا نەکات . لە دووایشدا بەرژەوەندیان بە جوانی و پڕ بە دڵی خۆیان بڕوات بەرێوە . وەعزەکانی ئێلیۆت (کەهەردەم بەدەمی خۆی دەی ووت کەلایەنگری پادشایەتی و کلاسیکیەت و کاتۆلیکی‌یە) بەهەمان شێوەی دەرەبەگەکان دەیەوێت ئەوەمان پێ‌بسەلمێنێت کە مادامەکی مردن هەیەو دونیا هیچ و پووچ و بێ‌هوودەیەو مرۆڤیش بێ‌نرخ و پەست و سستە ، دەبێت هەرکەسە بەو بەشەی کەهەیەتی ڕازی بێت و هەوڵی هیچ شتێکی ترنەدات .

هەروەك ووتمان هەموو ئەو ڕێبازو هەوڵدانە بیری و ئەدەبی و هونەریانە لە ناوەڕۆکدا مەبەستیان ڕسوا کردنی مرۆڤەو بەس . هەریەك لەو ڕێبازانە شتێکی تازەتری خستە سەر هەوڵدانەکانی پێشووتری لەبواری تێکشکاندنو داخان کردنی مرۆڤ و مێشکی مرۆڤ و ژیانی مرۆڤ و ڕووالەتەکانی دەورو بەری تا لە

ئاکامدا بوونە هۆی سەرهەڵدانو پێك هاتنی بیروباوەری بێ‌هوودەیی . بەڵام پێش بێ‌هوودەیی بیروباوەری وجودیەت سەری هەڵدا کە هۆیەکی سەرەکی بوو بۆئەوەی لەدواییدا بێ‌هوودەیی بێتەکایەوە . بگرە ڕێ‌خۆشکەرێك بوو بۆ ڕێبازی بێ‌هوودەیی لەئەدەبدادەتوانین بڵێین ئەدەبی بێ‌هوودەیی لە منداڵدانی بیروباوەڕی (وجودی)یەوە لەدایك‌بوو .

**وجوودی‌یەکانو ناماقوول**

لە بنەڕەتدا نووسەری دانیمارکی (کیار کیگارد) بەردی بناخەی وجودیەتی داناو خاڵەکانی دەس نیشان کرد . فەلسەفەی وجودی لەسەر بنچینەی هەست و ئاگای تاکی هەستاوەتە سەرپێ ، ئەرکی سەرەکی ئەوەیە کە لە مرۆڤی تاك بکۆڵێتەوە وەك بوونو وجودێك . دوودڵی و ڕارای‌ی و هێلنج هاتنەوە لە بوونو چارەنووسی مرۆڤ لە ئاکامی دەوروبەرو سەرنەکەوتن و نوشستی بەهۆی نادیاری دواڕۆژی مرۆڤی تاك ، باس وخواسی سەرەکی‌ی ئەم فەلسەفەیە . هەردەم مرۆڤی تاك خاڵی بنەڕەتی‌ی فەلسەفەی وجودی پێك دەهێنێت . گوایە نووسەرانی ئەو فەلسەفەیە پارێزگاری لە مافی مرۆڤی تاك دەکەنو پشتگیری‌ی تەواوی لێ‌دەکەن . یەکێك لە ڕابەرانی ئەم فەلسەفەیە کە (جان پۆل سارتر)ە بیروڕای خۆی بەرامبەر ئەم باسە دەردەبڕێتو دەڵێت (خەڵکی تر بۆتاك دۆزەخە) ! هەموو شت لەم بوونەدا دژ بە مرۆڤی تاکەو ڕووبەڕووی دەجەنگێت . هەموو شت لەم بوونو گەردوونەدا تۆوی ڕارایی و دڵە ڕاوکەو هێلنجدان لە ناخی مرۆڤ دەچێنن . وەك

سارتر خۆی کەلە نۆڤیلی (هێڵنج دان) دا کەلەساڵی (١٩٣٧) دا نووسیویە دەس نیشانی کردووە . پاڵەوانی ئەم ڕۆمانە کە ناوی (ڕۆکانتان)ـەو بیرەوەرییەکانی دەنووسێتەوە دەڵێت : (ئێستاکێ ووشەی [عبث] لەژێر خامەکەمدا لەدایك بوو) بێ گومان ئەم پاڵەوانە بەزمانی نووسەرەوە قسەدەکاتو فەلسەفەی نووسەر دەردەخات . ئەم پاڵەوانە لە هەموو شت دڵی هەڵدەشێوێتو هێڵنجی دێتەوە ، هەروەك مرۆڤێکی وجودیی ئاسایی . دەربارەی هەست کردن بەهێڵنج‌دان دەڵێت (گرتوومیەتیە خۆی ، هێڵنج تەنها لە ناوەوەمدا نیيە . . بەڵکو من کە سێکم کە لە نێو هێڵنجدا دەگەوزم) .

وەك پێشتر باسمان کرد (کیار کیگارد) لە پێشتردا خاڵەکانی فەلسەفەی وجودیی دەسنیشان کرد ، لەسەدەی بیستەمدا نووسەرانی فەلسەفەی وجودی سوودی زۆریان لەبیرو باوەڕەکانی وەرگرت . ئەم نووسەرە باسی هێڵنج دەکاتو دەڵێت (هیچ نەبوون [اللاشیئیە] بابەتی هێڵنجە کە وورده وورده دەبێت بە (کینونە) یەك . هیچ نەبوون ڕۆڵەی هێڵنجە کە لە ترسی مرۆڤی تاك پێك‌هاتووە کە یەك لەسەر یەکتر ڕەنگ دەدەنەوەو وورده وورده لەسەر تاك چەسپ دەبن)[٨] .

### ئەلبێر کامۆ

هەر چەندە نووسەرە وجودییەکان لەگەڵ یەکتردا لەسەر یەك ڕێگە کۆنابنەوە ، بەڵام یەك بیرو باوەر کۆیان دەکاتەوە ئەویش ئەوەیە کەژیانی مرۆڤ بێ بایەخەو پڕە لە دڵەکوتێو ترس‌ولەرزو هێڵنجدانەوە لە هەموو شت . مرۆڤ بێ خاوەنە هەروەك (هیدگەر) دەڵێت : (مرۆڤ توور هەڵدراوە بۆئەم جیهانە) (ئەلبێر کامۆ)ی وجودی لەهەموویان زیاتر دەسنیشانی ئەو خاڵانەی کردووە کە عەبەسیەکان پەیڕەوی دەکەن وەك بەردەبازی تایبەتی خۆیان – هەر چەند کامۆ بڕوای بە عەبەسیەکان نەدەهێنا . . ! – بۆ پەڕینەوە بۆ جیهانی تاریکیو نتوکیو بێ هوودەیی .

کامۆ لەساڵی (١٩٤٠)دا (ئەفسانەی سیزیف)ی نووسی ، لە ساڵی (١٩٤٢) شدا بڵاوی کردەوە . لەم پەرتووکە بچووکەدا (کامۆ) دەربارەی بێهوودەییو عەبەسیەت دەدوێت . بێهوودەییو یاخی بوونیش دووبەردی بناخەی سەرەکین لەفەلسەفەی کامۆدا . لەم پەرتووکەدا نووسەر باسی سیزیف دەکات کە دەبێ بەپێی سزای خواکان بەردێك بۆ سەر لووتکەشاخێك سەربخات هەموو ڕۆژێکیش ئەو بەردە خل دەبێتە خوارەوەو پێویستیشە سەرلە نوێ جارێکی کە بیباتەوە بۆسەر لوتکەی شاخەکە . . . بەم پێیە سیزیف حوکمە سەختەکەی کەئەوپەڕی بێهوودەییو ناماقووڵی دەگەیەنێت ، دەباتەسەر . بەڕای کامۆ ئەم بەسەرهاتەی سیزیف هاوتای ژیانی مرۆڤە ، کە چارە نووسی لەوەدایە شەوو ڕۆژ بژێتو کاروباری ڕۆژانەی ناماقووڵی بەرێتەسەر .

ئەلبێر کامۆ لەهەموو وجودیەکان زیاتر ناوبانگی دەرکردووە ، بەکۆنەپەرستیو خۆگێل کردن لەئاستی ڕووداوەکانی جیهان . شتێکی ئاساییە کە نووسەرێکی وەکو ئەو پشت لە هەموو ئێشو ئازارە بنەڕەتیەکانی میللەتانی جیهان بکاتو دەردەسەرییەکانیان بەشتێکی لابەلای دابنێتو بڵێت : (داواکاریەکا هەژارەکان لە برو بیانۆ بەولاوە هیچی ک نیيە)[٩] . هەڵوێستی کامۆ تاکۆتای ژیا هەڵوێستێکی دوورەپەرێزو گۆشەگیربوو هەروەك نووسەرێكو مرۆڤێکی تاك ئە بۆخۆی دەژیاو ڕێڕەوی تاکیی ژیانی گرتبووەبەر وەك هەر وجودییەکی کە کاتێك کە خەڵاتی نۆبلی پێبەخشرا ووتارێکی خوێندەوە ، ووتی (من بڕوام بە عەدالە هەیە بەڵام پارێزگاری لەدایکم دەکە پێش ئەوەی پارێزگاری لە عەدالە بکەم !)[١٠] . تێکڕای بیروباوەڕ وجودیە زاتیەکەی کامۆ ، لە نووسینەکانی ڕەنگ دەدەنەوە .

شانۆیەکانی کامۆ دەورێکی زۆ کاریگەریان گێڕا بۆ پێك‌هاتنی شانۆ بێهوودەیی . کامۆ گەڵی چیرۆکی شانۆی نووسی وەك : (تێك نەگەیشتن)و (بار گەمارۆ)و (کالیگۆلا) و (دادپەروەران) .

شانۆیی (کالیگۆلا)ی لەساڵی (١٩٣٨) دا نووسی بەڵام دوای جەنگی دووەمی جیهانی خرایەسەر شانۆ کەسایەتیی (کالیگۆلا) نووسەر لەژیان بەسەرهاتی قەیسەری ڕۆمانیەوە وەر گرتووە کەلەساڵانی (١٢ – ٤١) ی زاینی حوکمرانیی ئەمپراتۆریەتی ڕۆمانیی گرتۆتە ئەستۆ . نووسەر بەهۆی کەسایەتی (کالیگۆلا) وە ویستیەیە فەلسەفە بیروباوەڕی خۆی دەربڕێت . ئەم قەیسەر لە شانۆیەکەدا ڕێگەی چەوتو ناڵەبا نامێنێت کەپێیدا نەڕوات ، ژیانێکی هیچ پووچو بێهوودەیی دەباتەسەرو پیاوکوشتن ئاو خواردنەوەی لایەکە ، بەڕادەیەکی

ئەوتۆ کەنزیك ترین هاوەڵی لەنێودەبا- کەتێك (درۆزێللا) ی خۆشك و خۆشەویستی ! دەمرێت . ژیانی لێ تاڵ ـەبێت و بەرچاوی تاریك دەبێت ، هەست بە ناماقوڵی و بێهوودەیی ژیان دەکات . هەست کردنی بە عەبەسیەت و هیچ وپووچی ی ژیان دەیگەیەنێتە ئەو قەناعەتەی کە بەختەوەری لەوەدایێت ، هەنێت بەکوشتن و لەناوبردنی خەڵکی ی ـەورو بەری هەر لەدوژمنانیەوە تادەگاتە ـرانو یاوەرانی . پڕ بەدەم هاوار دەکات هەرچی لە دەوروبەرم هەیە درۆو ـەنەیە . . من دەمەوێت مانگ ـەجنگ بهێنم . .) یاخود دەڵێت چارەنووسی خەڵکی لەم ژیانەدا مردنەو ـەختەوەریش بێبەشن) . وەك بیەوێت ئەوە بگەیەنێت کەمادامەکی مردن هەیە ـبۆ ساتێکی زووتر بەدەستی من ـناونەچن !

تاڕادەیەکی زۆر کامۆو هەموو ـوسەرانی تری وجودی ، بەزمانی ـەنموانەکانی نووسینەکانیانەوە بیروباوەڕو ـەلسەفەی خۆیان دەردەبڕن . سەرجەمی ـەنگ و ئاوازیان ئەوەیە کە مرۆڤی تاك لە ـەندا لە خەڵکی ی دەوروبەری دابڕاوەو بە ـەوودڵی و ڕاڕایی و بێهوودەیی ژیانی ـەباتەسەر .

سەدەی بیستەم سەدەی دەنگ هەڵبڕینی چەند لایەنێك و چەند ڕێبازو ـەلسەفەو قوتابخانەیەك بوو لە وولاتە ـسەرمایەدارەکاندا ، دەربارەی بێمانایی و ـپووچی ناماقوڵیەت و بێهوودەیی ژیانی مرۆڤ هەر لە ڕێبازی ڕەمزیەتەوە بیگرین تادەگاتە ڕێبازی دادایزم و سوریالیزم و شیعرەکانی ئێلیۆت و ، تافەلسەفەی وجودی . بەڵام چڕبوونەوەی دەنگ هەڵبڕین بۆ پووككردنەوەی مرۆڤ و ژیانی مرۆڤ و بوون ، بەڕوونی لە ڕێبازی عەبەسیەتدا خۆی دەنوێنێت . کۆمەڵە نووسەرێك بوونە هۆی پەیدابوونی ڕێبازی بێهوودەیی ، دوابەدوای ئەوەی کە بەرهەمە شانۆگەریەکانیان نووسی و پێشانیان دان بەتایبەتی دوای ساڵەکانی پەنجای ئەم سەدەیەی کە ئێمەی تێدا دەژین . ئەدەبی ناماقوڵ هەوڵدانە بۆتێکشکاندنی فۆرم و ناوەڕۆکی ئەدەب ، ئەدەبی ناماقوڵ بەپێچەوانەی ئەدەبی ئاسایی ڕەوت دەکات . گەر لە شانۆیی ئاساییدا چەند کەسانێك پاڵەوانێتی تێدا بگێڕن و بەشێوەیەکی ئاسایی دیاری کراو هەڵس وکەوت بکەن و ، لەگەڵ یەکتردا بدوێن ، بەپێچەوانەوە ، لە شانۆیی یە عەبەسیەکاندا پاڵەوانەکان کەسایەتیەکی ڕوون و ئاشکرایان نیەو ، بەبێ هوودەیی دەژین و ، بەشێوەیەکی نائاسایی هەڵس وکەوت دەکەن و دەدوێن . ووشەکانیان پچڕ پچڕو بێمانان . هەروەها ئەو کەسایەتیانە هیچ هیواو ئامانجێکی تەواوو ڕوونیان نیە تا لە پێناویدا تێبکۆشن . ئەگەر لە شانۆیی ی ئاساییدا ڕووداوو کارەسات و حەقیقەتێکی لەبەرچاوگیراو بخرێتە ڕوو ، بەکۆتاییەکیش شانۆییەکە تەواو بێت ، بەپێچەوانەوە لەشانۆییەکی ناماقوڵدا ، سەرەتاو ناوەڕۆك و کۆتایی بەدی ناکرێن و هیچ بیرو باوەڕو فەلسەفەیەکیش ناخرێنە ڕوو جگە لە هەوڵدانی پووچەڵ کردنی ژیان بەولاوە نەبێت

# سەیرکەر ..

قاسم عزیز



بریخت دەڵێ : «شانۆ بەبێ جەماوەر شتێکی بێ مانایە»[1] . ئەو جەماوەرەی کە بریختیش مەبەستێتی جیاوازی هەیە لەگەل جەماوەری شانۆی ئاسایی . جا سەیرکەر لە شانۆی بریخت دا دەبێ چ جیاوازییەکی هەبێت لەگەڵ جەماوەر لە شانۆی درامی دا . بۆ ئەم مەبەستە ئەم جیاوازیانە لەم خالانەی خوارەوە بەدیار دەکەوێ .

• سەیرکەر لە شانۆی درامی دا دەچێتە ناو ڕووداوەکەو لە ناویدا نووقم دەبێت .

• سەیرکەر لە شانۆی بریخت‌دا خۆی لەناو ئاوێنەی ڕووداوەکاندا دەبینێت .

• شانۆی درامی تواناو وویستی سەیرکەر وەردەگرێ وخاوی دەکاتەوە .

• بریخت تواناو وویستی سەیرکەر هۆشیار دەکاتەوەو رای دەپەڕێنێ .

• شانۆی درامی کار لەهەست‌و سۆزی سەیرکەر دەکات .

• شانۆی بریخت وورەی سەیرکەر بەرز دەکات‌و مێشکی بەئاگا دەهێنێ .

• شانۆی درامی ڕووداوو تاقی کردنەوە بۆ سەیرکەر دەگوازێتەوە .

• بریخت بنچینەی زانست‌و زانیاری ڕووداوەکان بۆ سەیرکەر کۆپی «نقل» دەکات .

• شانۆی درامی بە نموونە ڕووداوەکان پێش‌کەش دەکات .

• بریخت ڕوو بەڕووی سەیرکەر دەوەستێ بە ووت‌و وێژ کردن لە گەڵێ بەمەرامی زیاتر لێکۆڵینەوە ڕووداوەکان .

• شانۆی درامی ژیان پێش‌کەش دەکات هەروەك خۆی چۆنە ، وا لە مرۆڤ دەکات دەستەو ئەژنۆ بوەستێ بەرامبەر بە کارانەی کە بەسەری سەپاوە .

• شانۆی بریخت ژیان پێش‌کەش دەکات وەك پێویستە چۆن‌بێت . . مرۆڤ ڕوون دەکاتەوە کە دەبێ ژیان چۆن لەسەر چی بێت ، چی لەسەر مرۆڤ پێویستە بۆ هي نانە دیو گەیشتن بە ژیانە .[2]

بەشێوەیەکی گشتی سەیرکەر لەشانۆی بریخت دا لەسەری پێویستەکە خاوەنی هەڵوێستێکی ڕەخنەیی بێت بەرامبەر ڕووداوەکانی شانۆگەریەکە ، بریخت دەڵی



# لەشانۆی

## بریخت دا

«پێویسته مرۆڤ وەك خۆی نەهێڵینەوە وەك چۆنە وا بێت . . بەڵکو پێویسته بەو شێوەیە بیبینرێت کە لە سەری پێویسته وا بێت»[٣] واتە توانای گۆڕینو کار لیّ کردنو بیرکردنەوەی هەبێت . . بیّ گومان ئەوە چاکترین رێگایە کە وا لە ئەکتەر خۆی وسەیرکەریش دەکات کە لەگەڵ یەك تێکەڵاو بنو بیربکەنەوە ئەکتەر . . بەو پیّیەی کە رووداوەکان دەگێرێتەوە وەك ئەکتەرێك شارەزایی کەسایەتی دەورەکەیە بەڵام نەچۆتە ناو قاڵبی واتە «أندماج»ی نەکردوە وخۆشی لە بیر نەچووە کە ئەکتەرەو تەمسیل دەکات هەموو کاتێکیش ئامادەیە کە رووبەرووی خەڵك بێتەوەو وەڵامی پرسیارەکانی بداتەوە لەکاتی تەمسیل کردندا سەیرکەریش بەو پیّیەی کە تەنیا سەیرکەرو گویّ گرنیە بەس بەلکو بەشداری رووداوەکان دەکاتو رەخنە دەگریّو دەپرسیّ ودەست نیشانی لایەنە رەواکانو خراپەکان دەکات . بە کورتی شانۆی بریخت وا لە سەیر کەر دەکات کە پاش تەوا بوونی لە شانۆ گەریەکەو بەجیّ هێشتنی هۆڵی شانۆکە بە درێژایی گەرانەوەی بیر لە شانۆ گەریەکە بکاتەوە ، لەم رووەوە بریخت توانای ئەوەی هەیە کە مێشکی سەیر کەر رابپەڕێنیّ وبیکاتە مرۆڤێکی خاوەن هەڵوێست .

لە کۆتایی دا جێگای شانازیە ئێمەی کوردیش وەك نەتەوەك سوود لە رێبازو قوتابخانەکانی جیهانی وەربگرین بۆ ئەوەی بناغەی شانۆی کوردی بەپتەوی بنیات بنێنو شانۆی بریختیش وەك رێبازو قوتابخانەیەك وەك شۆڕشێك لەسەر رێبازە شانۆییە جیهانیەکان خزمەتی بنیات نانی شانۆی کوردی دەکات . جا لەسەر هونەرمەندانی شانۆمان پێویسته وا لە خەڵك بکەنبگەنە ئاستی هونەرەکەیان هونەری گەورەش هەروەك بریخت خۆی دەڵیّ «خزمەتی ئامانجە گەورەکان دەکات»[٤] .

**قاسم عزیز**

**پەراوێزەکان**

١ - نظرية المسرح الملحمي - تأليف بريخت - ترجمة د . جميل نصيف لاپەرە ١٣ .

٢ - المخرج في المسرح المعاصر - بريخت - تأليف سعد أدرس سلسلة عالم المعرفة كويت . ١٩٧٩ لاپەرە ٢٠٨ .

٣ - هەمان سەرچاوە لاپەرە ٢٠٩

٤ - نظرية المسرح الملحمي . . ترجمة د . جميل نصيف لاپەرە ١٦ .

# ژن ئینان لە کوردستانێ دە

حمدی عبدالمجید

ل جهیێ بوتا دە چاخێ بەریێ ژ سەد سالی ویڤە ژن ئینان سێ توخم و جوٚر بون .

**١ - ژن رەڤاندن .**

**٢ - ژن ب ژن .**

**٣ - ژن ب نەخت و قەلەن .**

نهو ئەمێ ل سەر ژنِ ب نەخت و قەلەن ئاخڤن دگەل هەموو کارێن دهاتنە دژن ئینانێ دە .

چاخێ مروڤەکی ب خوەستا ژنەکێ ژ مروڤەکێ خوەرە بینێ وێ ب پرسي و ب گەڕا ل ناڤ گوندێ خوە و گوندێن دی و ل ناڤ مروڤێن خوە و مروڤێن دی چ چاخێ وی ژنەگ ب دلێ خوە بدیتا وێ گوتبا وی مروڤێ خوە ئەوێ و ژنێ بو بینێ هەرە کەچا گرۆ ببینە کا ب دلێ ئەیە ئان نە ؟

جارنا دخوەنست بەری مروڤێ وی و کەچگ هەڤدو ببینن .

پشتی دلێ وی چوێ کو کەچا گرۆ ب خوازێ چەند مروڤێن نە ژ حازرا چیتر ب خوەرە دبرن و دچو مالا ظرۆ .

پشتی دان و ستاندنەکە زور و گەلەگ ل دهاتن کو نەخت و قەلەنی سینەما کەچا گرۆ صەد کیس پارەنە و شەش خەلاتن و دەرمانەکە یان تڤەنگەکە

پشتی ل هەڤ دهاتن هرچو و هەڤالێن خوەژ مالا گرۆ دکەتن و دهاتن مالا خوە . دناڤ خوەدە پیگ دهاتن کەنگی دەزگیرانە ؟ چنکو ژن ئینان دو قوناغ بون دەزگیران و داوەت . هرچو گوتە گرۆ برا روژا پینج شەما چارێ ئەمێ بینە مالا وە دەزگیرانا سینەمی و صورویێ کورێ من .

روژا دوشەمبا چارێ هرچو دەنیا بو دەست پێ کرن دەزگیرانا صورویێ کورێ خوە و سینەما کەچا گرۆ ئاگاداری هەمو مروڤێن خوە کربو ئەوێن ب خوازێ بینە دەزگیرانێ نەخاسمە مروڤێن دایکا زاڤاي .

هرجو دەستەگ داهول و زرنە ئینان دەرێ مالا خوە دەزگیران ل دار داني . هەرچی مروڤێن داخوا ز کری روژا دو شەمبی هاتن دەزگیرانێ و زرنە ڤانی پف کرە زرنایێ و داهوٚل قوتێ داهول قوتا و کەچ و کورا خوٚرت و جوانا دەستێ هەڤ گرت و گوڤەندا خو گریدان و سەما کرن چەب و راست شێخانی و کوچەری بێلوتە و سێ کاڤی .

هەرچی مروڤێ هاتی داخواز کرن دگەل خوە تشتەگ ئینابون پەزەگ یان برنج یان ساڤار یان شەکر یان روٚن دا ئاری کاریا مالا زافایی بێتە کرن .

ل بەر دەرێ مالا زاڤایی ئەڤ کار وێ بێتە کرن ب شەڤ و روٚژ حەیا روژاپینج شەمێ گوندی و هەمو داخواز کەر وێ ريا خوە بگرن بچن مالا باڤێ بوکێ سوار سوار دبن ل هسپی خوە

دبن دو بر برەگ ل دەستێ راستێ و برەگ ل دەستێ چەپێ جرید و قوشما دکن حەیا دچن مالا باڤێ بوکێ چ ل گوندی بن و چ ل گوندەکی دی بن .

چاخێ گهانە مالا باڤێ بوکێ وێ دەست ب گوڤەند و سەما بـ خوە بکن حەیاروژا ئینێ پشتی نان خوارنا نیفرو مروڤەگ دەسپالەکێ وێ دەینی و نفیس ڤانەگ وێ قەلەم و دەفتەرا خوە ب دەست خوە بگرێ دا بنفیسی کێ چەند پارە دانینە ژبو زاڤێ ـ دەزگیرانێ . دڤێ دەست پێ کەر مروڤێن دایکا زاڤێ بن .

پشتی پارە دانین ب دومایگ تێ هەمو بەلاڤ دبن دچن مالێن خوە مروڤێن زاڤێ نەخت و قەلەنێ باڤێ بوکێ ددنێ و نیشانیا خوە ب بوکێ ڤە دکم حەیاسە ، قولان ، گوهار ، بازن خرخال ، خزێم ، قەرەفل .

ژ ڤێ دەزگیرانێ رە دبێژن شیرانی چاوە دبێژنێ دەزگیران . چشکو شیرانیێ لێ دخون پشتی هرچو ڤەگرها مالا خوە وێ دەست ب کارو بارێ داوەتێ بکێ ژ سەریڤە وێ بچیێ باژێر خەلاتا بکری ژوان مروڤان رە ئەوێن پارە دانین ل دەزگیرانێ . هەر یەکی ل گور نیڤێ پارێ وا دانای ڤبجاکا چ بەرامبەری وی دیت .

چاخێ ژ هەمو کارێ خوە ڤالە بو هرچو وێ هەمو داخوازکەرێ خوە بین بەرێ ئاگادار بکێ کو ئەڤ ئیتا بێ ئەمێ سینەما کەچا گرو ب گوهیزن ژ صوروێ مەرە .

دیسان وەکی جارا دی ل دەزگیرانێ هەمو وێ بین هەر یەگ تشتەکی ب خوەرە بینی و بێ داوەتێ .

یا باش ئەوە داوەت ل بهارێ بێ لێ بە لێ نە ل هەیڤا نیسانێ بێ چنکو نیسان بوکا هەیڤایە پێ نەخوەشە چ بوگ تێدە بێنە ڤەگوهازتن .

یان ژی ل پایزێ چنکو گەرم دشکێو سەرما تێ .

ل بەر دەرێ مالا هرچو داوەت و سەما و دیلانە روژا چار شەمبێ بەربودی وێ بچن مالا باڤێ بوکێ دا سەرێ بوکێ بشون و کار و بارێ وێ بکن . روژ پینج شەمبی خێل ژ کارێ خوە ڤالە دبن جلکێ بوکێ دکن بەر کراس دڤێ صور بێ چنکو رەنگێ صور گەلەگ جوانە . چاخی خێل دگەهێ مالا باڤێ بوکێ مروڤەکي بوکی ل سەر سەبەلا ( صندوقا) بوکێ دروني نا رابی حەیا هندەگ پارە نە دني و مروڤەکێ بوکێ دەرگەهێ دگرێ حەیا پشت دەریا وی نەدنێ دەرگەهێ نا ڤەکێ .

ب چ کول و حال ژ مالا باڤێ بوکێ دەردکەڤن و بوکا خوە سوار دکن ل مهینەکا سپی . بەربودی کەڤجگ و هەسگ و تشتێ مالا باڤێ بوکێ ددزن ئەڤەش نیشانێ هندێ یە کو خوەشی بەری خوە بدێ مالا زاڤێ .

مال باڤا بوکێ هندە پارا دکن دپیلاف و قوندرا بوکێ دەکو هاتن گوندێ زاڤێ هەرچی بەری گەهشتە قوندرا بوکێ وان پارا ژخوەرە دبێ ژلایەکی دیڤە هەرکەسی کوم و دەسپالێ زاڤێ ب رەڤینی بێ بدێ بوکێ دا پارا ژێ وەرگری . یان بالگەهی بوکێ ب رڤینێ بینێ دەینی بەر پالا زاڤێ دا پارا بدێ .

زاڤا دچی سەر بانێ خانێ خوە چاخی بوگ تێ دا ئەو راسەر بێ و طرساوی بکەڤ دلێ بوکێدە وسەهما وی سەر کەڤێ .

چاخێ خیل ژ مالا زاڤێ دەردکەڤ حەیا دڤەگەرێ کەچگ ناریکێ دبێژن .

پشتی بوگ بەیا دبێ شەکروگ و پارە دکن د جەرەکی دە سەر سەرێ بوکێ رە ل عەردێ ددن دشکێن زاروگ بچوگ ژ خوە کوم دکن .

چاخێ ئەو دوماهیگ هات زاڤا دبێ پاشا و (مفردیا) ژ خوەرە دگرێ برا زاڤا ل طەشت درونن دەست ب گرتن و بەردانێ دکن . گوندیا یەگ ب یەگ دگرن تشت ژوان دستێن هندەکا دهلاویسن پاکیت مریشگ پەز پارە ئەڤ هەمو تێنە وەرگرتن .

ئەگەر مروڤێن زیرەگ هەبن کوم و دەسپالێ زاڤێ رەڤاندن (مفردی – شرطە) نەگهانە وان . برا زاڤ و مفردیێن وان بن دەست دبن و دکەڤن بن دەستێ برا زاڤای نو دە . چ ل وان بکن کیفا خوەنە .

پشتی نفیرزا ئێڤاری برا زاڤا و خورتێ گوند زاڤایێ دبن سەر شویێ سەر ئاڤێ ، پەستا دبێژن دەستێ خوە دڤێن حەیا دبن و دئینن .

وی عینن دڤێ کارێ خوە شدا حەیا پشتی نفیژا (شەڤ – عەت) زاڤا دگەل برا زاڤا وێ بچن بن پەیرا بوکێ بوگ وێ چەرەزا ژوارە بینێ پشتی چەرەز خوارنێ برا زاڤا وی دەگەڤێ و نوبەتێ بگرێ ل زاڤێ حەیا سەرێ سپێ .

سپیدێ دیسان گوڤەند و سەما وی هەبن حەیا زاڤا و بوگ بینە ناڤ گوڤەندێ و سەما و دیلانێ بکن پشترە وی ڤەرەڤن .

ب ڤێ رەنگێ ها دەزگیران – شیرانی – نیشان کرن – داوەت ل جهی بوطان دبون خوەزی صەد خوەزی ب وی چاخی .

# کوردناسی

## نووسینی: قەناتی کلاشۆفیچ کوردۆیێف

کورد ناسی‌ی وەك بابەتێکی زانستی‌یانەی سەربەخۆ دوای جەنگی نیشتمانی‌ی گەورە ١٩٤١ – ١٩٤٥ ، لە ئامۆژگای ڕۆژهەلاتناسی‌ی‌دا گەشەی سەند . گەرچی دەستپێشخەری بنج‌وبناوان داکوتینی ئەم گەشە سەندنە دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم .

بەم جۆرە لەم بارەیەوە کارکردن دەستی‌پی‌کردو لە خزمەتگوزاری‌یەکانی ب . ئا . دۆرن‌دا گرینگی ئەم کارە دیاری دەدات . . دۆرن یارمەتی‌یەکی بێوێنەی پ . نی لێرخی دا[1] ، کە دامەزرێنەری کورد ناسی‌ی ڕووسی‌یە ، لە ڕێکخستن‌و چاپکردنی لێکۆڵینەوەکانی‌دا دەربارەی مێژوو و ئەتنۆگرافیاو لێکۆڵینەوەی زمانناسی‌ی کوردی‌و ، هەروەها لە بەدەست‌خستنی جێماوی کولتووری دا ، لەدەستنووسی مێژوویی‌و ئەدەبی‌و تێکستی فۆلکلۆری‌ی کوردی بۆ مۆزەخانەی ئاسیایی[2] .

لە ناو ئەو دەستنووسە کوردی‌و فارسی‌یانەدا کە ئەکادیمیای زانستی لای خۆی گلی دابوونەوە ، دەستنووسێکی ناسراوی تێدابوو کە «شەرەفنامە» کەی مێژووناسی کورد شەرەفخانی بتلیسی بوو . . ئەوەی لەم بارەیەوە شایانی

# وەرگێڕانی بۆ عەرەبی . د . مارف خەزنەدار
## رؤوف حسن کردوویەتی بەکوردی

ئاگاداربوونە ئەوەیە کە یێکەمین وەسفێکی فراوانی ئەم دەستنووسە م . ڤۆلکۆڤ[٣] کردوێتی کە ئەمینداری مۆزەخانەی ئاسیایی‌یە . . (خ . د . فرین)یش لە وتارەکانی‌دا بایەخی (شەرەفنامە) و پێویستی‌ی وەرگێڕانو بلاوکردنەوەی ڕوون کردۆتەوە ، ئەمەش لەو وتارانەی‌دا کە لەبارەی وەسفی دەستنووسە ڕۆژهەلاتی‌یەکانی کتێبخانەی ئەردەبیل[٤] نووسیوێتی‌و . .

پشتگیری ب . ئا . دۆرنیشی‌کرد لە ڕاپۆرتەکەی پ . لێرخ‌دا بۆ گەشتە زانستی‌یەکەی[٥] و ، هەروەها لە پێرستکردنی دەستنووسە ڕۆژهەلاتی‌یەکانو لە کاروباری (دۆرن)یش‌دا لە مۆزەخانەی ئاسیایی[٦] .

لە سالّی ١٨٦٠ – ١٨٦٢ دا ڤ . ڤ . ڤیلیامینۆڤ . زێرنۆڤ تێکستە فارسی‌یەکەی (شەرەفنامە[٧]) ی بلاوکردەوە ، لە سالّی ١٨٦٨ – ١٨٧٥ دا تەرجومەکەشی بلاوکرایەوە کە ف . ب شارموا وەری‌گێڕابوو لەگەلّ ڕوونکردنەوەی جوگرافیایی‌و مێژوویی‌و ئەتنۆگرافیاییانەی پوخت‌دا . هەروەها دەرچوونی کارەکەی قونسولّ

(شابەندەر)ی ڕووسیایی لە ئەرزڕۆم ئا. ژابا دەربارەی ئەکادیمیای زانستیی[٩] هەربۆ ئەم سەردەمە دەگەڕێتەوە.

دەوری ك. گ. زالیمان لە گەشەسەندنی کوردناسیی[١٠] دا هێند گەورەو گرینگ بوو کە لەپلەی هەست پێ کردن دابوو.. بە هاوکاری ئەم کاری کۆمەڵێ لە پسپۆرە کوردناسە بیانی یەکان بلاوکرایەوە.. وەك ف. یووستی، ی. پریمو، ئا. سوتین[١١].

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمەوەو ئا بەم جۆرە، لە ئەکادیمیای زانستیی دا دەستکرا بە لێکۆڵینەوەی ژیانی گەلی کورد بەشێوەیێکی ڕیك وپێك و تاڕادەیێکیش بەپێ ی بەرنامە، بەم جۆرە بنەمایێکی زانستی و ماددیانە بو گەشەسەندنی کوردناسیی لە ڕووسیادا سەری هەڵدا.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا تێبینی ئەوەدەکرێ هەندێ خاووخلیچکی و نەختێ ساردی لە بواری ئەو باسانەدا هەیە کە تایبەتن بە کوردناسی یەوە لە ئەکادیمیای زانستیی دا.. زوربەی هەرە زۆری ئەو کارە ڕووسیانەی دەربارەی کوردو مێژووی کوردن، لەو سەردەمەدا بەشێوەی بلاوکراوەی نا ئەکادیمیانە چاپ دەکران[١٢].. لەناو ئەو کارە بلاوکراوانەی ئەو ماوەیەدا کە شایانی ئیشارەت پێ دانی بێ و خۆ لێ گێل کردنی مەحال بێ.. وتارێکی ن. ی مارە: «دیسانەوە دەربارەی وشەی چەلەبی»[١٣].

لە سەرەتای سەدەی بیستەم داو لە نێوەندی ئەو پسپۆرە ڕووسانەدا کە خەریکی کاری ڕۆژهەلاتناسین وتوێژێکی توندو تیژ لە بارەی مەسەلەی بنج وبناوان و مێژووی ئایدیۆمە تەمو مژاوی یەکەی (چەلەبی) لە زمانی کوردی و تورکی و عەرەبی دا ڕووی دا. کەمانای خانەدان و دەسندە، ڕەسەن، مۆزیکا، شایەر، سوعبەتچی، کۆمیدی، چەتەو ئا لەم بابەتانەیە.. ئیتر کۆمەڵێ وتار دەربارەی ئەم زاراوەیە نووسرا. لە نیوانیان دا وتارێکی خاتو ن. ی. مارە کە لەمەوبەر پەنجەی بۆ ڕاکێشرا، بەناونیشانی «لەبارەی مەسەلەی گرینگی کولتووری گەلی کوردەوە لە مێژووی ئاسیای نزیك دا» بوو.. لەم وتارەدا (مار) کۆمەڵێ ڕاستیی بەهادار دەخاتە ڕوو کە دەوری کورد لە مێژووی کولتووری گەلانی ئاسیایی دا ڕوون دەکاتەوە.. دانەر ئەوە دەسەلمێنێ کە کورد لە سەدەکانی دەیەم تا سیازدەم دا دەورێکی گرنگیان دیوە لە چەسپاندنی دەرەبەگایەتی دا لە ئاسیای گچکەداو لە خولقاندنی جێناوی کولتووی بەنرخ دا بۆ گەلانی پشت قەفقاس.. بەلام دەبێ پەنجە بۆ ئەوەش ڕابکێشرێت کە ن. ی. مار بەجۆرێکی وا نەیڕوانیوەتە مێژووی کورد کەوەك مێژووی کورد خۆی بێ.. بەڵکو وەك مێژووی یافثی یەکان (جۆرجی و خالیدی و ئەرمەنی) تێ ی ڕوانیوە.. ڕەفزی ئێرانێتی نەژادی کوردو زمانەکەز کردەوەو وای داناوە کە نەژادو ڕەچەلەکی کورد لە یافپی یەکانەوەیە.. هەروەها زمانەکەشیان زمانی یافپی یە.. لەم بارەیەوە وای نووسیوەو دەڵێ: «ئەسلی Kord,resp,Kard خۆی بەڵگەو لێکچواندنیکی گەورە دەدۆزێتەوە لە بنیچینەی ناونانە ڕەگەزی یەکان دا (ڕەچەڵەك) لەلای جۆرجی یەکان خۆیان هەروەکو لە sqardی جۆرجی و qord ی مینگریلی دا (ناوی جۆرە ئەلفوبێیێکی نوێیە لە زمانی جۆرجی دا) هەیە

بەم جۆرە دەبینین تا دێ بوونی ڕاستەقینەی دەرکەوتنی کاردۆخی یەکانی یێکەمین (کورد) و کارتی یەکان (جۆرجی یەکان) دەسەلمێ.. ئەوانەی کە بەهەزار ساڵی تەمەنی مێژوو لە یێکتر جوێ بوونەوە.. ئاشکراشە کە گۆڕانی بنەڕەتی و گەوهەری بەسەر زمانی کوردی دا هاتووە.. بە ئێجگارەکیش یافثی گۆڕا بە ئاری»[١٤]

پاشان مار ئەوە دەردەخات کە «هەموو مانایێکی ئایینی و کۆمەلایەتی و شەی (چەلەبی) لە زمانی کوردی خۆی دا بەکارهاتووە، بە تایبەتی لە نێوەندە میللیەکانی کورددا پێش سەرەتای سەدەی چواردەم بەماوەیێکی درێژو لە مەیدانێکی فراوان دا پێش ئەوەی ئەو نێشتە جێ دێرینە ڕەسەنەی ئەم گەلە لەبارەی زمانەوە بگۆڕێ بە ئێرانی»[١٥].

ئەم بۆچوونانەی کە مار خستنیەڕوو، دوایی یاریدەی ئەوەی دا کە بنکەیێك پێك بێنێ بۆ هێنانەکایەی تیۆری چەوت و هەڵە دەربارەی نەژادو گەشەسەندنی گەلی کوردو زمانەکەی (کارەکانی ئۆ. ل. ڤیلچێفسکی و ب. ف مێللەر دەرکەوتن).

ئی. ئا. ئۆربیلی ئەکادیمی دەورێکی ئاشکرای لە کوردناسیی و زمان و کولتووری کوردی دا بینی.. ئەم بە باپیرە گەورەی کوردناسیی سۆڤێتی و دامەزرێنەری خویندنگای لێنینگراد دادەنرێ بۆ کوردناسیی.

لە ساڵی ١٩١١ – ١٩١٣ دا نێرراوێکی زانستیانەی لە ئەکادیمیای زانستی بۆ موکس «ئەرمەنستانی تورکیا» بەدەستهێنا.. بۆ لێکۆڵینەوەی دیالێکتی ناوچەیی موکسی ئەرمەنستان.. لاوی پسپۆر لە لێکۆڵینەوەی ئەرمەنی و قەفقاسی یەکانی ئەوکاتەدا، ئی، ئا. ئۆربیلی.. بەڕاوێژی ن. ی. مار

ـمستی دایە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی بۆ ـو کوردانەی لەو ناوچەیەدا لەگەڵ ـرمەنی یەکان دا دەژیان . تێکستە ـردی یەکانی نووسی یەوەو فەرهەنگێکی ـردی – رووسی بە (١٥) فۆرمەدانا ـگەڵ پاشکۆیێکی صەرف و نەحودا . . ـلام ئەم کارانە لە کاتی خۆی دا ـاونەکرانەوە .

ـە ساڵی ١٩١٤ دا کۆمەڵەی ـێشکەوتنخوازی کورد (جیٚخاندن) کە لە ـوی (سەرووی ئێران) دا بوو . . نوێنەری ـەخسی و کۆمەڵایەتی و رامیاری گەورەی ـعەبدولرەزاق) ناردە پیترسبۆرگ ، بۆ ـەموندان لە پێناوی دانانی ئەلفوبێی ـوردی دا . . بەڵام جەنگ تەگەرەی ـخستە کارەکەوە .

دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر . . سەرەڕای ـمو کارە ئیداری و کۆمەڵایەتی یە گەورانەی ـی . ئا . ئۆربیلی ڕای دەپەڕاندن ، ـەکارنەوەستاو خەریکی گەڕان بوو ـەدوای ئەدەبی میللی و کولتووری گەلی ـورددا .

لە ساڵی ١٩٢٧دا چووە ناوچە کوردی یەکانی ئەرمەنستانی سۆڤێتی و تێکستە کوردی یەکانی نووسی یەوە . . سەرەنجام تێکستی میللی هەردوو چیرۆکە شیعری یە کوردی یە بەناوبانگەکەی (مەم و زین) و (لەیل و مەجنوون) ی دەستکەوت . . لە ساڵی ١٩٢٦ دا ئی . ئا . ئۆربیلی چەند تیکستێکی کوردی ی (لەگەڵ فەرهەنگێك دا) ی بڵاوکردەوە کەهی لێکۆڵەرەوەی زانستی کتێبخانەی زانستگای هۆگۆماکاش بوو و دیالێکتی کرمانجی لەناوچەی ماردینی کوردستانی تورکیا دەخاتەڕوو .

لە ساڵی ١٩٥٧ داو بەسەرپەرشتی ئی . ئا . ئۆربیلی فەرهەنگی کوردی – ڕووسی چاپکرا کە چ . خ . باکایێف دای نا بوو . . ئۆربیلی لە پێشەکی فەرهەنگەکەدا بایەخی زانستیانەو پراکتیکیانەی فەرهەنگە بڵاوکراوەکەی روونکردبۆوە بەنیسبەت کوردی ئەرمەنستانەوە لە ڕووی فێرکردن و ڕوونـاکـبیرکـردنـەوەی میللیانەیانەوە .

هەروەها ئۆربیلی بایەخێکی زۆری دا بە (مەم و زین) کە لەداهێنانی شاعیری هەڵکەوتووی سەدەی حەڤدەمی کورد (ئەحمەدی خانی)یە . . ئەم چیرۆکە شیعریە ئاوازەیەی دیراسەکردو بایەخی هونەری ی روونکردەوە و وەسفی پاڵەوانە سەرەکی یەکانی کرد ، ناوی شاعیریشی لەتەك ناوی شاعیرە مەزنەکانی ڕۆژهەڵات ناوەڕاستدا دانا وەك : ڕۆستاڤیلی ، فیردەوسی و نیزامی .

ئی . ئا . ئۆربیلی لە موحازەرەکانی دا دەربارەی کولتوورو مێژووی گەلانی ئاسیای نزیك دەوری کوردی بەسەر گەلانی ئەو ناوچەیەوە خستەڕوو . . بەتایبەتی بەڵگەو گرینگی سەردەمی ئـەیـوبی و شەدادی یەکانی دەسەلماند لە مێژووی گەلانی پشت قەفقاس دا .

دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر ف . ب ڕۆستۆپچین نوێنەری کورد ناسی ی لە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی ی ، یەکەمین ڕێکخەری «بیبلیۆگرافیای کێشەی کوردی» بوو[18] . . دەستی دایە وەرگێڕانی مێژووی کوردی شەرەفخانی بتلیسی بۆ زمانی ڕووسی . . وەرگێڕانی ئەم سەرچاوە گرینگەی مێژووی گەلی کورد لە ئەنجامی بڕیارێك دابوو لە کۆنگرەی کوردناسی ی دا لەسەری پێك هاتن کە لە ساڵی ١٩٣٤دا لە شاری یەریڤان بەسترا .

سەبارەت بە سوود وەرگرتن لە کەرەستە کوردی یەکان ل . ئا . خیتاگۆرۆف ئەو سەرچاوانەی بەکارهێنا کە پەیوەندی بەزمانی کوردی یەوە هەیە لە دیراسەکەی دا دەربارەی نێرینەو مێینە لە زمانە ئێرانی یەکان دا[19] .

دەکرێ کە ماوەی ساڵانی سی بە قۆناغی وەرچەرخان دابنرێت لە گەشەسەندنی کوردناسی ی سۆڤێتی دا . . کاتێ کە لە ولاتەکەمان داو بۆ یەکەمین جار لە ناو کورد خۆی دا پسپۆڕو لێهاتووان بۆ کوردناسی ی ئامادەکران . فەزڵ و چاکەی ئەمەش بەشێوەیێکی تایبەتی بۆ ئی . ئا . ئۆربیلی و ئا . ئا فریمان دەگەڕێتەوە .

لە ساڵی ١٩٣١ داو بەهۆی دەستپێشخەری یەکی ئا . ئا . فریمانەوە ، دەورەیێکی زمانی کوردی لە ئامۆژگای مێژووو دیراسەی ئەدەبیو زمانناسی لە لێنینگراد کرایەوە . . بەزۆریش ئەو لاوە کوردانەی تێدابوو کە کۆلێژی ڕەنجدەرانی سەر بە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتی یان لە لێنینگراد تەواو کردبووە .

هەر لە ناوەڕاستی سی یەکانەوە خویندنی زمانی کوردی بوو بەزۆرو هەروەها بووە پێداویستە سەرەکی یەکان بۆ وەرگرتنی خوێندکاران لە بەشی زمانناسی ئێرانی . . بەشی ئێراناسی ئەوربیلیان دامەزراند تا دەرسی زمانی کوردی و ئەتنۆگرافیای گەلی کوردی تێدابڵێتەوە . . بە پێشنیاری ئا . ئا . فریمانیش کۆرسێکی زانستیانە بۆ خویندکاران لەناو بەشەکەدا بۆ زمانی کوردی ڕێکخرا . . هەروەها ئەم بەشە لە ساڵانی ١٩٣٤ – ١٩٥٠ دا ، دەورەی مەیدانی و نێرراوی زانستیانەی بۆ ناوچە کوردی یەکانی ئەرمەنستان و تورکمانستانی سۆڤێتی ڕێکخست ، بە مەبەستی کۆکردنەوەی کەرەستە لە ئەدەبی میللی و زمانی کوردی باودا لە ناو کوردی سۆڤێتی دا

له سالی ۱۹۴۲دا ق . ل . کوردۆیێف و

تسوکەرمان که هەردوکیان . خوێندکاری سێیەمین ساڵی دەورەی کوردی بوون ، بەسەرپەرشتی فریمان و ئۆربیلی دوو بابەتیان له زمانی کوردیدا ئامادەکرد ، که لەدوایی‌دا بەبەشداریکردنی ع . ش . شامیلۆف بلاوکرانەوە[٢٠] ، بۆ یێکەمین جاربوو که بەشێوەیێکی زانستیانه لەم دوو باسەدا دەوری نێرینەو مێینه له زمانی کوردیدا بخرێتە روو بشسەلمێنرێت . . که لەکۆمەڵەی ناوی نیشانه ئیزانەکراودا دەردەکەوێ (موزافو موزاف ئیلەیهی) هەروەها له صیغەی ناو تەصریف کردندا . . بۆ یێکەمین جاریش له وتاری یێکەمی ئەو دوو وتارەدا که ئیشارەتمان پێدان ، دوو ئامرازی تر له ئامرازەکانی . ئیشارەت خراونەتە روو .

e – (بۆ ناوی مێینەی ناسراو)و ، أ – (بۆ ناوی نێرینەی ناسراو) . . ئەمانە ئەو دوو ئامرازی ئیشارەتە (a,e) نین ، که جاردینی لەوەو بەر پەنجەی بۆ راکێشابوون . . بەلام وتاری دووەم له شیکردنەوەی ناوی نێرینەو. مێینه دەدوێ له حاڵەتەکانی ئیعراب کردندا ، لەگەڵ ئامرازه نادیارەکانو بەبێ ئەو ئامرازانە ش . . بێ گومان چوونه ناو باسی ناوی نێرینەو مێینه له زمانی کوردیدا بووە هۆی خستنە رووی صیغەی ناوی نێرینەو مێینه له پاشاندا . . ئەمەش له ئەدەبیاتی ئێرانناسیدا نرخو بایەخێکی بەرزی درایە[٢١] .

یێکەمین هەوڵدان بۆ بەشبەشکردنی ناوی وەسفکراو له دیالێکتی کرمانجی ژووروودا له ساڵی ١٩٤٩دا بوو له کتێبی رێزمانی کوردی قوتابخانەدا[٢٢] .

ئەم بەشبەشکردنه لەو بابەتانەدا دەرکەوتن که پسپۆرانی کوردناسیی له پاشاندا نووسیان[٢٣] . . ئەم کارانەش یاریدەی چەسپاندنی مەسەلەی تەصریفی ناوو فرمانیانی دا له زمانی کوردیدا . . گەشەسەندنی زەمەنی بەردەوام هەروەکو بەشێکی رێزمان بە خاویمایەوە . . لەمەوە دەتوانین بگەینه ئەو ئەنجامەی که ئەو لێکۆڵەرەوە ئەوروپاییانەی خەریکی زمانی کوردی بوون ، تا رادەیێکی زۆر له دەستووری زمانی فارسییەوە ، یا هی زمانی خۆیانەوە بۆ حاڵەتی ئیعرابی زمانی کوردی چووبوون . . بەم جۆرە ف . یووستی و ئەنجا س . یەگیزارۆف هەردووکیان حاڵەتی ئیعرابیان له (l,e) ی دیالێکتی کرمانجی ژووررووی زمانی کوردیدا ، وەك چەند بەشێکی یێك شێوەیان دەبینی که له Casus obliqus ی زمانی فارسیدا کۆدەبێتەوە . . (و . مان) یش هەر رای وابوو ، بریاریشیدا که له زمانی کوردیدا یێك‌شێوەی حاڵەتی (جەر) و (نەصب) هەیه که بەتەك ئامرازەکانیانەوەن . . ئەم شێوەیەش لەهی حاڵەتی (رەفع) جودایه که بە e یا أ پاشبەندەو . . بەشپرزەییەوە نووسیوێتی :

«بەداخەوە . . ناتوانرێ بریاری ئەوە بدرێ که بۆچی له دیالێکتی موکریانیدا أ و هەندێ جاریش e بەم حاڵەتە ئیعرابەوە دەلکێ . . سەرەرای ئەمەش له چ حاڵەتێك‌دا ئەم تیپە ڤاوڵە یا ئەوی تریان دەردەکەوێ»[٢٤] .

پسپۆرەکانی کوردناسیی سۆڤێتی وەڵامی ئەم پرسیارەیان پێشدەست خست ، لەو کارانەی که لەمەوبەر باسکران ، دەربارەی ئیزافەو باسی نێرینەو مێینه له زمانی کوردیدا ، ئەو پسپورانه توانیان بەی بە هەقیقەتی کۆتایی وشە (نا ئاشکراکان) بەرن که ئاونین له حاڵەتی ئیعرابدا وله راستیدا شێوە تێکچووەکانی e-i ی لای و . مان ئامرازی ناوی نێرینەو مێینەن . . بەم جۆرە دوو تەصریفی ناو له زمانی کوردیدا چەسپا : شێوەی تەصریفی ناوی مێینەو شێوەی تەصریفی ناوی نێرینه . . ئەمەش له وتارێك‌دا «لەبارەی مەسەلەی جنسەوە له زمانی کوردیدا» ، بە شێوەیێکی سەرەتایی (ناو) بەسەر شەش حاڵەتدا دابەش کرا . . سێ حاڵەتی یێکەم بەم جۆرە یێك له دوای یێك ناو دەبران (حاڵەتی رەفع ، صیغەی بانگ‌کەر – مونادی – ، حاڵەتی ئیخباری) . . بەلام سێ حاڵەتەکەی تر وا دانران که بە ژمارە ناوبنرێن . . چونکه لەو دەمەداماناو فرمانەکانیان روونو ئاشکرا نەبوونو باسیان لێوە نەکرابوو . . دەربارەی فرمانی سێ حاڵەتەکەی یێکەمیش ، پاشان لەلایەن پسپۆرانی کوردناسییەوە له لێنینگراد شتیان لەسەر نووسرا[٢٥] . . بەلام ماناو فرمانی حاڵەتەکانی تر له کتێبی «رێزمانی زمانی کوردی»ی قوتابخانەیی‌دا لێیان کۆڵرایەوە ، که له ساڵی ١٩٤٩ دا دەرچووەو لەمەوبەر ناوی برا . . هەروەها له نامەی چ . خ باکایێف‌دا «پاشگرەکان وەك ئامراز بۆ ساغکردنەوەی پێوەندی ئیعراب له زمانی کوردیدا» که بەسەرپەرشتی پسپۆرانی لێنینگراد له کوردناسییدا ئامادەکراو له ساڵی ١٩٥٠ دا وتووێژی لەسەرکرا .

له ساڵی ١٩٣٩ – ١٩٤٠ سێ خوێندکاری ئا . ئا . فریمان که : ی . ی ئەڤالیانی ، ئی . ئی . تسوکەرمان ، ق . ك . کوردۆیێف بوون ، بەرگریان لەو نامە زانستیانەیان . کرد که لەبابەتەکانی زمانی کوردیدا ئامادەیان کردبوو[٢٦] . . پاش ئەم بەرگری کردنه له نامەکان ، ئی . ئی . تسوکەرمان لەسەر کوردناسیی له ئامۆزگای زمانناسیدا بەردەوام بوو . . بەلام ی . ی ئەڤالیانی له بەشی زمانناسی له

ـتی دیراساتی ئەدەبی لە زانستگای ـگردی میری‌دا کاری‌کرد ، بەڵام ق . - کوردۆییڤ ، بە راوێژی ئا . ئا . ... . لە ساڵی ۱۹۳۸ دا چووە ـگەی ئەتنۆگرافیای سەر بە ئەکادیمیای ـی سۆڤیێتی تا کاری تێدا بکات . . ... ئامادەکردنی کارێکی زانستیانەی ـی دەربارەی کورد خرایە ئەستۆ . . لە ـی ۱۹۳۹ داکەرەسەیێکی زۆری بۆ ئەم ـە کۆکردەوە . . ئەمەش لەکاتێك‌دا ـنێرراوێکی زانستیانەدا بوو بۆ ـسەکردنی ژیانی کوردەواری پشت ـس (ئەرمەنستان‌و جۆرجیاو ـربایجان) ، بەڵام لەبەر باری ئەوسای ـنی جەنگ بلاو نەکرایەوە .

ـە ساڵی ۱۹٤٥ داو پاش کۆتایی جەنگی نیشتمانی‌و بە داوایێکی ئا . ئا . ـن ، ق . ك . کوردۆییڤ بەر لە کۆتایی ـنی خزمەتی لە سوپای سۆڤیێتی ئەسریح ـکرو بە مامۆستایێکی زمانی کوردی لە ـکۆلیژی رۆژهەڵاتی‌ی زانستگای ـلینینگرادی میری دا مەزرێنرا . . لە ساڵی ۱۹٤٠ دا گوێزرایەو بۆ کارکردن لە ئامۆژگای رۆژهەڵاتناسی‌ی . . ئیتر ـوساکەوە کوردناسی‌ی لە ناو دیوارەکانی ئامۆژگای رۆژهەڵاتناسی‌ی‌دا بەشێوەیێکی ـێك‌وپێك‌و بەردەوام دەستی‌پی‌کرد .

پاشان مەسەلەی پێویستی‌ی ئامادەکردنی پسپۆران لە زانستی‌یەکانی تری کوردناسی‌ی‌دا لە ناو ئامۆژگای رۆژهەڵاتناسی‌ی‌دا هاتەکایەوە .

لە ساڵی ۱۹٥۱ دا خاتو م . ب . رودێنکۆ کە خوێندکارێکی بەشی دیراساتی بالا بوو . . لە ساڵی ۱۹٥٤ دا بەسەرکەوتوویی‌یەوە بەرگری لە نامەکەی کرد کە لە بابەت «چیرۆکە شیعری‌یەکەی (مەم‌وزین)(ی شاعیری کوردی سەدەی حەڤدەم ئەحمەدی خانی» یەوەبە ،« دوای ئەمە خرایە سەر میلاکی ئامۆژگای رۆژهەڵاتناسی‌ی .

دوای دامەزراندنی ئی . ئا . ئۆربیلی بەسەرۆکی ئامۆژگای رۆژهەڵاتناسی‌ی لقی لینینگراد ، قوناغێکی نوی‌ی گەشەسەندنی کوردناسی‌ی دەستی‌پی‌کرد . . بەتایبەتی لەم ماوەیەدا چالاکی زانستیانەیی‌و رێکخراوەیی ئۆربیلی بە ئاشکرا دەرکەوت . کە دەستێکی بالای هەبوو لە دامەزراندنی بەشی کوردناسی‌ی‌دا . . ئی . ئا . ئۆربیلی ئەو کادیرە نوی‌یانەی کۆکردەوە کە لە کوردناسی‌ی‌دا پسپۆر بوون . . لە ساڵی ۱۹٥٦ دا ئی . ئی . ئسوکەرمان کە لەمەوبەر لە ئامۆژگای زمانناسی‌ی‌دا کاری دەکرد ، لە ڤیلنۆس (پایتەختی کۆماری لیتوانای سۆڤیێتی سۆشیالیزم کە دەکەوێتە سەر رۆخی دەریای بەڵتیك لە بەشی ئەوروپای یەکێتی سۆڤیەت‌دا) گەرایەوە .

هەروەها ئامۆژگاکە ژ . س . موسیلیان‌و ، ی . ئی . دیمیتیێڤای هێنایە لای‌خۆی کە دوو لاوی پسپۆرن لە ئێرانناسی‌ی‌دا . . ئەمجا لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی پێشوازی (ر . ل . تسابۆلۆف)یش کرد کە زانستی‌یانە خۆی بۆ کوردناسی‌ی تەرخان‌کردبوو لە ناو ئێرانناسی‌ی گشتی‌دا . . دواتر کۆمەڵە خوێندکارێکی دیراساتی بالا بۆ خوێندنی مێژووو زمانی گەلی کورد وەرگیران . . لە ناویاندا : سەیید عەزیزی شەمزینی ، جەلیلی جەلیلۆف ، مەکسیمی خەمۆ ، کەریمی ئەییوبی ، زاری یوسفۆڤا ، ئی . ئا . سمیرنۆڤا ، ئۆردیخانی جەلیلۆف .

لە ۲۸ی شوباتی ساڵی ۱۹٥۹ دا لەلایەن ئی . ئا . ئۆربیلی ئەکادیمی سەرۆکی ئامۆژگای رۆژهەڵاتناسی‌ی لە لینینگرادەوە فەرمانێکی ئیداری دەرچوو ئەمەی خوارەوەی تێدابوو .

«لەبەر ئەوەی پێویستە ئەو بەرنامەی کارەی کە بەندە بە کوردناسی‌یەوە لە لقەکەدا ، بەوردی بەجێ‌ی بێنم . . فەرمانم‌دا بەلابردنی لیژنەی پسپۆرانی کوردناسی‌ی کە سەربە بەشی ئێرانی‌یە لە رۆژی ۱ی مارتی ساڵی ۱۹٥۹ داو ، فەرمانم‌دا بە دروستکردنی دەزگایێکی سەربەخۆی رێکخراو لێ‌یان ، بەسەرپەرشتی خۆم کە لەمانە پێك‌دێن .

کوردۆییڤ . ق . ك ، تسوکەرمان . ئی . ئی ، رودێنکۆ . م . ب ، موسیلیان . ژ . س ، دیمیتیێڤا . ی . ئی . و لەخوێندکارانی دیراساتی بالا : سمیرنۆڤا . ئی . ئا ، یوسفۆڤا . ز . ع ، ئەییوبی . ك . ر ، جەلیلۆف . ج ، و هەرچی ئەوشتای پەیوەندی بە لێکۆڵینەوەی مێژووو کولتوورو زمانی گەلی کوردەوە هەیە ، لەم دەزگایەدا دادەنرێ ، بۆ لێکۆڵینەوەو ساغکردنەوەیان [۲۷] .

بەم جۆرە بە هەوڵ‌و کۆششی ئی . ئا . ئۆربیلی بۆ یێکەمین جار لە مێژووی زانستی‌ی نەتەوەیی‌و جیهانی‌دا ، دام‌ودەزگایێکی زانستیانەی سەربەخۆ پێك‌هێنرا کە بەشێوەیێکی هەرەوەزی (بەکۆمەڵ) بایەخ بە کوردناسی‌ی بدات . . دامەزراندنی بەشی کوردناسی‌ی وەك دەزگایێکی زانستیانەی رێکخراوی سەربەخۆ ، ئەوساو ئێستاش سەرنج‌و بایەخ‌پێدانی نێوەندێکی فراوانی کۆمەڵگای کوردی دەرەوەی راکێشاو گرینگی پێ‌دراو دەدرێت ، کە لەمەدا دان‌پیانانی زانستی‌ی سۆڤیێتی تێدا دەبینرێ بەو دەورە گەورەیەی کە گەلی کورد لە مێژووداو لە مێژووی کولتووری گەلانی رۆژهەڵات‌دا دەیگێرێ .

لە ڕۆژی داهەزراندنی ئەم بەشەوە وا هەشت ساڵ تێپەڕی . . لەم ماوەیەدا – کە لە چاوخۆیدا کورتە – لێکۆڵەرەوەو کارگێرانی بەشەکە ، بەشداری‌یێکی ئاشکراو لەڕوویان کرد لە گەشەپێدانی کوردناسی‌ی سۆڤێتی‌دا .

لێکۆڵەرەوانی بەشەکە . . کۆمەڵێ کاری زانستیانەی کامڵ‌و باس‌و وتاری ئەوتۆ بلاوکرانەوە کە بۆ کێشەکانی زمان‌و ئەدەب‌و مێژووو ئەتنۆگرافیای گەلی کورد تەرخان کرابوون . . لە کاری زماناسەکان‌دا ، بۆ یێکەمین ، جار مەسەلە گەوهەری‌یە گرینگەکانی دەستووری زمانی کوردی بە شێوەیێکی زانستیانە خزانە ڕوو ، وەك : شێوەکانی جنس لە دەستووری زمان‌دا ، شێوەی ئیعراب لە دیالێکتی کرمانجی‌دا ، تەصریفی بابەتی و نابابەتیانەی کرداری تێپەڕ ، دابەشکردنی ناو بەپێی جنس ، صیغەکانی کردار لەبارەی زەمەنەوە ، جۆرەکانی زەمەن‌و صیغەکانی کردار . . . هتد . . ئەم کێشانە بە ئاستی‌جوێ جوێ‌و دەرفەتی جۆراوجۆرەوە لە کارەکانی ئی . ئی . تسوکەرمان‌و ق . ك . کوردۆیێف‌دا ڕەنگی دایەوە .

ئەو باسانەی کە ق . ك . کوردۆیێف لە زانستی‌ی زمان‌و دەستوورەکەی‌دا لە ماوەی ساڵانێکی دوورو درێژدا پێشکەشی کردن [۲۸] ، لە ساڵانی پەنجاکان‌دا لە دوو کاری سەرەکی‌دا پوخت دەکرێنەوە ، ئەوانیش ڕێزمانی زمانی کوردی‌یەکە ئەمەیان لە ژیانی زانستیانەی وڵاتەکەمان‌دا بە پلەی یێکەمین دێ [۲۹] و فەرهەنگە کوردی – ڕووسی‌یە گەورەکەیە (نزیکەی ۳٤ هەزار وشەیە) ، ئەمەشیان لە ژیانی زانستیانەی وڵاتەکەمان‌دا هەر یێکەمینە [۳۰] .

دیالێکتی ، کوردانی ئەرمەنستانی سۆڤێتی کرا بە بنچینەی ڕێکخستنی دەستووری زمانەکە لەپاڵ سوود وەرگرتن‌دا لە سەرچاوەکانی دیالێکتی کرمانجی دەرەوەی وڵات . بەلام فەرهەنگەکە وشەو زاراوەی گشت دیالێکتە بچووکەکانی گرتبووە خۆی کە بە هەمووی دیالێکتی کرمانجی (ئەوەی لە یەکێتی سۆڤیەت‌و دەرەوەی‌دا هەیە) پێك‌دێنن ، لە هەمان کاتیش‌دا کۆمەڵێ وشەی دیالێکتی خوارووی زمانی کوردی (سۆرانی) لە فەرهەنگەکەدا هەیە ، کە بە نیشانەی تایبەتی دیاری کراون .

لەمەوبەرو بۆ یێکەمین جار ، خاوەنی ئەم فەرهەنگە ، ڕێزمانی زمانی کوردی بۆ قوتابخانە کوردی‌یەکانی ئەرمەنستانی سۆڤێتی ، لەسەر بنچینەیێکی زانستیانە بلاوکردەوە [۳۱] .

لە کتێبی دوای ئەوەدا کوردۆیێف بۆ یێکەمین جار هەوڵی دا کە باسێکی بەراووردکارانە پێشکەش بکات بۆ بنچینەکانی صەرف‌و نەحو لە دیالێکتی سەروو (کرمانجی) و دیالێکتی خواروو (سۆرانی) دا ، کە هەر دوکیان لە دیالێکتەکانی زمانی کوردین [۳۲] .

بەلام ئەو کارە سەرەکیانەی کە ئی . ئی . تسوکەرمان پێشکەشی کردن ، پێوەندیان بە کۆمەڵەکانی تەصریفی ناو [۳۳] و کردارەوە [۳٤] هەیە لە دیالێکتی کرمانجی‌دا . . لەم کارانەدا باسی جۆری ئیزافەو شێوەی ئیعرابی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ دەکات ، تا دەگاتە تەصریفی نالەبارو لە باری کردارە ڕابردووە تێپەڕەکان‌و بەشێوەیێکی فراوان لە دوو شێوە دەدوێ کە صیغەی کرداری (مەنصووب)ە لە کۆمەڵەی یێکەم داو صیغەی کرداری (مەنصووب) ە لە کۆمەڵەی دووەم دا . کۆمەڵە وتارێکی تری تسوکەرمان هەیە ، دەربارەی بیروراو بۆ چوونی خۆیەتی لەهەندی کێشەدا کە تا ئێستاش لە دەستووری زمانی کوردی دا جێ‌ی وتووێژە [۳۵] .

پسپۆرانی کوردناسیمان لایەن‌و بابەتی دیارو گرینگیان لە دیراسەکردنی دیالێکتە کوردی‌یەکان‌دا ئیزافە کرد . . کوردۆیێف «ڕێزمانی زمانی کوردی ، بەراوردی کرمانجی وسۆرانی» بۆ چاپ ئامادەکردو ، هەر بەسەرپەرشتی ئەم ، لێکۆڵینەوەکانی خ . چ . باکایێف دەربارەی هەردوو دیالێکتی . کوردی‌تورکمانستان‌و ئازەربایجان چاپ کران [۳۶] .

ئێستا لە بواری لێکۆڵینەوەی دیالێکتە کوردی‌یەکان‌دا تسوکەرمان خەریکی باسەکانێتی دەربارەی زمان‌و فولکلۆرو ئەدەبی کوردی تورکمانستان . . بەلام بەکایێف خەریکی باسێکە لە بەراوردکردنی بەشەکانی دیالێکتی کرمانجی لە یەکێتی سۆڤیێت‌دا . . ك . ئەیوبی‌و ئی . ئا . سمیرنوفاش کە هەردووکیان خوێندنی بەرزیان لە ئامۆزگای گەلانی ئاسیایی سەر بەئەکادیمای زانستی‌ی سۆڤێتی لە لێنینگراد تەواوکرد . . «وەسفی دیالێکتی موکریانی» یان بەچاپ گەیاندو . . هەردوکیان لە بواری دیراساتی دیالێکتانەی کوردی‌دا لە کارکردن‌دا بەردەوامن . ئالێرەدا پێویستە ئیشارەت بەو خزمەتگوزاریانەی بەشەکە بدرێ کە لە ڕێکخستنی لێکۆڵینەوەی دیالێکتی خواروو (سۆرانی) دا کردی . هەروەها سەرکەوتنی ئاشکرا هەیە لە بواری لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی‌دا . . ژمارەیێکی فرە لەو کارانەی کە تایبەتە بە ئەدەبەوە ، لە بەرهەمی م . ب . ڕودێنکۆیە کە وزەو توانای خۆی لە لێکۆڵینەوەی جێماوی دێرینی ئەدەبی

ـلاسیکی کوردی دا سەرفکردو لەو ـستووناسانەدا دیاری دەدات کە لە ـیـحـنەی (سالتیکۆف – شەدرین)ی ـشتی میری‌داو لەبەشی دەستنووسی‌ی ـخزێنەی رۆژهەلاتناسیی سەر بە ـکادیمیای زانستی سۆڤێتی لە لینینگراد ـپارێزراون . . لە سالی ١٩٦١ دا م . ب . ـودێنکۆ بۆ یێکەمین جار کتێبی «وەسفی ـستووسە کوردی‌یە پارێزراوەکانی ـینگرادەی بلاوکردەوە . . بەلام لە ـلانی دوایی تردا کۆمەلێکی بایەخداری « جێاوی دێرینەی ئەدەبی کوردی بلاوکردەوە ، کە بریتیە لە تێکستی ئەو ـەوە دێرینانەی لی‌یان کۆلراوەتەوەو ـگەل وەرگێرراوەکانیدا بۆ رۆوسی ، ـشەکی‌و تەعلیق پێویستیشی بۆ ـنون [٣٧] . . م . ب . رودێنکۆ ، لە ـری وتارو باسە بەنرخەکانیەوە ، لە ـوری جێاوی دێرینەی کلاسیکی ئەدەبی کوردی‌دا ، بارخانەیێکی پەسەندی نایە ـن کوردناسی‌ی‌و پێشکەوتنی . ئەو راو ـچوونە بلاوانەی ناو کۆمەلە نووسەرێکی ئەوروپایی‌و رۆژهەلاتی‌ی بە درۆخستەوە ، کە دەربارەی نەبوونی ئەدەبێکی تایبەتی رەسەن بوو لای گەلی کورد . . هەروەها م . ب . رودێنکۆ پەیوەندی نیوان ئەدەبی نوسراوو ئەدەبی میللی دیراسە کرد ، لەگەل کارتێکردنیاندا بەسەر قۆناغە جۆراوجۆرەکانی رێبازی مێژووی کوردەوە .

سەرکەوتنێکی هەست‌پی‌کراو لە بواری لێکۆلینەوەی ئەدەبی کوردی‌دا ، بە دیالێکتی خواروو لە زمانی کوردی‌دا بەدەست هات ، لە سالی ١٩٦٢ دا ، ئەو کارەی کە مارف خەزنەدار ، [*] ، بە زمانی کوردی ، لە ئامۆژگای گەلانی ئاسیایی سەر بە ئەکادیمیای زانستی‌ی سۆڤێت لە لینینگراد ئامادەی کردبوو ، «کێش‌و قافیە لە شیعری کوردی‌دا» لە بەغدا دەرچوو . . پاشان بە ماوەیێکی کەم کتێبەکەی مارف خەزنەدار «مێژووی ئـەدەبی نوی‌ی کورد» [*] [*] بلاوکرایەوە ، کە بۆ یێکەمین جار بە زمانی رووسی ، مێژووی گەشە سەندنی ئەدەبی کوردی بە دیالێکتی خواروو پەیوەندی بە کاروانی بزووتنەوەی ئازادی نەتەوەیی کوردەوە خرایە روو .

لێکۆلەرەوە زانستی‌یەکانو هەروەها فەرمانبەرانی بەشەکە چەند ئامانجێکی دیاریکراویان لە بواری وەرگێراندا بەجی‌هێنا . . بەرهەمەکانیان لە بارەی شێوەو هونەرە جۆراوجۆرەکانی ئەدەبی میللی دەولەمەندی کوردی‌دا بلاوکردەوە ، بە تایبەتی دەتوانری ئیشارەت بەو کارانەی ق . ك . کوردۆیێف بدرێت کە بە جووتە لەگەل ئی . ئی . تسوکەرماندا لە بلاوکردنەوەی تێکستە کوردی‌یەکانی حیکایەتی «ئەبو زەید» و «مەم‌و زین» [٣٨] دا کردیان . . هەروەها تێکستەکانی «سی حیکایەتی کوردی» دەرچوو ، کە ئی . ئی . تسوکەرمان وەری‌گێرابوون [٣٩] . . بەلام بلاوکردنەوەی چیرۆکی شیعری زۆر گرنیگ‌و زەق کە گیانی رۆمانتیکی‌و ناوەرۆکی جوامێرانەی تی‌دایی ، بە رووداوێکی جی‌دیارو پەسەند دادەنری ، وەك : (مەم‌و زین) و (کار گۆلك) و (سێوەو ئاجی) و (سیابەندو خەجی) و (مەم‌و ئایشی) و (زەمبیل فرۆش) و (دمدم) . . لە وەرگێرانی : م . ب . رودێنکۆو ، ئی . ئی . تسوکەرمانو ، ق . ك . کوردۆیێف [٤٠] .

بـەلام جـەمـاوەری فراوانی خوێندکاران ، کۆمەلە حیکایەتێکی کوردیان بە زمانی رووسی بلاوکردەوە [٤١] لەگەل ژمارەیێکی زۆری پەندە کوردی‌یەکان [٤٢] . . هەروەها کۆمەلی «حیکایەتی کوردی‌ی یەکێتی سۆڤێت» لە وەرگێرانی م . ب . رودێنکۆو ، «چیرۆکەکانی ئەدیبانی کوردی لە وەرگێرانی مارف خەزنەدار ، ئامادەکرانو لە چاپ‌دران . . بەلام ز . س . موسیلیان خەریکی ئامادەکردنی لێکۆلینەوەیەکە دەربارەی تێکستە فۆلکلۆری‌یەکانی چیرۆکی شیعری میللی (زەمبیل فرۆش) و شیعری گۆرانی میللی کوردی‌و دارشتنیان .

هەروەها گەشە سەندنێکی پەسەند لە مەیدانی لێکۆلینەوەی مێژووی نوی‌و هاوچەرخی کورددا‌و مێژووی کورد لە سەدەکانی ناوەراستدا رووی‌دا . . خاتوی . ئی . ڤلسلیڤا وەرگێرانی یێکەم جزوبەندی کتێبی (شەرەفنامە) [٤٣]ی مێژووناسی کوردی سەدەی شازدەم (شەرەف‌خانی بتلسی) بلاوکردەوە .

بلاوکردنەوەی ئەم سەرچاوەیە کە تا ئێستاش بە کارێکی بی‌هاوتا دەژمێرری . لە مـێژووی کـوردی‌ی سـەدەکـانی ناوەراستدا ، لەگەل نووسینی تی‌بینی‌و تەعلیق لێدانی پێویستو پێشەکی‌دا لە لایەن وەرگێرەوە . . ئەمانە لە دیراسەکردنی مێژوو پەیوەندی‌یە کۆمەلایەتی‌یەکاندا بایەخێکی گەورەی هەیە ، نەك هەر بۆ گەلی کورد بەتەنیا ، بەلکو بۆ گەلانی فارس‌و تورك‌و ئەرمەنیش لەسەدەکانی ناوەراستدا . . بەم جۆرە ، شەرەفخانی بتلیسی مێژووی کوردو کوردستانی لە ولاتانو گەلانی دەوروپشت جوی نەکردەوەو بە دوورەپەرێزی لەوان نەی‌نووسی .

بەلام مێژووی گەلی کورد لە سەدەی نۆزدەمدا ، لەو کتێبەدا رەنگی دایەوە کە لەم دواییەدا مێژووناسی لاو . ج .

جەلیلۆڤ بلاوی کردەوە . . جەلیلۆڤ خوێندنی بەرزی لە ئامۆژگای گەلانی ئاسیایی سەر بە ئەکادیمیای زانستی‌ی سۆڤییێت لە لێنینگراد تەواو کرد[٤٤] . . بەلام کاری ق . ك . کوردۆییێڤ لەم رووەوە ، لەدەرەوەی ولات بلاوبۆوە[٤٥] . . ئەویش بریتی بوو لە رەخنەیێکی ئاراستەکراوی کتێبی (مێژووی نەژادی کورد) کە هی زانای بەناوبانگی ئێرانی (رەشید یاسمی)یە .

بابەتی ئەتنۆگرافیای کوردییش پایەو جێگەیێکی دیاری لە کارەکانی بەشەکە داگرتووە . . لە سالی ١٩٥٧ دا ، وتارێکی ق . ك کوردۆییێڤ بەناوی «کورد»ەوە بلاوکردەوە . . تیای‌دا بە کورتی باسی مێژووی کوردو کوردستان دەکات‌و ، پیشەو پیشەسازی‌یە سەرەکیەکانی‌و پێوەندی‌یە کۆمەلایەتی‌و خێزانی‌یەکان ، زمان‌و کولتووری گیانی‌و هەروەها بزووتنەوەی ئازادی‌ی دیموکراتیانەیان دەخاتە روو . . بەلام م . ب . رودێنکۆ ، کاری زانای کورد مەلا مەحموودی بایەزیدی (عادات‌و رسومات نامەی ئەکرادیە) کە لەمەوبەر ناوبرابوو ، وەری‌گێراو تەعلیقیشی لەسەر نووسی .

لەبابەتی ئەتنۆگرافیای کوردی سۆڤییێت ، کارێکی مەممەد نزاروڤ هەیە ، کە خوێندنی بەرزی لە ئامۆژگای گەلانی ئاسیایی سەر بە ئەکادیمیای زانستی‌ی سۆڤییێت لە لێنینگراد تەواوکرد ، سەرکەوتوانە بەرگری لە نامەکەی کرد ، کە لەبارەی زمانی کوردی تورکمانستانەوەیە[٤٧] .

مێژووی کوردناسی‌ی لە ولاتەکەماندا ، لای لێکۆلەرەوانمان پشت‌گوێ نەخرا بوو ، ئەو وتارە سەربەخۆیانەی بۆ پێشچاو خستنی چالاکی‌ی زانستی کوردناسانی کارامە تەرخان کرابوون ، وەك . خ . ئاپۆڤیان‌و پ . لێرخ‌و ئی . ئا . ئۆربیلی .

رەنگدانەوەی چالاکی‌ی کۆمەلێکی تر لە پسپۆرانی کوردناسی‌ی لە قۆناغی سۆڤییێتی‌دا ، لەو وتارانەدا بینرایەوە کە بۆ کارەکانی کوردناسە لێنینگرادیەکان تەرخان‌کرابوو . . هەروەها رەخنەلێ‌گرتنی بیروباوەرە هەلەو چەوتەکان دەربارەی زمانی کوردی .

ئەمجا لە سالانی دوایی‌دا . بەشە کوردی‌یەکە گۆڕرا بە مەلبەندێکی زانستیانەی رەسەنی ریك‌وپێك بۆ کوردناسین لە یەکێتی سۆڤییێت‌دا . . ئالەم شوێنەدا کادیری پسپۆری کوردناسین پێك‌دەگرن . . لە بەشەکەدا دوازدە کەس خوێندنی بەرزیان تەواوکرد ، لە نیوانیاندا خوێندکاری نێرراوە زانستی‌یەکانی تێدابوو لە ئەرمەنستان‌و تورکمانستان‌و کۆماری عێراقەوە[٥٠] .

لە نێو ئەوانەی خوێندنی بەرزیان لە ئامۆژگای گەلانی ئاسیایی سەر بە ئەکادیمیای زانستی‌ی سۆڤییێت لە لێنینگراد تەواوکردو بەرگریان لە نامەزانستی‌یەکانیان کرد ، لە کوردناسە پسپۆرەکان ، پێنجیان لە ئەکادیمیای زانستی‌ی ئەرمەنستانی سۆڤییێتی کار دەکەن ، یێکێکیان لە ئەکادیمیای زانستی‌ی تورکمەنستانی سۆڤییێت‌و دوانیان لە ئامۆژگای زمانناسی‌ی سەر بە ئەکادیمیای زانستی‌ی سۆڤییێتین لە لێنینگراد سیانیشیان لە بەشی کوردناسین لە ئامۆژگای گەلانی ئاسیایی سەر بە ئەکادیمیای زانستی‌ی سۆڤییێتی لە لێنینگراد ، ئیشی ئەم بەشە ، وتووێژکردن‌و رەخنەگرتن‌و راستکردنەوەی ئەو نامەزانستی‌یانەو ئەو کتێب‌و وتارو باسانەیە کە تایبەتن بە کوردناسی‌یەوە[٥١] .

بەشی کوردی‌ی پەیوەندی هەیە پسپۆرانی کوردناسی‌یەوە لە فەرەنساو بەلجیکاو هولاندەو ئینگلتەرەو چیکۆسلۆڤاکیاو ئێران‌و عێراق‌و ولاتانی تریشەوە . . هەروەها بە پسپۆرانی کوردناسی‌یەوە لە شارەکانی تری ولاتەکەماندا . . نامەیان بۆ دەنێرین‌و سەرچاوەو ئەدەبیاتی پەیوەندی‌دار بەکوردناسی‌یەوە دەگۆڕنەوە .

بەشەکە پێشوازی زانایان‌و ناودارانی کۆمەلایەتی ولاتانی رۆژئاواو رۆژهەلاتی ناوەراست دەکات . . دەبێ ئالێرەدا ئیشارەت بەو کارانەی بەشی کوردناسی‌ی بدرێ کە ناوبانگێکی گەورەیان بۆ خۆیان پچرێ ، نەك تەنیا لە ولاتەکەماندا بەلکو لە دەرەوەش‌دا .

ئەو باس‌و وتارە رەخنەییە تۆمارکراوانەی لە بارەی لێکۆلەرەوانمانن ، زۆر جێ‌ی رەزامەندین . . لەناو خاوەنی وتارە بلاوکراوەکاندا ، زانایانی ولاتەکەمان‌و بێگانەی دەرەوەی ولات‌و ناودارانی رامیاری کوری‌و رێکخراوە کۆمەلایەتی‌یەکانی تێدان .

ئێستاکەش میلاکی بەشی کوردناسین لەمانە پێك‌هاتووە : ق . ك . کوردۆییێڤ (سەرۆکی بەش) و ئی . ئی . تسوکەرمان (خانەنشین‌کرا) و خاتو . م . ب . رودێنکۆ (لە سالی ١٩٧٦ دا لە شاری لێنینگراد کۆچی‌دوایی‌کردو هەر لەوێ نێژرا)و خاتو ز . ع . یوسوپۆڤاو م . س . موسیلیان‌و ی . ئی . ڤاسیلیێڤا .

م . ب . رودێنکۆی لێکۆلەرەوە ، خەرێکی تەواوکردنی وەرگێران‌و بلاوکردنەوەی تێکستە رەخنەیی‌یەکانی چیرۆکی شیعری‌ی (یووسف‌و زولەیخا)ی سەلیم سلێمانی شاعیری کوردی (سەدەی حەڤدەم)ە .

ـ ى . فاسيليڤاش هێشتا خەریکی
ـ ـ ـ دووەم جزوبەندی کتێبی
ـ ـهـمه)ی مێژووناسی کورد
ـ ـحـنی بتلیسی‌یە (دووەم جزوبەندی
ـ ـتـیـی شەرەفخانی بتلیسی لە خانەی
ـ ـی) سەربەئەکادیمیای زانستی‌ی
ـ ـیـت دەرچوو ، کورتەی زنجیرەی
ـ ـه دێرینەکانی ئەدەبیاتی گەلانی
ـ ـلات، مۆسکۆ ۱۹۷٦ : ئەمە تێبینی
ـ ـف خەزنەدارە) .

ـ ـم ژ . س . موسیلیان تێکستە
ـ ـد ـوەکانی چیرۆکی شیعری‌ی میللی
ـ ـیـ فرۆش) وەردەگێڕی‌و
ـ ـ نەحەت ، ئی . ئی . تسوکەرمان لە
ـ ـبـموەی زمان‌و فۆلکلۆرو ئەدەبی
ـ ـ تورکمانستاندا کاردەکات . . بەلام
ـ ـ کوردۆیێڤ و خاتو ژ . یوسوپۆڤا
ـ ـهـنگێکی کوردی – رووسی دادەنێن
ـ ـر بنچینەی دیالێکتی سۆرانی (د .
ـ ـف خەزنەدار لەسەرەتای کارکردنیەوە
ـ ـمۆزگاکەدا وەك خوێندکارێکی
ـ ـنی بەرزو وەك لێکۆڵەرەوەیێکی
ـ ـنه ۱۹٦۰ – ۱۹٦۸) لە دانانی ئەم
ـ ـهـنگەدا بەشداری کردووەو چەند
ـ ـکی بۆ رێك‌خستوون – تێبینی
ـ ـەدار) .

ـ ـش کۆتایی پێ‌هێنانی ئەم بابەتە
ـ ـمەدارانە . . بەشەکە دەبەوێ
ـ ـت بداتە لێکۆڵینەوەی درووست بوون‌و
ـ ـەسەندنی زمانی نەتەوایەتی کوردی ،
ـ ـ پشکنینی جیاوە دێرینەکانی ئەدەبی
ـ ـسراوو وەرگێڕراوی گەلی کوردو
ـ ـرگێرانی سەرچاوە سەرەکیەکانی
ـ ـرەبی‌و فارسی‌و تورکی کە دەربارەی
ـ ـێژووی کوردن لەسەدەکانی
ـ ـوەراستدا . . هەروەها لێکۆڵینەوەی
مێژووی نوێ‌و هاوچەرخی میللەتی کورد .

بەلام لە مەیدانی زمانی کوردی‌دا ، لەسەر لێکۆڵەرەوە زانستی‌یەکانی بەشەکە پێویستە ، کە . لە لێکۆڵینەوەی درووست‌کردنی صەرف‌و نەحوی زمانی کوردی‌دا بەردەوام‌بن‌و فەرهەنگی تایبەتی جۆراو جۆریشی بۆ دابنێن ، وەك . (فەرهەنگی زاراوەکان ، فەرهەنگی وشە هاوتاکان ، فەرهەنگی وەسیطی کوردی . . هەروەها فەرهەنگی وشە تایبەتی‌یەکان بەو شاعیرو ئەدیبانەی کە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا ژیاون) و ئامادەکردنی باسی‌و لێکۆڵینەوەی کۆڵ‌و تەواو لە زانستی وتە سازی‌ی لە زمانی کوردی‌دا (کرمانجی‌و سۆرانی)و ، باسێك لەمەر بەبابەت‌کردنی دیالێکتە کوردی‌یەکان (سلێمانی ، کرماشانی ، گۆرانی ، زازایی‌و لوری)و لێکۆڵینەوەی زمانی ئەدەبی کلاسیکی کوردی‌و نووسینی چەند لێکۆڵینەوەیێك لەمەر شیعر لە سەدەکانی ناوەڕاستدا (زمانناسی‌ی) .

لە سالانی داهاتوودا . . لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەپێی ئەم ڕێنماییانەی خوارەوە دەبێ : بەردەوام بوون لە بلاوکردنەوەی ئەو دەستنووسە کوردی‌یانەی کە بەرهەمی بلاونەکراوەی شاعیرانی کوردی سەدەکانی ناوەڕاستی لە دووتوێ دان . . بە تایبەتی بلاو کردنەوەی دیوانە شیعری‌یەکانی کوردستانی خواروو (تێکستەکان ، وەرگێڕانیان ، تەعلیق لێدان ، لێکۆڵینەوە) و هەروەها بەردەوام بوون لە کارکردن‌دا بۆ کۆکردنەوەی سەرچاوەو کەرەستە بۆ لێکۆڵینەوەی چیرۆکی ڕۆمانتیکی کوردی «وەرەقەو گوڵشا» و «خورشیدو خاوەر» و «بارام‌و گوڵنام» و «شیرین‌و فەرهاد» و «ڕۆستەمی زاڵ» ، هی‌تریش . . (ناوچەکانی کەرەستە کۆکردنەوە : کۆمارەکانی پشت قەفقاس‌و ئاسیای ناوەڕاست) و . . لێکۆڵینەوەی مەسەلەی ڕەنگدانەوەی خەباتی ئازادی‌ی نەتەوەیی کوردلە بەرهەمی شاعیرانی کورددا‌و . . لێکۆڵینەوەی چیرۆکی ڕۆمانتێکی جوامێری‌یانەی میللی . . ، بلاوکردنەوەی پاکی تێکست‌و سایەکان ، لەگەڵ تەرجومە رووسی‌یەکانیاندا بە تەعلیق لێدانیان‌و پێشەکی بۆ نووسینەوەیان) و ، لێکۆڵینەوەی حیکایەتی میللی کوردی ، (بلاوکردنەوەی تێکست‌و سایەکان ، لەگەڵ تەرجومە رووسی‌یەکانیان‌داو بە تەعلیق‌و لێکۆڵینەوەوە) و ، چەند باسێك دەربارەی ئەدەبی کلاسیکی کوردی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا .

ئەوەی پەیوەندی بە مێژووی کوردیشەوە هەیە لێکۆڵینەوەی ئەو سەرچاوانەی بە زمانی فارسی نوسراون بەردەوام دەبێ ، وەك : «تەئریخ ئارای عەباسی» ، «تەئریخ دمبلی» هی عەبدولرەزاق دمبلی (سەدەی حەڤدەم) و «مێژووی حوکمدارانی ئەردەلان» کە لە سەرەتای سەدەی هەژدەمدا تۆمارکراوە . . ئەمەشیان بەردەوامێتی‌یە لەسەر بەشەکانی کتێبی «شەرەفنامە ، کە باسی حوکمدارانی ئەردەلان دەکات (دەستنووسەکە لە مۆزەخانەی بەریتانیادا پارێزراوە) . . لەبەر ڕۆشنایی ئەو سەرچاوانی ئیشارەتیان پێ دراو هەروەها سەرچاوەی تریش‌دا ، بەشەکە دەیەوی لێکۆڵینەوەیێك دەربارەی (کوردستان لە سەدەی شازدەم – سەدەی حەڤدەم)دا ئامادە بکات .

**پەراوێزەکان**

١ –ق . ك . کوردۆیێڤ ، کارەکانی پ . ئی . لێرخ لە بارەی کورد ناسی‌یەوە «لێکۆڵینەوەی مێژووی کوردناسی‌ی

رووسی» (هەڵبژاردە) مۆسکۆ ١٩٥٩ ، ل ٣٩ – ٥١ . هەروەها بگەڕێتەوە سەر «ئەرشیفکاری ئەکادیمیای زانستی سۆڤیێتی» مۆسکۆ – لێنینگراد ، بلاوکراوەی ٤ ، ١٩٤٠ ، ل ٢١٥ – ٢١٦ ، ٢١٩ – ٢٢٠ .

٢ – خاتو م . ب . رودێنکۆ . . وەسفی ئەو دەستنوسە کوردی یانەی لە لێنینگراد پارێزراون ، مۆسکو ١٩٦٢ ، لەگەڵ گەرانەوە بۆ وتاری رەخنەیی : م . ئیشتشانۆڤیچ ، گۆڤاری (ئەتنۆگرافیا) «هەنگاریا» ١٩٦٢ ، ژمارە ٤ .

3.M.Wolkow, Notice sur Louvrage persant intitule Scheref Nama accommpagnee de quelques reseignements sur son auteur,-JA, 1826,t. 8.P. 291-298.

4. Fr (aehn), Vorlaufiger Bericht uber eine neue bedeutenda Bereicherung des Orientalischen Manusecrioten-Apparts der Kais. Ak a d e m i c d e r Wissenschaften.Beilage zu N 11 der (St-Petersb. Zeitung) , 1826, Fr (aehn), Die Bibliothek aus der Scheich-Sefy-Moschee zu Ardebil,- (St-Petersb. Zeituny), 1829, No. 44, Dorn.As. Mus., P. 279-294,346-352.

٥ – پ . ئ . لێرخ ، لێکۆڵینەوە لە بارەی کوردی ئێرانو خالیدێکانی باشووری باووباپیرانیانەوە ، کتێبی دووەم ، سانتپیترسبۆرگ ١٨٥٧ ، ل ١ – ٤ .

6 E (Cata/ogue des manuserits et xylographes orientaux dela Bibliotheque impreriale publique de st.-Petersbourg), 1852,XLIV

,Dorn.As Mus.

7 E (Scheref-Nameh ou Histoire des Kordes,par Scherf prince de Bidlis), publee pour la premiere fois par eliaminof-Zernof, T.1-2, St. pbg., 1860-1862.

8 E (charmoy F.B.), Cheref-Nameh ou fastes de la nation kourde. par cherefou, ddine prince de Bidlis, dans l'lielet d' Arzeroume,.Trad. du persan et commentes par F.B. Charnoy, t. I-II, St. Pbg., 1868-1875.

9 E A.Jaba, Recueil de notices et recits kourdes..., St-Bdy.,1860. هەر هی ئەو Dictionnaire kurde-francais, St-Pbg.1879

١٠ – ئ . م . ئۆرانسکی سەرەتایێك بۆ چوونە ناو لێکۆڵینەوەی زمانناسیی ئێرانی ، مۆسکۆ ١٩٦٠ ، ل ٣٦٧ .

١١ – و . ی . لیڤۆتۆڤاو ف . ب . پورتوگال . . لێکۆڵینەوەی رۆژهەلاتیی ، لە بلاوکراوەکانی ئەکادیمیای زانستیی ١٧٢٦ – ١٩١٧ ، مۆسکۆ ١٩٦٦ ژمارەکانی ٨٢٥ ، ١٧٨٧ ، ١٣٣٥ ، ١٣٤٣ .

١٢ – دەروانرێتە «بیبلیۆگرافیای کوردناسیی» ئامادەکردنی ژ . س . موسلیان ، مۆسکۆ ١٩٦٣ .

١٣ – دەروانرێتە «تۆمارکراوەکانی بەشی رۆژهەلاتی کۆمەلەی شوێنەواری ئیمپراتۆریەتی رووس» سانت پیترسبۆرگ ، ١٩١٢ جزوبەندی ٢٠ ، ل ٩٩ – ١٥١ .

١٤ – سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٣٩ .

١٥ – سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٥٠ .

١٦ – هـ . ماکاش ، تێسکتی کوردی بە دیالێکتی کرمانجی لە ناوچەی ماردین ، لێنینگراد ١٩٢٦ .

١٧ – «جیاوی دێرینی چەرخی رۆستاڤیلی» لێنینگراد ١٩٣٨ ، پێشەکی ، ل ١ – ٢١ .

١٨ – «رۆژهەلاتی شورشگێر» مۆسکۆ – لینینگراد ١٩٣٣ ژمارە ٣ – ٤ ، ل ٢٩٢ – ٣٢٦ ، ژمارە : ٥ ، ل ١٥٩ – ١٧٣ .

١٩ – ل . ئا . خیتاگوروڤ ، جۆری جنس لە زمانە ئێرانێکاندا ، «تۆمارکراوە زانستییەکانی زانستگای لێنینگرادی میری» لێنینگراد ١٩٣٣ ژمارە ٢٠ بلاوکراوەی ١ ، ل ٥٠ – ٩٧ .

٢٠ – ع . شامیلۆڤ ، ق . ك . کوردۆیێڤ ، ئ . ئ . تسوکەرمان ، دەربارەی ئیزافە لە زمانی کوردیدا «شۆرش و نووسین» مۆسکۆ ١٩٣٣ ژمارە ١ (١٦) ل ٥١ – ٥٦ ، هەر ئەو دانەرانە ، لە بارەی مەسەلەی جنسەوە لە زمانی کوردیدا – «شۆرش و نووسین» کۆمەڵەی ١ مۆسکۆ – لێنینگراد ١٩٣٣ ل ١٦٠ – ١٧٨ .

٢١ – ف . ئابایێف ، دیسانەوە لە بارەی دۆزینەوە دواینەکان . «کێشەکانی زمانناسیی» مۆسکۆ ١٩٥٥ ژمارە ٥ ل ١٦٨ – ١٦٩ .

٢٢ – ق . ك . کوردۆیێڤ کورتەی رێزمانی زمانی کوردی ، یەریڤان ١٩٤٩ ل ١٠ – ٢٠ «بەزمانی کوردی» .

٢٣ – ئ . ئ . تسوکەرمان لێکۆڵینەوەی دەستووری زمانی کوردی ، موسکۆ ١٩٥٦ ل ٥ – ٥٦ ، هەروەها دەروانرێتە ق . ك . کوردۆیێف ، رێزمانی زمانی کوردی (کرمانجی) مۆسکۆ –

لێنینگراد ١٩٥٧ ل ٤٢ – ٥٢ .

24 – O. Mann Kurdisch-Persische Forschungen,Abt IV.Bd 111,Die Mandart der Mukri-Kurden.T.I, Grammatische Skizze. Verlin,1906, S.L1i

٢٥ – ئی . ئی . تسوکەرمان ، لێکۆڵینەوەی دەستووری زمانی کوردی ، کتێبی «زمانە ئێرانێکان» ، جزوبەندی ٢ مۆسکۆ – لێنینگراد ١٩٥٠ ل ٧٨ – ١٤٤ ، هەروەها دەروانرێتە : ق . کوردۆ ، رێزمانی زمانی کوردی (بە زمانی کوردی) ، ق . کوردۆیێف ، رێزمانی زمانی کوردی :

٢٦ – یوەبو . ئەڤالیانی ، راناو لە زمانی کوردیدا . . پوختەی دکتۆری‌نامە ، لێنینگراد ١٩٤٠ ، ق . ك . کوردۆیێف ، دارشتنی کرداری لێکدراو لە زمانی کوردیدا ، پوختەی دکتۆری نامە ، لێنینگراد ١٩٤٠ ، ئی : ئی . تسوکەرمان ، تەصریفی ناوی مەوصوف لە دیالێکتی کوردی ئەرمەنستانی سۆڤیێتدا ، پوختەی دکتۆری نامە ، لێنینگراد ١٩٣٩ .

٢٧ – ئارشێڤی ئەکادیمیای زانستی‌ی سۆڤیێت ، لقی لێنینگراد ، پەرەی ١٥٢ لیستەی ١ (١٩٥٩) ژمارە ٢ .

٢٨ – ق . ك . کوردۆیێف لەبارەی مەسەلەی دارشتن لەزمانی کوردیدا – کۆمەڵەی «کێشەکانی دەستوورو تیۆری لە زمانە رۆژهەلاتی‌یەکاندا ، مۆسکۆ – لێنینگراد ١٩٥٨ ل ١٠٩ – ١٤٢ . هەرهی دانەر خۆی ، دەربارەی دووبنچینەی دارشتنی و شەی لێکدراو لە زمانی کوردیدا ، «پوختەی هەواڵەکانی رۆژهەلاتناسی‌ی سەر بە ئەکادیمیای زانستی‌ی سۆڤیێت» مۆسکۆ – لێنینگراد ، بلاوکراوەی ٢٩ ، ١٩٥٩ ل ٦٥ – ٧٤ ، هەر هی ئەو ، زمانی کوردی – لە کتێبی «ئێرانی ئەمرۆ» مۆسکۆ ١٩٥٧ ل ٦٠ – ٧٥ . هەر هی ئەو ، تەصریفی بابەتی وزاتی کرداری تێپەر لە زمانی کوردیدا (لەبەر رۆشنایی سەرچاوەکانی هەردوو دیالێکتی کرمانجی‌و سۆرانی) مۆسکۆ ١٩٦٠ ل ٩ «بیست‌و پێنجەمین کۆنگرەی جیهانی‌ی رۆژهەلاتناسان ، نوێنەرانی یەکێتی سۆڤیێت» . هەر هی ئەو ، لە بارەی ماناو بەلگەو فرمانی پاشگری «– ك (– ە کە)» لە زمانی کوردی دا ، «لێکۆڵینەوە لە مێژووی کولتووری گەلانی رۆژهەلات» ، هەڵبژاردەکان ، بۆ رێزلێنانی ئی . ئا . ئۆربیلی ئەکادیمی ، مۆسکۆ – لێنینگراد ١٩٦٠ ، ل ٣٦١ – ٣٦٨ ، هەر هی ئەو ، پاشگرەکان لە زمانی کوردیدا «پوختەی هەواڵەکانی ئامۆژگای گەلانی ئاسیایی سەر بە ئەکادیمیای زانستی‌ی سۆڤیێت ، «مێژوو و زمانناسی‌ی» مۆسکۆ ١٩٦٣ ژمارە ٦٧ ل ٣١ – ٣٧ وچەند کارێکی تریش .

٢٩ – ق . ك . کوردۆیێف ، رێزمانی زمانی کوردی (کرمانجی) وتارێکی رەخنەیی ج . خ . باکایێف «رۆژهەلاتناسی‌ی سۆڤیێتی» (گۆڤار) مۆسکۆ ١٩٦٠ ژمارە ٤ ل ١٧٨ – ١٨١ هەروەها دەروانرێتە : مەحموود یاردی ، زانایانی کوردی سۆڤیێت خزمەتی گەلەکەیان دەکەن – «سەربەستی» ٢٥ ی تشرینی یێکەم ١٩٥٧ (بە زمانی عەرەبی) . Lescot Quelgues remarques sur les travaues philologie Kurd,-(L'Afrique et I'Asie), Paris 1960,No. 51.

٣٠ – ق . ك . کوردۆیێف ، فەرهەنگی کوردی – رووسی ، مۆسکۆ ١٩٦٠ ، وتارێکی رەخنەیی دەربارەی فەرهەنگی کوردی – رووسی (سەر وتاری رۆژنامە ناوچەیی‌یەکە ، بە زمانی ئازەربایجانی ، «لێنین لە پێناوی ژیان دا» ١٩٦٠ حوزەیران) و ، جەلیلوف ، ئیزافەیێکی بەرهەمدار لە کوردناسی‌ی سۆڤیێتی دا – «کۆمۆنیست» (رۆژنامە) ١٦ مایس ١٩٦٣ یەریڤان .

٣١ – ق . کوردۆیێف ، رێزمانی زمانی کوردی (بەکوردی) ، هەروەها ، رێزمانی زمانی کوردی ، یەریڤان ١٩٥٦ (بە کوردی) ، هەروەها ، رێزمانی زمانی کوردی ، یەریڤان ١٩٦٠ .

٣٢ – ق . ك . کوردۆیێف ، زمانی کوردی ، مۆسکۆ ١٩٦١ .

٣٣ – ئی . ئی . تسوکەرمان ، لە بارەی هەندێ تەصریف لەسەر دووەم دەستوور لە زمانی کوردیدا – «زمان و بیر» هەڵبژاردە ، لێنینگراد ، جزوبەندی ، ١١ ، ١٩٤٨ ل ٣٦٤ – ٣٧٥ ، هەروەها ، لێکۆڵینەوەی دەستووری زمانی کوردی ، کۆمەڵەی «زمانە ئێرانێکان» جزوبەندی ٢ ، ١٩٥٠ ل ٧٨ – ١٤٢ ، هەروەها ، لێکۆڵینەوەی دەستووری زمانی کوردی ١٩٥٦ ل ٥ – ٥٦ ، (کارەکانی ئامۆژگای زمانناسی‌ی سەر بە ئەکادیمیای زانستی‌ی سۆڤیێت» مۆسکۆ ، جزبەندی ٦ .

٣٤ – ئی . ئی . تسوکەرمان ، لێکۆڵینەوە لە دەستووری زمانی کوردی ، چەشنەکانی کردار لە دیالێکتی کرمانجی دا ، مۆسکۆ ١٩٦٢ .

٣٥ – ئی . ئی . تسوکەرمان لە بارەی پەیدابوونی پشتاوپشتی‌یێکەی ئیشارەت‌دان بە کاتی ئێستاو داهاتوو لە زمانی کوردی دا ، (رۆژهەلاتناسی‌ی سۆڤیێت» (گۆڤار) مۆسکۆ ١٩٥٩ ، ژمارە ٢ ل ١٤٢ –

١٥٥ ، هەروەها ، لە بارەی صیغەکانی ڕستەوە کە مانای پاڵپشتدراو لە زمانی کوردیدا هەڵدەگرن – «کۆمەڵەی فەلەستینی» بلاٌوکراوەی ١٣ (٧٦) .١٩٦٥ ل ١٦٠ – ١٦٥ ، هەروەها لە بارەی (تعلیل) ی دەستووری بابەتکردنی کردارە نا قیاسیەکان لە زمانی کوردیدا – «ڕۆژهەلاٌتناسیی سۆڤیێتی» (گۆڤار) مۆسکۆ ١٩٦١ ژمارە ١ ل ١٤٧ – ١٤٩ هەروەها ، لە بارەی ڕوونکردنەوەی کرداری تێپەڕ لە زمانی کوردیدا (دیالێکتی کرمانجیی) – «کۆمەڵەی فەلەستینی» بلاٌوکراوەی ٢ ، ١٩٦٤ ل ٣٤ – ٣٩ ، هەروەها ، شوێنی وشەی پێشخراو لە دروستکردنی بێژەی جیاواز دا (اللفظ المتباین) – «کۆمەڵەی فەلەستینی» بلاٌوکراوەی ٧ ، ١٩٦٢ ل ١٥٩ – ١٦١ و چەند کارێکی تریش .

٣٦ – ج . خ . باکایێف ، دیالێکتی کوردی تورکمانستان ، مۆسکۆ ١٩٦٢ ل ٣ – ٢٧٠ ، هەروەها زمانی کوردی ئازەربایجانی ، مۆسکۆ ١٩٦٥ ل ٥ – ٢٨٢ .

٣٧ – ئەحمەدی خانی ، مەم وزین (چیرۆکی شیعری) ، تێکستی ساغکراوە ، وەرگێڕانو پێشەکیو ئیندێکس بۆ نووسینی م . ب . ڕودێنکۆ ، مۆسکۆ ١٩٦٢ ، مەلا مەحموودی بایەزیدی «عاداتو ڕسووماتنامەی ئەکرادیە» وەرگێڕانو پێشەکیو تەعلیق نووسینی م . ب . ڕودێنکۆ ، مۆسکۆ ، وتارێکی ڕەخنەیی م . ئەشتڤانۆڤیچ ، لە گۆڤار ، «ئەتنۆگرانیا» دا ١٩٦٤ ژمارە ٢ . فەقێ طەیران «شێخی سەنعان» تێکستی ساغکراوە ، وەرگێڕانو تەعلیقو پێشەکی نووسینی م . ب . ڕودینکۆ ، مۆسکۆ ١٩٦٢ ، حارسی بتلیسی ، لەیلو مەجنوون ، وەرگێڕانو پێشەکیو تەعلیق بۆ نووسینی م . ب ڕودێنکۆ ، مۆسکۆ ١٩٦٥ . هەر هی ئەو ، دەربارەی کێشەیێك لە ئەدەبی کوردیدا «لێکۆڵینەوەی مێژووی کولتووری گەلانی ڕۆژهەلاٌت» ، هەڵبژاردەکان ، بۆ ڕێزلێنانی ی . ئا . ئۆربیلی ئەکادیمی ، مۆسکۆ – لێنینگراد ١٩٦٠ ، ل ٤٣٣ – ٤٤٠ ، هەروەها دەروانرێتە ، ڕاپۆرتو وتارە ڕەخنەییەکانی ڕۆژنامەی «ڕیا تازە ، ژمارەکانی : ١٠٤ (١٣٣٢) ، ٦٤ (١٧٠٨) ، ٨٦ (١٧٣٠) ، ١٨ (١٨٧٠) .

٣٨ – «زمانە ئێرانێکان» ، جزوبەندی ٢ ، ١٩٥٠ ل ٢٩ – ٦٠ .

٣٩ – ني . ی . تسوکەرمان ، سێ حیکایەتی کوردی – «لێکۆڵینەوە لە مێژووی کولتووری گەلانی ڕۆژهەلاٌت» ل ٤٩٢ – ٥٠٣ .

٤٠ – «گۆرانیو حیکایەتە داستانەییە کوردێکان» مۆسکۆ ١٩٦٢ .

٤١ – «حیکایەتی کوردی» مۆسکۆ ١٩٥٩ .

٤٢ – «پەندی پێشینانو قسەی نەستەقی کوردی» هەڵبژاردەی «پەندی پێشینانو قسەی نەستەقی گەلانی ڕۆژهەلاٌت» . مۆسکۆ ١٩٦١ ل ٣٣٠ – ٣٤٠ .

٤٣ – شەرەف خانی بتلیسی ، شەرەفنامە ، جزوبەندی ١ مۆسکۆ ١٩٦٧ .

٤٤ – ج . جەلیلۆڤ : بزوتنەوەی ئازادیی نەتەوەیی کورد لە ساڵی ١٨٨٠ دا ، مۆسکۆ ١٩٦٦ .

٤٥ – ق . کوردۆیێف ، بە هەڵەبردنی مێژووی کورد لە ئیستۆریوگرافیای بۆرژوای فارسیدا «تۆمارکراوە زانستییەکانی زانستگای لێنینگرادی میری» لێنینگراد ، بلاٌوکراوەی ٤ ، ١٩٥٤ . ژمارە ١٧٩ زنجیرەی زانستیی ڕۆژهەلاٌتناسی ، ل ١٢٠ – ١٣٧ .

٤٦ – دەروانرێتە «گەلانی ئاسیای نزیك» مۆسکۆ ١٩٥٧ ل ٢٤٢ – ٢٦٠ .

٤٧ – ع . مەمەد نزارۆڤ ، کوردی تورکمانستان «پوختەی دکتوری نامە» مۆسکۆ ١٩٥٤ .

٤٨ – ق . ك . کوردۆیێف ، خ . ئابۆڤیان ، وەك پسپۆڕێك لە لێکۆڵینەوەی کوردیو ئەتنۆگرافیادا – «هەواڵەکانی ئەکادیمیای زانستیی لە ئەرمەنستانی سۆڤیێت» زنجیرەی زانستیی کۆمەلاٌیەتی ، ١٩٥٥ ژمارە ٢١٠ ل ٨٩ – ٩٨ ، هەر هی ئەو ، خ . ئابۆڤیان ، وەك پسپۆڕێك لە لێکۆڵینەوەی کوردیدا و وەك لێکۆڵەرەوەیێك – «لێکۆڵینەوە لە مێژووی ڕۆژهەلاٌتناسیی ڕووسیدا» هەڵبژاردەکان ، مۆسکۆ ، بەشی دووەم ١٩٥٦ ل ٣٦٠ – ٣٨٠ ، ق . ك . کوردۆیێف ، کارەکانی پ . لێرخ ، لە بواری کوردناسیدا «لێکۆڵینەوە لە مێژووی ڕۆژهەلاٌتناسیی ڕووسیدا» بەشی چوارەم ١٩٥٩ ل ٣٩ – ٥١ . هەر هی ئەو ، ی . ئا . ئۆربیلی ، وەك پسپۆڕێك لە کوردناسیدا ، – «کارەکانی ی . ئا . ئۆربیلی ئەکادیمی لە کوردناسیدا .

٤٩ – ق . ك . کوردۆیێف «گەشەسەندنی کوردناسیی سۆڤیێتی ، «نوسراوە زانستییەکانی ئامۆژگای ڕۆژهەلاٌتناسیی سەر بە ئەکادیمیای زانستیی سۆڤیێت» مۆسکۆ – لێنینگراد ، جزوبەندی ٢٥ ، ١٩٦٠ ل ٥٧ – ٦٧ ، هەرهی ئەو ، سەرکەوتنی کوردناسیی سۆڤیێتی ، – «کومۆنیست» ڕۆژنامە) ، یەریڤان ٦ ی تشرینی یێکەم ١٩٥٩ ، ق . ك کوردۆیێف ، ڕەخنە لیگرتنی بیروباوەڕە

کۆمەلایەتیەکان بەرامبەر زمانی کوردی ، لاوکراوەی ۱۲ ، ۱۹۵۵ ل ٤٣ – ٦١ .

لەم وتارەدا نووسەر رەخنە لە راو بۆچوونەکانی ن . ی . مارو ، ب . ف . مینەرو ، و . ل . ڤیلچێڤسکی دەگرێت دەربارەی گەلی کورد ، کە رایان وایە ، ئەم گەلە لە چەند تیرەو هۆزێکی گەلانی جۆراو جۆری تر پێك‌هاتبن‌و بە زمان‌و دیالێکتی جۆراو جۆر دەدوێن‌و دەچنەوە سەر چەند کۆمەڵە زمانێکی جیا جیا ، ئەم جۆراو تەسەوراتە چەوت‌و چەوێلانە لە دوانیدا لە کتێبی و . ل . ڤیلچێڤسکی‌دا «کورد – سەرەتایێك بۆچوونە ناو مێژووی ئازادی میللەتی کورد» ۱۹٦۱ ، رەنگی داوەتەوە .

٥٠ – ئەوانەی لە بەشەکەدا خوێندنیان . تەواوکردو ، وتووێژی نامەکانیان بەسەرکەوتووی کرا ئەمانەن :

سەیید عەزیزی شەمزینی «بزووتنەوەی ئازادی‌ی نەتەوەیە گەلی کورد ۱۹٤٠ – ۱۹٤٦» (۱۹٥۹) ، جەلیلی جەلیلۆڤ ، بزووتنەوەی ئازادی‌ی نەتەوەیی کورد سالی ۱۸۸۰ ، (۱۹٦٤) ، مەمەد نزارۆڤ ، کوردی تورکمانستان ، ۱۹٦٤ ، ئی ، ئا . سمیرنۆڤا ، دارشتنی فرمانی لێکدراو لە زمانی کوردی‌دا ، (سۆرانی) ۱۹٦۳ ، ئۆردیخانی جەلیلۆڤ ، داستانی جوامێریانەی کوردی «خانی لەپ زێرین – دمدم» ۱۹٦۱ ، ك . ئەیوبی ، بەرهەمی شاعیری کورد ، هەژار (۱۹٦۲) ، کاوس قەفتان ، راپەرینی بارزانی‌ی ، ۱۹۰۰ – ۱۹٤٥ ، لاپەرەیێکی پرشنگدار لە خەباتی ئازادی‌ی نەتەوەیی گەلی کورد لە کوردستانی عێراق‌دا ۱۹٦۳ ، مارف خەزنەدار ، مێژووی ئەدەبی کوردی (۱۸۹۰ – ۱۹٦۰) (۱۹٦۳) . ز . أ . یوسوپۆڤا ، پاشگرو پێشگر لە زمانی کوردی‌دا (سۆرانی) ۱۹٦٥ ، مەکسیمی خەمۆ ، دیالێکتی کوردی بادینان (عیراق) ۱۹٦٥ .

٥۱ – چەند راپۆرتێکی رەخنەیی نووسراو ، وتووێژشیان لەسەر کرا ، بە تایبەتی کتێبی . ن . ئا . خالفین ، خەبات (بەربەرەکانێ) لە رێی کوردستان‌دا ، م . س . لازارێڤ ، کوردستان‌و کێشەی کورد ، دکتۆری نامەی سەعید ئەحمەد بارزانی‌و ڤ . ئی . باکلان ، خەباتی گەلی کورد لە پێناوی مافە رەواکانی‌دا ، دکتوری نامەی ئەحمەد عوسمان ئەبو بەکر ، بزووتنەوەی نیشتمانی‌ی ئازادیخوازانەی گەلی کورد لە ۱۹۰۰ تا ۱۹۲٥ ، نامەی حەسەن کورد ئۆغلی ، بەرهەمی شاعیری هاوچەرخی کورد عەبدوڵلا گۆران ، دکتۆری نامەی ئیحسان فوئاد ، بەرهەمی شاعیری کورد حاجی قادری کۆیی‌و شوێن‌و پایەی لە ئەدەبی کوردی‌دا (سەدەی نۆزدەم) ، دانراوی یاریدەدەری پرۆفیسۆر لە زانستگای سەمەرقەند ، یو . یو . ئەڤالیانی ، لێکۆڵینەوەیێك لە بواری کرداری لێکدراوو رستەی کردار لە زمانی کوردی‌دا وهی تریش . .

٥۲ – رەحیمی قازی ، لە بارەی بارو ئەرکی کوردناسی‌ی سۆڤێتی‌یەوە ، – هەواڵەکانی ئازەربایجانی سۆڤێتی» زنجیرەی زانستی‌ی کۆمەلایەتی ، باکۆ ۱۹٥۰ ژمارە ۲ ل ۱۳۱ – ۱٤۲ .

Tomas Bois,Remarques Critiques sur la nomenclature grammaticie Kurde,-(Bibliotheca Orientalis, (Leiden), 1960,no 314,p.152-160

هەر هی ئەو

Etudes recentes de philologie kurd, 1960.No. 1/2,p. 10-14

هەر هی ئەو

Bulleten raisonne de philologie kurd,-Al-masriq LX 111, Begrout, 1964, p. 16-25.

هەمان سەرچاوە بە زمانی عەرەبی .

زانیاری ئەوتۆش هەیە کە زیاتر پەسەند دەکرێ‌و هەواڵی وردو تەواوی لە بارەی سەرکەوتن بەدەستهێنانی پسپۆرە لێنینگرادی‌یەکانەوە تێدایە لە کوردناسی‌ی‌دا ، لە وتارەکانی ئا . بینینگین‌دا .

(Kurds et Kurdologie en Union Sovietique) (cahers du monde Rosse et Sovietique (Paris), 1960 t. 111,p.513-530.

هەروەها لە وتاری :

Moh.Mokri, Kordologie et enseignemet de la langue Kurde en SSSR,-L'Ethnographie, Revue de la societe d'ethnographie de Paris, annee 1963, p.71-105.

لەوتاری ج . خ باکایێڤیش‌دا ، مێژووی لێکۆلینەوەی زمانی کوردی لە رووسیاو یەکێتی سۆڤێت‌دا – «لێکۆڵینەوە لە مێژووی باسی زمانە ئێرانێکان» مۆسکۆ ۱۹٦۲ ل ۱۰۰ – ۱۱۷

**ئەم وتارە لە کتێبی «مێژووی رۆژهەلاتناسی‌ی عەرەبناسی‌و کوردناسی لە مۆزە خانەی ئاسیایی‌و ئامۆزگای رۆژهەلاتناسی‌ی لێنینگراددا» وە وەرگێرراوە کە دکتۆر مارف خەزنەدار لە زمانی رووسی‌یەوە وەری‌گێراوەتە سەرزمانی عەرەبی‌و تەعلیق‌و پێشەکیشی بۆ نووسیوە . . (۳۸۸) لاپەرەیەو لە چاپخانەی (المعارف) لە بەغدا لە چاپدراوە ، سالی ۱۹۸۰ . . ئەم بەشەی کتێبە کە لە لاپەرە ۲۳۷ وەیە تا لاپەرە ۲٦٥ .**

تاريخ الاستشراق والدراسات العر ١٢ ٧٩

# پەیوەندی نێوان کۆمەڵ و رۆشنبیری

انور نجم الدین
ئامادەی کردووە

کۆمەڵ بەشێکە لە بەشەکانی جیهانی ماددی و لە یەکێتی‌یەکی عضوی کۆمەڵایەتی پێک‌هاتووە . . . وە لەگەڵ پەیوەندی و کارتێکردنی ئاڵۆگۆڕی دا لەگەڵ سروشت‌دا ئەو دیاردە کۆمەڵایەتی‌یانەی بەخۆ گرتووە وەک سیفەتێکی تایبەتی بەخۆی لە سروشتی بێ‌گیانی و جیهانی گیان‌لەبەری جیائەکاتەوە ، کە یەکێ لەو دیاردانەش «رۆشنبیری کۆمەڵایەتی»یە . رۆشنبیری دیاردەیەکی تایبەتی‌یە بە کۆمەڵ و لەگەڵ بوونی مرۆڤ‌دایە . . . واتە لە پێش مرۆڤ‌دا رۆشنبیری نەبووە . . بەڵام رۆشنبیری تێگەیشتنێکی فراوانی هەیەو ئەتوانرێت لەگەڵ تەواوی قەوارەی کۆمەڵ‌دا بەراوورد بکرێت ، چونکە هەر لایەنێکی چالاکی‌یەکانی مرۆڤ یان ژیانی کۆمەڵایەتی بگرین ، ئەم یان ئەو رەگەزەی رۆشنبیری لە خۆی ئاڵاندووە ، وە پێویستی‌ی بەراوورد کردنی رۆشنبیریش لەگەڵ کۆمەڵ‌دا بۆ ئەوە کە شی کردنەوەیەکی تێئۆری گشتی بەدەست بهێنێت دەربارەی رۆشنبیری و دەوری لە چالاکی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکانی مرۆڤ‌دا .

بۆ دەرخستنی واتای رۆشنبیری پێناسەی هەمەچەشنە هەیە . . . بەڵام ئەتوانرێت لەرووی گشتی‌یەوە ، رۆشنبیری بە تێگەیشتنێک لە تێگەیشتنەکانی رۆزگاری نوێ و بەشێک لە زانستەکان دابنرێت ، ئەگەرچی چالاکی‌یەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی هەمیشە بەم یان بەو شێوە ، رۆشنبیری وەک گرنگترین مەسەلەیەکی کۆمەڵایەتی

دێنێتە ناوو پێویستی شیکردنەوە وەك دیاردەیەکی تایبەتی ئەبینێ ، چونکە رۆشنبیری تێگەیشتنێکە لەو تێگەیشتنانەی کە سۆسیۆلۆژیا «علم الاجتماع» بەهۆیەوە چالاکی یەکانی مرۆڤ و ئاستی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی هەڵئەسەنگێنێ .

تەواوی بوون دابەش ئەکرێت بە دوو دەستە لە دیاردەکان ، دیاردەکانی سروشت و دیاردە رۆشنبیری یەکان ، کەواتە بەکارهێنانی «رۆشنبیری» لەبری تێگەیشتنی کۆمەڵ و بۆ جیاکردنەوەی لە جیهانی ئاژەڵ و نیشانەیەکی جیاوازو سەرەکی شێوازی بوونی مرۆڤە . وە هەر بەم مانایە جیاوازی نێوان دوو دەستە لە دیاردەکان «سروشت و رۆشنبیری» ، جیاوازی یە لەنێوانی کردە خۆبەخۆکانی سروشت و کردەی ئەو چالاکی یانەی کە ئەنجامی چالاکی یەکی هوشمەندانەو داهێنەرانەو نیشانکردی مرۆڤە . کەواتە دروستە ئەگەر بڵێت : رۆشنبیری پاشکۆی مێژووی کۆمەڵە بەکارهێنانی تێگەیشتنی رۆشنبیری ، ئیتر لە قسەی ئاسایی یان زانستدا ، بەو واتایەی کە بریتی بێت لە تەواوی سەرئەنجامی چالاکی یە داهێنەرەکانی مرۆڤ ، مانایەکی تەواو ئەبەخشێ . بەڵام بە مەرجێك بەکارهێنانی ، بەرەنگاری کردنی سروشت نەبێت بە کۆمەڵ . واتە سەرنج لە سروشت سەرنجێکی ماتریالیزمیانە بێت و بەڵام سەرنج لە کۆمەڵ سەرنجێکی ئایدیالیستانە بێت .

بەڵام ئەم تێگەیشتنەیش دەربارەی رۆشنبیری ، هێشتا هەر تێگەیشتنێکی گشتی یە . چونکە شتی پێویست لێرەدا دەرخستنی رۆشنبیری و پەیوەندی یەتی لەگەڵ کۆمەڵدا .

هەندێك لە دانەرەکان بە مانایەکی تەسك رۆشنبیری تەنیا بە داهێنانێکی روحی ، واتە زانست و هونەرو . . . هتد ئەزانن . بەڵام لە راستی دا ئەم پێناسەیە جیاوازە لە تێگەیشتنی فراوانی رۆشنبیری کە سەرئەنجامی هەموو چالاکی یەکانی مرۆڤ ئەگرێتەوە «چ مادی و چ روحی» .

جیاکردنەوەی رۆشنبیری مادی لە رۆشنبیری روحی شتێکی نسبی یە هەموو بەرهەمێکی مادی کە دەستکردی مرۆڤ بێت ، لەپێش دا وەك (بیر) وەك داهێنانێکی روحی مرۆڤە ، چونکە داهێنانی روحی رەگەزێکی پێویستە لە چالاکی یە مرۆڤایەتی یەکان . بەڵام بێگومان بۆ ئەوەی هەر «بیر»ێك بێتە دیاردەیەك کە کارێکی کۆمەڵایەتی بگرێتە ئەستۆ . . ئەوا پێویستە «شێوە» یەکی ماددی بپۆشێت . . ئیتر چ لە زمان یان کتێب یان تابلۆیەك و کەرەسەیەك و . . . هتد .

کەواتە ناتوانین تێگەیشتنی رۆشنبیری تەنها لە رۆشنبیری روحی دا بەندبکەین ، چونکە هەردوو بەرهەمی رۆشنبیری ماددی و روحی ئەنجامی چالاکی یە مرۆڤایەتی یەکانن و هەردووکیان لایەنی هاوبەشیان هەیە لە کۆمەڵدا .

بۆ نموونە : کەرەسەکانی بەرهەمهێنان بەرهەمێکی ماددی یەو بە ئەرکێکی کۆمەڵایەتی ئێجگار گەورە لە ئەرکەکانی هێزەکانی بەرهەمهێنەر هەڵئەسێ . وە بەکارهێنانی کەرەسەکانی بەرهەمهێنانی تەواوی رەگەزە رۆشنبیری بە ماددی یەکانی تری وەك «کەرەسەی کار رێگاوبان . . جل و بەرگ . . هتد» هەمیشە هۆیەکن بۆ نوێکردنەوەی ئەو بەرهەمە ماددی یانەی کە بەردەوام کۆمەڵ پێویستێتی . . ئەمەش لەپێناوی مانەوەی کۆمەڵدا .

وە زانستیش بۆ نموونە کە بەرهەمێکی رۆشنبیری روحی یە ، لایەنێکی تری بەرهەمە کۆمەڵایەتی یەکان پێك ئەهێنێ و پێویستی یەکی فکری بوونی کۆمەڵە . کەواتە لە کاتێکا کە لە کۆمەڵدا بەردەوام کردەی دروستکردن و بڵاوکردنەوەو دابەشکردنی بەرهەمی چالاکی یە ماددی و روحی یەکان دووپات ئەبێتەوە . . هەر لەو کاتەدا بەردەوام دەسکەوتی بەرهەمە ماددی یەکان هەمیشە لە نوێبوونەوەدان ، ئەمەش بە مەبەستی «استهلاك» کردنیان . وە ئەمە لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا شێوەی شت وەکی بازاری «بضاعة» وەرئەگرێت کە لە رێگای بازرگانی یەوە دابەش ئەکرێت . بەڵام دەستکەوتی بەرهەمە روحی یەکان لە رێگای سیستەمی پەروەردەو فێرکردن و راگەیاندنەوە بڵاوئەکرێتەوە .

هەر بۆیە سەیر نی یە کە برجوازی یەتیش بەردەوام هەوڵ ئەدات کە بەرهەمە روحی یەکانیش ملکەچی یاساکانی گەشەسەندنی سەرمایەداری بکات . وە هەر ئەمەیشە کە ناکۆکی چینە

کۆمەڵایەتی یەکان لە کۆمەڵگا جینایەتی یەکاندا مەیدانی بەرهەمە رۆحی یەکانیش ئەگرێتەوەو ناوەڕۆکی رۆشنبیری فیکری مۆرکێکی چینایەتی ئەگرێتە خۆ.

کارتێکردنی ئاڵوگۆڕی نێوان زاتو رۆشنبیری :

جیابوونەوەی مرۆڤ لە جیهانی ئاژەڵو دروستبوونی یەکێتی یەکی ، کۆمەڵایەتی ، خۆی لە خۆیدا بەستراوە بە دەرکەوتنو گەشەسەندنی شێوازە تایبەتی یەکانی مرۆڤەوە لە چالاکی یەکی هۆشمەندانەدا . . کە بەبێ ئەمەنەبوونی کۆمەڵو نە پێشکەوتنی بەدی نایەت ، هەر بۆیە کارلێکردنی ئاڵوگۆڕی بەردەوامی نێوان زاتو رۆشنبیری مەرجێکە لە مەرجەکانی چالاکی کۆمەڵو گەشەسەندنی .

چەشنی پەیوەندی یە مرۆڤایەتی یەکان – پەیوەندی ئابووری و سیاسی – پەیوەندی ناو چینێكو نێوان چینەکان – پەیوەندی یەکانی ناوەوەو دەرەوە – پەیوەندی خێزانداریی و گوزەرانو . . هتد . . هەمیشە هەموو مرۆڤێك وەك تاکە کەس «فرد» رووبەرووی بە پێویست بینینی راهاتن «تکیف» ئەکاتەوە لە دیاری کردنی هێڵی رەفتارو گالاکی یەکانی دا بەپێی ئەو شێوازە تایبەتی یەی کە رەووشتو خوونەریتی دەستەیەك لە خەڵکی دیاری کراو بە خۆی ئەگرێت بەڵام ئەمە مانای رۆشنبیری تاکە کەسی ناگەیەنێ . . بەڵکو لەمەدا مەبەست لە رۆشنبیری کۆوەڵە . وە یان مەبەست لە خەڵکی ئەو کۆمەڵەو رۆشنبیری یە گشتی و هاوبەشەکەی و لەوانەیش دا رۆشنبیری نموونەیی فرد لە کۆمەڵدا .

شێوازەکانی کارکردنو مۆرکی رەفتاری خەڵکی ، هەمیشە لە رێگای رۆشنبیری یەوە شێوەی هەمەچەشنەی رەفتاری کۆمەڵایەتی پێکتەهێنێ ، کە ئەویش بەردەوام لە نەوەیەکەوە ئەگوێزرێتەوە بۆ نەوەیەکی ترو نەوەکانی داهاتوو ئەبنە میراتگری ئەو نەریتو رەفتارانە بۆ نموونە لە هەموو کۆمەڵێك دا بەبێ جیاوازی : دایك منالەکەی ئەپێچێتەوە . . خەڵکی خواردن ئامادەئەکەن . . دۆستو ناسیار لە بەیەك گەیشتن سلاو لەیەك ئەکەن . . کارئەکرێتو پشوو ئەدرێت . . ئاهەنگ ئەگێردرێتو جەژن ئەکرێت ، ئەویش بەپێی مۆرکی ئەو رۆشنبیری یە کۆمەڵایەتی یە تایبەتی یەی کە لەم یان ئەو کۆمەڵەدا سەرووەرێتی وەرگرتووە .

وە لە بواری چالاکی روحی دا دووبارە نموونەی تایبەتی هەیە بەم لایەنەش . . با بڵێین لە کاتێکا کە بەرهەمێکی هونەری هەڵئەسەنگێنین تەنیا سەرنجی توانای داهێنەرانەو بهرەی هونەرمەندەکە نادەین ، بەڵکو دووبارە سەرنجی رۆشنبیری یە گشتی و پیشەیی یەکەیشی ئەدەین .

بۆ نموونە : گۆرانی بێژێك دەنگێکی خۆشی هەیە . . بەڵام تەنیا ئەمە مەبەست نیە ، بەڵکو پێویستە بزانین ئەو گۆرانی بێژە خاوەنی کام قوتابخانەیە ، واتە رۆشنبیری یە هونەری و پیشەیی یەکەی .

وە یان لە رۆشنبیری یەکا کەوتبێتە بەر کارتێکردنی بەرهەمێکی هونەری تر . . هەمیشە جەماوەر سەرنجی کردەی داهێنەرانە ئەدات لەو بەرهەمە هونەری یەدا کە خۆی لە خۆی دا رەنگدانەوەی کارەساتو دیاردەکانی بەرهەمێکی هونەری ترە . ئەمە ئەوە دەرئەخات کە ئەو بەرهەمە هونەری یە . . یاوە یان (بەرهەمە هونەری یەکان بەگشتی) پەیکەرێکی داتاشراوی رۆشنبیری رابوردوو نی یەو بەس ، بەڵکو دووبارە وەك رەگەزێك لە رەگەزەکانی رۆشنبیری ئێستا ، بیرو هەستی نەوەکانی نوێی بەخۆ گرتووە .

وە سەرەڕای ئەمانەش زۆر جار رۆشنبیری مۆرکی زمانێك یان رەفتارێکی رەمزی ئەگرێتە خۆ ، واتە ئەبێتە هەڵگری چەند مانایەکی رەمزی لە دەربڕینی شتێکی تایبەتی دا .

وە لە لایەکی ترەوە ، رەفتاری مرۆڤ شتێکی رەمزی تایبەتی یە بە مرۆڤەوە بە پێچەوانەی هەڵس وکەوتی ئاژەڵەوەیە کە چەشتێکە لە رەنگدانەوە .

وە بەم چەشنە رۆشنبیری دیاردەیەکە لە دیاردە کۆمەڵایەتی یەکانو لە کۆمەڵ جیاناکرێتەوە ، بەڵکو بەرهەمی کۆمەڵ خۆیەتی و وەك سیمایەکی تایبەتی بەخۆی ، وەسفی تێکڕای چالاکی یەکانی مرۆڤ ئەکاتو شێوازی بیرکردنەوەو توانای سەرکەوتنی بەسەر جیهانی ئاژەڵدا دەرئەخات .

# ئەو گۆڕانکاری یە سەرەکی یانە
# سیستەمی بڵاو

بەشی یەکەم



# کاردەکانە سەر دنەوە لە جیهان

نووسینی : د. ابراهیم الداقوقی
گۆڕینی : کمال غەمبار

**یەکەم : سەرەتا**

ڕاگەیاندن بە دیوی تری سیاسەت دادەنرێ. لێرەدا پەیوەندیی بیردۆزەو سیستەمەکانی ڕاگەیاندن بە ڕێبازو سیستەمە سیاسی‌یەکانەوە ، لە لایەنی کارتێکردن‌و کارتێکراو پەیوەندی‌یەکی توندو پتەوە ، بەتایبەتی پاش‌ئەوەی کە تێکۆڵینەوەکانی ڕاگەیاندن پەلیان لێ‌بۆوەو بیروڕای سیاسی نوێ ، پێشکەوتنی‌یان بە خۆوە دی .

بیردۆزەی ڕامیاری دەوڵەتی نوێ ، ئایدیای دەوڵەتی خەباتگێڕ لە دەوڵەتی نا خەباتگێڕ جیادەکاتەوە[1] ، دەوڵەتی خەباتگێڕ ئەو دەوڵەتەیە کە بڕوای بە بیروڕایەکی ڕامیاریی دیارکراو هەیە ، کە لە ڕێگەیەوە هەوڵی ئەوە دەدات بەپێی نەخشەی قۆناخ‌کاریی نەگۆڕ ، کۆمەڵ پێش‌بخات . لەبەر ئەوە ئەم دەوڵەتە «خەباتگێڕ»ە مافی ئەوەی هەیە بەڵکو ئەرکی خۆیەتی ، کە داوا لە هەر هاووڵاتی‌یەك بکات‌و – ئامادەی بکات – کە بڕوا بەم بیروباوەڕە ڕامیاری‌یە بکات ، لەبەر ئەوە ئەم بیردۆزە گرێمانکاری‌یە مافی دەوڵەت لە پڕۆپاگەندەی ڕامیاری‌دا دەدات ، بەڵام پێویستە ئەوە بە زۆرەملێ نەبێ ، لەبەر ئەوە ئەم بیردۆزە تێ‌دەکۆشێ کە سنوورو پێوەند لەسەر مافی دەوڵەت دابنێ لە پڕۆپاگەندەی ڕامیاری‌دا بۆ ئەوەی لە بەکارهێنانی ئەم مافەدا توندوتیژ نەبێ .

بەڵام دەوڵەتی ناخەباتگێڕ ئەو دەوڵەتەیە کە بە باشی دەس ناخاتە ناو هەر شتێ کە پەیوەندیی بە بیروباوەڕی ڕامیاری یا ئایینی‌یەوە هەیە ، لەبەر ئەوە ، تیئۆری دەوڵەتی ناخەباتگێڕ ، ڕێگا لە دەوڵەت دەگرێ کە هەر تەقەللایێ یا ڕەفتارێ پەیڕەوبکات کە بۆنی وەی لێ دێ لایەنگری یا پاراستن یا بەرگری یا بەلادا شکان – ی هەر بیروباوەڕێکی ڕامیاری یا نارامیاری هەبێ بکات .

لە ڕوانگەی ئەم چەمکەوە – دەوڵەتی سۆشیالیزم و – دەوڵەتانی جیهانی سێ‌یەم کە بەرەو سۆشیالیزم دەڕۆن – لە دەوڵەتە خەباتگێڕەکانن کە لە پێناوی دوارۆژی باشتر بۆ مرۆڤ کارئەکەن ، بەڵام دەوڵەتانی سەرمایەداری و لیبرالی دەوڵەتی ناخەباتگێڕن – وەك ئەو لافە لێدەدەن – لە هەموو ڕاو بیروباوەڕو ڕێبازەکان بێ لایەنن .

لەبەر ئەوە پیاوانی ڕاگەیاندن لە دیموکراتی‌یەکانی ڕۆژئاوا لافی ئەوە لێ‌دەدەن کە لیبرالیەت سەربەستی‌یەکی زۆر بە هۆیەکانی ڕاگەیاندن دەبەخشێ[2] . مەبەستیان لە سەربەستی ڕاگەیاندن لە ڕۆژئاوا نەبوونی هەر دەسەڵات یا چاودێری‌یەکە لەسەر کردەی ڕاگەیاندن لە جیهانی سەرمایەداری‌دا ، بەجۆری ئەم کردەیە بە بێ‌لایەنی تەواو دەچێتە سەر . ئایا – بەراستی – دەزگاکانی ڕاگەیاندنی سەرمایەداری سەربەخۆن ؟ یاخود – بەواتایەکی تر ئایا ئەم دەزگایانە بەڕاستی بێ‌لایەنن ؟ .

ئەگەر بێ‌لایەنی ڕاگەیاندن سەبارەت بە یاسای ڕاگەیاندنەوە هەبێ[3] چونکە – واتە یاسای ڕاگەیاندن – لە هەموو ڕژێمێکی ڕامیاری هەڵوێستێکی بێ‌لایەن دەبێ ، بێ‌لایەنی ڕاگەیاندن سەبارەت بە کردەی ڕاگەیاندن خۆی ، لە کۆمەڵە نوێ‌یەکان‌دا نی‌یە ، چونکە دەبێ لێکۆڵەر لەم گیروگرفتەدا ، هەروەك هارۆلد لاسکی دەڵێ – ڕووبەڕووی دوو شت بێ : یەکەمیان ، ئاڵۆزی ئەم گیروگرفتە ، دووەمیان : کۆکردنەوەی دەنگوباس‌و بڵاوکردنەوەی ، کارێکە دەرخستنی مەوزوعیانەی واقیعی تێدا ڕەچاو ناکرێ ، دەنگوباس خێرا دەبێتە پڕۆپاگەندە کە مادەکەی دەتوانێ کار لە سیاسەت بکات . هەروەها ناوەڕۆکی دەنگوباس لە کۆمەڵی هەمەجۆر ، بەلای ئەوانەی جڵەوی دەسەڵاتی ئابووری‌یان لە دەستا ئەبێ بە سوود بەخش . زوربەی خەڵك لە وەرگرتنی زانیاری‌یەکانیان پشت بە ڕۆژنامەکان دەبەستن . ئەم ڕۆژنامانەش لە مانەوەیاندا پشت بەو بۆزانینانە دەبەستن کە دەستیان دەکەوێت ، هەروەها دەرکردنی

رۆژنامەکان بەگشتی زۆری تێ دەچێ . بەجۆرێ تەنیا دەوڵەمەندەکان دەتوانن دایمەزرێنن . بەڵام لەبەر ئەوە پشت بە بلاوکەرەوە دەبەستن‌و بەزۆری ناچاردەبن کە ئەو بیروڕاو زانیاری‌یانەی جێ‌ی ڕەزامەندی ئەو کەسانەی کە کوتاڵ دەکرن کە بلاوکەرەوەکە حەز بە فرۆشتنی دەکات بلاوبکەنەوە . ئەگینا برەوبان لەناو ئەو کەسانەی کە توانایان لەسەر داواکردنی راستەقینەی کاریگەر زۆرە نابێ . بەو شێوە ئەنجامەکە لایەنگرتنێکی ئاشکرایە لە گواستنەوەی دەنگوباسی ڕووداوی ڕاست کە چینە دەوڵەمەندەکان شپرزە دەکات‌و شلۆق دەکات . . . (٤) .

جان ماری دومناك لەبابەت هۆیەکانی ڕاگەیاندنی سەرمایەداری‌یەوە دەڵێ : ئەم ئامرازانەی کە یاسای قازانج ڕێنمایی‌یان دەکات ڕوودەکەنە ماستاوکردنی چێژی کۆمەڵانی خەڵك‌و ئاراستەکردنی بۆ ئەو لایەی کە ڕووی تێ دەکەن . گومانی تێدا نی‌یە کە دەنگوباسێکی زۆر لە ئارادایە . بەڵام – بەڕاستی بڵێین ئەوەندە وردو تاشراون . کات دەرفەتی خوێندنەوەیان نادات‌و . لەبەر حەسانەوەی خوێنەر واچاکە کورت بکرێنەوە ئەگەر بەو سەرەتایە قایل‌بووین دەبێتە شتێکی دڵکێش کە بەدوای ئارەزووی سروشتی جەماوەر بکەوین بۆ هاسان کردنەوەی دەنگوباس . کاتێ بەپێ‌ی توانا پێشکەش‌کردنی سەرناوی زرینگەداری کارتێکەر . لەباتی دیماگۆگیەتێك‌و . لەنێوان ئەمەو کەوتنە باوەشی پرۆپاگەندەی ساکاری ڕووت تەنیا هەنگاوێك هەیە کە هەموو دەم بیهاوێن . خۆ ئەگەر هەندێ زنجیرەی ڕۆژنامەو گۆڤار کە پەیوەندی‌یان بە بەرژەوەندیی دارایی‌یەوە هەیە . خستە سەر ئەمە دەبینین دیسانەوە هەڵبژاردنی دەنگوباس لێرەدا کاری پرۆپاگەندەی خۆی هەیە . هەرچەندە وردی‌و ریشەداکوتانی کەمترە . . . (٥) .

بەڵام ك . و . سکریس – هواردی ئەمریکی . دەربارەی بێ‌لایەنی بەناوی ڕاگەیاندن لە ڕۆژئاوادا دەڵێ : کەم کەس لەو دەوڵەمەندانەی کە ئێستاو زۆر لەمێژە دەسەلاتێکی تەواویان بەسەر ڕۆژنامەی وڵاتەکەماندا کێشاوە . ڕاست نیە لەوانی زانستی‌یە کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و سیاسی‌یە ڕاستەقینەکانی زوربەی چینەکانی گەل . پشت بەم ڕۆژنامانە ببەسترێت . بۆ ئەوەی لە هەڵبژاردن بەشداری‌بکەن‌و چاکترین ڕێگابگرن بۆ پاراستنی خۆیان‌و لە هێزە ستەمکارەکان‌و زۆرداری چینی فەرمان‌دارو چەوسێنەر خۆیان بپارێزن (٦) . .» .

بەرامبەر ئەم ڕاستی‌یە پووچەڵ کەرانەوەی کە پیاوانی ڕاگەیاندنی بەویژدان لە ڕۆژئاوادا دووپاتی دەکەنەوە ناتوانین بە بیری بێ‌لایەنی ڕاگەیاندن ، بە چەمکی لیبرالی قایل بین . چونکە داواکەرانی – واتە لایەنگیری – لە پشت ئەوەوە مەبەستیان ئەوەیە کە ڕاگەیاندن لە دەوڵەتانی سۆشیالیزم‌و نەش‌و نماکەرەکان ، بە هەموو تەکنیك‌و هونەرە پێشکەوتووەکانی‌یەوە بخەنە ژێر دەسەلاتی ڕاگەیاندنی ئیمپریالی بە بیانووی سەربەستی‌ی ئەو دەست ، ئەم دەستکردنی زانیاری دەنگوباس لە پێناوی بەردەوام‌بوونی کلکایەتی‌ی پاوان‌کردنی یەکێتی‌یەکانی ڕاگەیاندن . لە مەودای بلاوکردنەوەی ڕاگەیاندن ، بەتایبەتی لە بواری بلاوکردنەوە بە ڕادیۆو تەلەفزیۆن . تەنانەت کۆڕی دەوڵەتانی ئاڵوگۆڕکردنی پرۆگرام کە لە ساڵی ١٩٧٣ دا لە فنلندە بەسترا ، باری دەسەلات‌سەپاندنی ڕۆژئاوای لە بواری تەلەفزیۆندا «بەشەقامی یەك ڕێ» دایە قەڵەم .

لەبەر گرنگی‌ی ڕادیۆو تەلەفزیۆن لە گۆڕانکاری‌یە کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و سیاسی‌یەکان . دەوڵەتان بە جیاوازی ڕژێمە سیاسی‌یەکانیانەوە پەیوەندی خۆیان بەم هۆیە ڕاگەیاندنە زیندەگی‌یە . لە ڕێگە سیستەمەکانی بلاوکردنەوەدا ڕێکخستووە ، بۆئەوەی کارەکانی ڕاگەیاندنی خۆیان بە چاکترین شێوە بەرنە سەر . ئەمەش پێویست بە لێکۆڵینەوەی کاری ڕادیۆیەکان دەکات بە قسەو بە کردەوە ، چونکە هەر دەزگایێك لە دەزگاکانی بلاوکردنەوە بەپێ‌ی باروزرووفی کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌و ڕۆشنبیری ڕژێمە سیاسی‌یە جیاوازەکان‌و ڕاددەی دەست‌تێوەردانی میری لە ئاراستەکردنی ئەو داموودەزگایانەو یارمەتی‌دان‌و کارگێرانیان دروست‌بووە . ئێمە حەز دەکەین لێرەدا بۆچوونەکەی پرۆفیسور هانیسل Haensel دووپات کەینەوە کە ڕادیۆیێ نیە لە جیهان دەوڵەت دەستی نەخاتە ناو بەڵام ڕاددەی دەسەلاتی دەوڵەت بەسەر دەزگاکانی بلاوکردنەوە بەپێ‌ی جیاوازی ڕژێمە سیاسی‌یەکان دەگۆڕێ کە – ئەم دەزگایانە – لە سێبەریا هاتوونەتە کایەوە (٧) .

ئەگەر چاوێکمان بەو دەزگایانەی بلاوکردنەوەی کە لە جیهاندا هەن خشاند . ئێمە دەبینین لە ساڵی ١٩٧٤ دا ، بەپێ‌ی سەرژمێری یونسکۆ . لە (١١٦) دەوڵەتدا لەژێر دەسەلاتی میری‌یەو لە (٤٠) دەوڵەتدا لە ژێر دەسەلاتی هاوبەشە «تێکەلاوی هەردوو کەرت تایبەتی‌و میری» و تەنیا لە (١٠) دەوڵەتدا لەژێر دەسەلاتی کەرتی تایبەتی‌یە (٨) .

لەبەر ئەوە لێکۆڵینەوەی سیستەمی بلاوکردنەوە لە دەوڵەتە

جۆربەجۆرەکاندا ساز نابێ مەگەر لە چوارچێوەی بەخشینە سیسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و رۆشنبیری و ئایینی یەکانی ئەو دەوڵەتانە نەبێ ، لێرەدا هەر دەوڵەتێك دەیەوێ لە روانگەی فەلسەفە کۆمەڵایەتی یەکەی خۆیەوە کە بەندە لەسەر بەخشینە چینە یی یەکانی کۆمەڵگاکانی ، سیستەمی بلاوکردنەوەی خۆی دابمەزرێنێو ، تەقەللای ئەوە دەدات کە بەپێی پێویستی یەکانی ، ئاراستەی بکات ، لەپێناوی چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی و بۆ مەبەستی نەش ونما کردنی نەتەوایەتی ، لەبەر ئەوە دەبینین نموونەی جیاواز هەیە لەم سیستەمانەی بلاوکردنەوە لە جیهان کە گەیشتونەتە دانانی چارەسەرکردنی جۆربەجوری گیروگرفتەکانی کۆمەڵگاکانیان .

لەبەر ئەوەی کە ئامانج لە لێکۆڵینەوەی سیستەمەکانی بلاوکردنەوە لە و ولاتە جۆربەجۆرەکانی جیهان پێناسینی چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەم هۆیە راگەیاندنە زیندەگی یەبە بەچاکترین شێوە ، بۆ ئەوەی ئەرکی کۆمەڵایەتی خۆی لە چوارچێوەی باروزرووفی تایبەتی ی هەر دەوڵەتێك ببینێ لە رێگەی ئەو گۆرانکاری یە بنچینەییانەی کە کاردەکەنە سەر سیستەمەکانی بلاوکردنەوە ، لەبەر ئەوە لە مەولا بە درێژی لەو گۆرانکارییانە دەدوێین .

**دووەم : ئەو گۆر انکاری یە سیاسی یانەی کە کاردەکەنە سەر سیستەمی بلاوکردنەوە لە ولاتە جیاکان :** گیروگرفتی سەرەکی ، سەبارەت بە بلاوکردنەوەی رادیۆو تەلەفزیۆن ، هێشتا پەیوەندیی بە بەکارهێنانی چاکترین ئەم هۆیە راگەیاند نە زیندەگی یەوە هەیە لە پەیوەندی خۆی بە بابەتی جموجوڵی خەڵکی لە لایێو مەسەلەی نەش ونما کردنی نەتەوایەتی لە لایەکی تر .

تا ئێستا ، رادیۆ نەیتوانیوە دەرمانی سارێژکەری هەموو ئەو گیروگرفتانەی لە ئاستی بەکارهێنانی فێرکاری و خۆشماڵی و بازرگانی لە کۆمەڵگا نەش ونماکانەوە خراونە تە روو ، بدۆزێتەوە . بەلام توانیویەتی ، وەك شێوەیەك لە شێوکانی پەیوەندی ، هەڵمەتی هوشیارکردنەوەی تەندروستی و رۆشنبیری و فێرکاری لە چوارچێوەی تێگەیشتنی ستراتیژیەتی کارو جۆری پەیرەودا سەربخات ، بۆ وەدەسهێنانی ئامانجە کێشراوەکان هەڵسەنگاندنی توانستەکانی نەتەوە لەم بوارەدا .

بەلام تەرخانکردنی ئەوە لە رێگەی لەسەر وەستانی ئەو باروزرووفەی کە لە ناو کۆمەڵدا لەئارادان پێك نایە . بەڵکو پێویستە نەخشەی دەوارۆژیینی دابنرێن و پێویستی بلاوکردنەوەی رادیۆ بەو «رووبەرووبوون» ەی کە لە رۆژنامەگەری دا هەیە ، لەبەر چاو بگرێت . ئەو رووبەروو بوونەی کە دەبێتە هۆی ئالوگۆرکردنی کارتێکردن و هەڵچوون ، چونکە بلاوکردنەوەی رادیۆگەری لە رۆیشتنی زانیاری لە راگەیاندنی ناوخۆ یەك ڕێبازی هەیە . لێرەدا رێگەی بەکارهێنانی بلاوکردنەوەی رادیۆگەری خۆی دەستنیشانی کارتێکردنی کۆمەلایەتی ئەم هۆیە راگەیاندنەیە لە چوارچێوەی باروزرووف و توانست و ئەو هۆیانەی بایەخ زیاترن لە هەر دەوڵەتێك لە دەوڵەتانی جیهان ، دەکات . لەوانەیە دیارترین ئەم هۆیانە ئەمانە بن :

**ماویەتی**

**پەراوێزەکان**


١ – موسوعة المصطلح النقدی– اللامعقول–نووسینی : ئارنۆلد پ .هنجلف . وەرگێرانی د . عبدالواحد لؤلؤة . وزارة الثقافة والفنون . بغداد ١٩٧٩ ،ل ٩ .

٢ – المسرحية من أبسن الى اليوت . نووسینی ريموند وليمز . وەرگێرانی . د .فايز أسكندر . وزارة الثقافة والأرشاد القومي . القاهرة . ١٩٦٣ ، ل ، ١٧٢ .

٣ – سەرچاوەی پێشوو . ل . ١٥٠ .

٤ – مسرحية هنری الرابع . نووسین . لويچی بيراندللو وەرگێرانی . محمد اسماعيل محمد . الدار القومية للطباعة والنشر القاهرة . ١٩٦٦ – پێشەکیەکەی وەرگێر–ل . ٢١ .

٥ – موسوعة المصطلح النقدي – اللامعقول . ل . ٦٢ .

٦ – تأريخ المسرح الحديث . نووسین جنفيف سيرو . وەرگێرانی .د . بدرالدين القاسم وزارة التعليم العالي . جامعة دمشق . ١٩٧٤ . ل ، ٢٤ .

٧ – سەرچاوەی پێشوو .ل ١٨٠ .

٨ – أليوت– نووسین و وەرگێرانی دکتۆر فائق متي . دار المعارف بمصر ، ١٩٦٦ .هەڵبەستی–رجال الجوف–ل ١٥٠ .

٩ – مسرح اللامعقول وقضايا أخرى .يوسف عبدالمسيح ثروة . بيروت ١٩٧٥ ، ل ، ١٠ .

١٠ – دراسات في المسرح المعاصر. نووسینی يوسف عبد المسيح ثروة منشورات مكتبة النهضة بغداد ١٩٧٢ .ل .١٩

١٢ – مجلة الأقلام . العدد (٥) السنة التاسعة ١٩٧٣ . العبث والحريه . مؤيد الطلال .ل ١٣٠ . ل ٢٣٨ .

# راستی هندۆکی یه‌کان

نوسینی : د . احسان حقي
وه‌رگێڕانی : مجيد نديم

نیمچه دورگه‌ی هندستان‌و پاکستان ولاتێکی گه‌لێ فراوانه ده‌وروبه‌ره‌که‌شی به‌رزی‌و نزمی‌یه . . هه‌مه جۆرێ که‌ژو باو دانیشتوانی تیایه به‌جۆرێکی ئه‌وتۆ که وامان لێ ئه‌کات ناوی کیشوه‌ری لێ بنێین‌و دابه‌شی بکه‌ین به‌سه‌ر ده‌یان ناوچه‌داو هه‌ریه‌کێکیش له‌م ناوچا نه بکه‌ینه چه‌ند که‌رتێك که هه‌ر که‌رتێك له‌م که‌رتانه له که‌رته کانی تر جیایێ . هه‌روه‌ها که‌ژی باکور له‌گه‌ڵ باشورو ناوه‌راست‌و رۆژ هه‌لات‌و رۆژئاوای‌دا گه‌لێك له یه‌کتر جیان ، دیسانه‌وه دانیشتوانی ئه‌م ناوچانه هه‌ر ناوچه‌یه‌ی له‌گه‌ڵ ئه‌وی تریان له له‌ش‌و ره‌وشت‌و کرده‌وه‌و نه‌ریت‌و چونیه‌تی‌و ته‌نانه‌ت له خواردن‌و خواردنه‌وه‌و که‌ل‌وپه‌لی ناومالو به‌رگ‌دا نه‌ك هه‌ر له‌و جیاوازیانه‌ی لێیان دواین که‌متر نین بگره زۆریش زیاتره له‌و جیاوازیانه‌ی له که‌ژو دانیشتوانی له‌نێوان گه‌ل‌و ولاتی فینله‌نده داو سویدی‌یه‌کانی سه‌روی ئه‌وروپادا هه‌ن . . ئه‌مه له لایه‌که‌وه له لایه‌کی تره‌وه له نێوان که‌ژو گه‌ل‌و ولاتی ئه‌سپانیاو ( تلیان) دا هه‌ن که که‌وتوونه‌ته خواروی ئه‌وروپاوه .

خۆ ئه‌گه‌ر به‌راوردێکی نێوان سه‌ر سنووری سه‌روی هندستان‌و پاکستانیه‌کێکی (مه‌دراس) ی یاخود (که‌لکه‌تا ) ي بکه‌ین ته‌ماشائه‌که‌ین دانیشتووی سه‌ر سنووری هندستان‌و پاکستان زه‌لامێکی که‌ته‌یه‌و ناوشانێکی پان‌و بازۆڵه‌یه‌کی ئه‌ستورو ریشێکی پری هه‌یه‌و ره‌نگیشی له‌نێوان ره‌شتاڵه‌ي‌و سپی‌دایه‌و سروشتیشی وشکه‌و توره‌یه‌و زوو هه‌ڵده‌چێ ، که‌چی (مه‌دراس) یه‌که یان (که‌لکه‌تا) یی‌یه‌که لاوازو باریك‌و کورته بالایه‌و ریشی ته‌نك‌و شانوو باهویه‌کی ته‌سکی هه‌یه‌و له‌گه‌ڵ ره‌وشتێکی ساکارو گه‌لێ شتی تر . . . خۆ ئه‌گه‌ر (سند) -ی‌یه‌ك یاخود (بلوش) ی‌یه‌ك بگرین که‌وا دراوسێی یه‌کترن جیاوازی له‌نێوانیاندا زۆر گه‌وره ئه‌بینین ، له پاکستان تیره هه‌ن که پێستیان سپی‌یه‌و قژیان زه‌رده‌و یا له ئه‌ڵمانی یاخود له دانیشتوانی رۆژهه‌لات ئه‌چن به دوورو نزیکه‌وه .

شتێکی ئاشکرا شه که ئه‌م جیاوازی‌یه هه‌روه‌ك جیاوازی شێوه‌و که‌ژو هه‌ڵس‌و که‌وت‌و نه‌ریت ئاره‌زو هه‌ر ماوه .

دوورگه‌ی هندستان و پاکستان که کۆن هه‌ر یه‌ك ناو بووه له راستی‌دا ئه‌م دورگه‌یه ولاتێکی زۆر گه‌وره‌یه‌و له روی که‌رت‌و دانیشتوان‌و بیروباوه‌ڕو بیرکردنه‌وه‌و زمان و شێوه

(كه له پێنج سه‌د شێوه زمان زیاتره) بێجگه له‌و ده‌ ...ی كه پێیان ئه‌نوسرێ وئه‌خوێنرێنه‌و خاوه‌نی وێژه‌ی به‌رزن) ... نه یه‌ك جیانو وشه‌ی هندستانیش به‌سه‌ر ئه‌م كیشوه ... زانانه نراوه (ئه‌میش به‌گوێره‌ی ئاین كه خه‌ڵكی چۆنی بۆ ... هه‌روه‌ك چۆن عه‌ره‌به‌كان نه‌زانانه ناوی ئاینه‌كانی هندستان ... (ابراهیمی) ده‌به‌ن .

چونكه برهمه‌نی خۆی لقێكی ئاینه‌كانی هندستانه . . واته ...ێكه له‌و ئاینانه‌ی كه له هندستاندا هه‌ن و ئه‌مه‌ش له دوای‌دا ... نه‌كه‌ینه‌وه‌و ئه‌بێ راستی ئه‌م ئاینه هه‌روا جێنه‌هێڵین و هه‌روا ...زانی بمێنێته‌وه .

ئه‌م كیشوه‌ره‌ی كه‌وا ده‌رباره‌ی ئه‌دوێین ئه‌بێت ئه‌وه بزانین ... رۆژێك له رۆژان یه‌ك وڵات نه‌بووه كه رژێمێكی مه‌ركه‌زی ...په‌رشتی هه‌مووی بكات . . له‌به‌ر ئه‌وه بووه به چه‌ند ...ڵاتێكه هه‌ر یه‌ك له‌م وڵاتانه – واته میرنشینانه میرێك به‌ڕێوه‌ی ...دووه‌و ئه‌م میرنشینانه‌ش ته‌نیا له سه‌رده‌مه‌كانی ئیمپراتۆریه‌تی ...ئیسلام‌و مه‌غولی‌یه‌كان‌و ئیمپراتۆریه‌تی ئینگلیزدا نه‌بێ هه‌رگیز ...ژێر ئالایه‌كدا كۆنه‌بوونه‌ته‌وه .

له‌گه‌ڵ ئه‌مه‌ش‌دا له هه‌ردوو سه‌رده‌مه‌كه‌دا سه‌رده‌می پێش ده‌ست به‌سه‌را گرتنی ئه‌م ئیمپراتۆریاتانه به‌سه‌ر خاكی هندستان‌و سه‌رده‌می ئه‌م ئیمپراتۆریاتانه میرنشینه‌كان سه‌ربه‌خۆ بوون‌و چوونه پاڵ رژێمی مه‌ركه‌زیشیان واته ته‌سك‌بوونه‌وه‌و فراوان بوونی ده‌سه‌ڵاتی مه‌ركه‌زی پێوه‌ندی به ته‌قه‌للاو خواست‌و هه‌ڵكه‌وتن‌و رابوردووی رامیاری‌و دوورو نزیكی ئه‌و میره بووه له رژێمی مه‌ركه‌زی .

له هندستان‌و پاكستان‌دا له سه‌ر ده‌می ده‌سه‌ڵاتی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی‌دا پێنج سه‌د میرنشینی گه‌وره‌و بچووك زیاتر هه‌بوون كه گه‌وره‌ترینی ئه‌م میرنشینانه میرنشینی (حه‌یده‌ر ئاباد) – دكن – بوو كه ئه‌گه‌ر بهاتایه میرنشینێ بچوكی له‌گه‌ڵ بوایه ئه‌وا بۆ خۆی نیمچه ئیمپراتۆریه‌تێك ئه‌بوو . . به‌ڵام كاتی كه بڕیاری ئه‌وه درا كه سه‌ربه‌خۆیی ئه‌م نیمچه دورگه‌یه – هندستان – بدرێو بكرێ به دوو به‌شه‌وه :– هندستان‌و پاكستان داوا له میرنشینه‌كان كرا كه بچنه پاڵ ئه‌م دوو به‌شه‌وه واته ئه‌و میرنشینانه‌ی له هندستان‌دا هه‌ن بچنه پاڵ هندستان‌و ئه‌وانه‌ی له پاكستان‌دان بچنه پال پاكستان . . میرنشینی حه‌یده‌ر ئاباد له‌به‌ر رابوردووی‌و مه‌زنی وه‌ك میرنشینه‌كانی تر نه‌بوو . . بۆی هه‌بوو سه‌ربه‌خۆ له‌نێوان ئه‌م دوو وڵاته‌دا بمێنێته‌وه‌و ئه‌شتوانی بچێته پاڵ یه‌كێكیان . . هه‌روه‌ها ئه‌و میرنشینانه‌ی كه‌وتبوونه سه‌ر سنووری ئه‌م دوو وڵاته بۆیان هه‌بوو كه بچنه پاڵ یه‌كێ له‌م رژێمانه‌و خۆ ئه‌گه‌ر میرنشینێ هه‌ریه‌كێكیان زۆری دانیشتوانی هندۆك بوایه ئه‌وه ئه‌چووه پاڵ هندستان‌و ئه‌وانه‌شی كه‌وا به‌شی زۆری دانیشتوانیان موسڵمانن ئه‌چووه پاكستان . . به‌ڵام رژێمی هندستان كه به‌وپه‌ری قایل‌بوو نه‌وه ئه‌م رێكه‌وتنه‌ی مۆركردبوو رێكه‌وتنه‌كه‌ی پێ شێل كردوو به زه‌بری چه‌ك‌و خوێن رشتن (حه‌یده‌ر ئاباد) ی داگیركردوو میره موسڵمانه‌كه‌ی ده‌ركردوو زه‌وی‌یه‌كه‌ی خسته سه‌ر زه‌وی هندستان . . هندستان به‌مه شه‌وه نه‌وه‌ستا ده‌ستی بۆ دوو میرنشینی سه‌ر سنوور (جونكره ، كشمیر) درێژكرد به زه‌بری چه‌ك یه‌كه‌میان واته (جوناكری) ی داگیركرد به‌ڵام نه‌یتوانی هه‌موو كشمیر بگرێت چونكه موسولمانه‌كان دژی وه‌ستان له‌به‌ر ئه‌وه له چوار به‌ش توانی هه‌ر سێ به‌شی بگرێت . . به‌شه داگیر نه‌كراوه‌كه به‌ناوی ( كشمیری سه‌ربه‌سته‌وه) سه‌ربه‌خۆیی بۆ خۆی سه‌ندو دانیشتووه‌كانیشی پاڵ دا به پاكستانه‌وه . . پاكستانیش وه‌نه‌بێ له‌م كاره بێده‌نگ بووبێ هه‌ر له‌و سه‌رده‌مه‌دا كه ئه‌م مه‌سه‌له‌یه روی دا گازنده‌یه‌كی( شكات) بۆ ئه‌نجومه‌نی ئاسایش ده‌رباره‌ی دانیشتووه موسوڵمانه‌كانی كشمیر ناردو ئه‌نجام بڕیاری ئه‌وه درا كه هه‌ڵبژاردنێك له‌ناو دانیشتوانی وڵاته‌كه‌دا سه‌باره‌ت به ئاره‌زوو خواستی كشمیری‌یه‌كان بكرێت . . پاكستان به‌م بڕیاره قایل بوو كه‌چی هندستان ئه‌م بڕیاره‌ی خسته پشت گوێو دانیشتوانیش هه‌روا بێ چاره مانه‌وه .

## گه‌نجینه مێژوویی‌یه‌كان

تا ساڵی ١٩٢٢ خه‌ڵكی وایان ئه‌زانی كه (دراوری یه‌كان هندستانی ره‌سه‌ن‌و نه‌ته‌وه‌یه‌كن هێشتا له ژیانی سه‌ره‌تایی‌دان‌و له دارستانه‌كان‌دا ده‌ژین . . له‌به‌ر ئه‌وه زاناكان هیچ بایه‌خیان پێ نه‌داون‌و ده‌رباره‌ی مێژوویان هیچ لێكۆڵینه‌وه‌یه‌كیان نه‌بووه . . خۆ ئه‌گه‌ر ئه‌م لێكۆڵینه‌وه‌یه‌شیان بكردایه وه‌سیقه یه‌كی ئه‌وتۆیان ده‌ست نه‌ئه‌كه‌وت بۆ پشت‌پێبه‌ستن . له‌به‌ر ئه‌مه هاتوونه سه‌ر ئه‌و باوه‌ره‌ی ( هندۆك ) ه ئاری‌یه‌كان كه ده‌ستیان به‌سه‌ر هندستان‌دا گرتووه له‌و رۆژه‌وه مێژووی ئه‌م وڵاته ده‌ست – پێئه‌كات‌و هیندۆكانیش ئه‌م رایه چه‌وته بڵاوئه‌كه‌نه‌وه گه‌رچی ئه‌شزانن درۆیه به‌ڵام بۆئه‌وه‌ی وڵاته‌كه‌یان وا ناو ببرێ . . ئه‌م كاره تا ساڵی ١٩٢٢ وا مایه‌وه تاكو ئه‌و رۆژه‌ی كه له دۆڵه‌كانی ( سه‌ند ) دا شوێنه‌واری دوو شاری گه‌وره دۆزرانه‌وه كه : ( مه‌هه‌نجودارو ) و ( هربا ) بوون . . له‌گه‌ڵ ئه‌م دوو شاره‌دا

گەنجینەیەکی مێژووی دەرکەوت کە لەوە پێش نەزانراوە .

لەم دەرکەوتنانەدا بۆمان دەرکەوت کە ( دراوری) یەکان خۆیان دانیشتووی رەسەنی هندستان نین‌و هەروەك ئاری‌یەکان ئەوانیش لە بەشی سەرووەوە هاتوون‌و داگیریان کردووەو ئینجا بە زەوی‌یەکەیدا بلاوبوونەتەوە . . هەرچەند ولاتیان ئاوەدان کردبێتەوە بە هاتنی ئاری‌یەکان ویران‌کراوە .

هەروەها زانیشمان کە (دراوری) یەکان نەتەوەیەك نەبوون کە لە ژیانێکی سەرەتایی‌دا ژیابن بگرە شارستانیەت‌و پێشکەوتنێکی مەزنیان هەبووە کە ئەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی شارستانیەتی عیراق‌و میسر . ئەم شارستانیەتەشیان بووە کە چاوی ئەو ئاریانەی کردەوە کە لەدوای(دراوری) یەکان هاتوون . . لەگەلْ ئەمەشدا بۆمان روون‌بووەوە هەر وەك چۆن دانیشتوانی رەسەنی هندستان لە بەردەم هێرشی (دراوری) یەکان دا هەلاتن هەرواش (دراوری) یەکان لە بەر ئاریەکاندا خۆیان پێ نەگیراوە هەلاتوون . . نەوەی ئەمانەش تا ئەمڕۆ لەخواروی هندستان‌دا هەن وە زاناکانیش بەزۆری بۆ ئەوە ئەچن کە دانیشتوانی رەسەنی هندستان ئەچنەوە سەر دانیشتوانی سۆمەترەو ئوستралیاو سەیەلان (سری‌لانکا) کە گوایە ئەمانە کورتە بالاو لوت پان‌و پێست رەش‌و ئەوانەی ئێستا کەوا ماون هەر شیوە زمانەکانی خۆیان ماوە کە ئەم شێوە زمانانە زمانی دانیشتوانی دوورگەکانی زەریای هێمنی‌و زەریای‌هندستانە . .
ئەم دانیشتوانەش دوو هۆ لە هندستان‌دا هێشتونیەوە : یەکەم ئەم دورگانە خاکەکانیان بە دورگەی هندستانەوە بوون‌و دوای لێ بچڕاون یاخود بەهۆی پێویستی ژیانەوە بۆی هاتوون .

ئەمەو واش دەرئەکەوێ کە ژیانی دانیشتووی‌رەسەنی هندستان لە ژیانێکی سەرەتایی‌دا بوون هەروەك ئەمڕۆش تیان .

هەر کە داگیرکەرانی هندستان لە بەشی سەرووەوە ئەهاتن هەروەك چۆن دانیشتوە رەسەنەکە لە بەردەم هێرشی (دراوری) یەکان‌و (دراو ری) یەکان لە بەردەم هێرشی ئاری‌یەکان‌دا خۆی نەئەگرت‌و رویان ئەکردە بەشی خوارو دانیشتوان رویان ئەکردە بەشی لای خوارو .

وەکو دەریش ئەکەوێ راکردنی سەرنەکەوتوو لە بەردەمی سەرکەوتوودا تەنیا یەك هۆ بووە کە ئەویش ئەو ئازارو ئەشکەنجەیە بووە کە سەرنەکەوتووە بە دەست سەرکەوتووەوە چەشتویەتی کە بریتی بوو لە کوێلەکردن‌و چەوساندنەوەیە . . من لەم هۆیەش زیاتر هۆیەکی تر بۆ هەلاتنی سەرنەکەوتوو نابینم چونکە مرۆڤی سەردەمی کۆن ئەو رۆژانەی کە نیشتمان‌پەروەری‌و نەتەوەگەری لەم چوارچێوە تەسکەی ئەمڕۆدا نەبوو .

نەریت‌و ئامانج‌و ئاین نەئەگۆڕران ئەگەر سەرکەوتوو سەرنەکەوتوو یەکیان نەگرتایەو لە یەکتردا نەتوابانەیەوەو سەرکەوتوو لە سەر نەکەوتوو تەنانەت ئاین‌و خواکەی سەندۆتەوە من بە پێچەوانەوە ئەلێم!

رۆژگارێك کە بەو جۆرە بووبێ کە وەك لێی‌دواین پێویستی نەکردووە کە دانیشتووی ولات بەهۆی نەتەوەیەکی بێگانەوە کە دەستی بەسەردا گرتبن ولاتەکەیان بەجێ بهێلن چونکە لەو دەست بەسەراگرتنە زیانێکی ئەوتۆیان نەدەکرد . . راکردنی دانیشتووی رەسەن هندستان لە بەر دەمی (دراوری) یەکانداو (دراوری) یەکان لە بەر هێرشی ئاری‌یەکاندا تەنیا ئازارو چەوساندنەوەی سەرنەکەوتوو نەبێ هیچ هۆیەکی تری تێدا نەبووە .

جا ئەگەر راست‌بێ بەگوێرەی کە دانیشتوانی رەسەنی هندستان هیچ شارستانیەتێکیان نەبووبێ . . ئەم راستیە بە لایەن (دراوری) یەکانەوە پێچەوانە بە چونکە لەو چالانەدا دەرکەوت کە لە ( سەند ) هەلیان‌کەند کە ئەو نەتەوەیە خاوەنی پایەیەکی بەرز بوون لەشارستانیەت‌و پێشکەوتندا بە گوێرەی ئەو سەردەمەی کە تێیدا ژیاون‌و تەنانەت کەل‌وپەلی چنین‌و ناومالو گۆزەگەرێتی‌وچەکی ئاسن‌و گەوهەرو بەردی بەنرخی چاك‌کراوو پەیکەری خەلکی‌و ئاژەلو گەنم و جۆ دۆزراونەتەوە . . ئەمە بێجگە لەوەی کە وەك جۆگەی ئاوی پیسیان هەلگرتووە جۆگەی ئاوی پاکیشیان هەلبەستووەو گەرماوی گشتی‌و بازار یشیان هەبووە . . . بەلام ئەوەی کە لە هەموو شت بایەخدارترە ئەوەیە کە گەرماوی تایبەتیشیان هەبووە کە ئەوروپا تا سەدەی نۆزدەیەم نەگەیشتبووە ئەم پلەیەو هەروەها گەرماوی گشتیشیان نەزانیوە دوای جەنگی خاچەکان نەبێ واتە کاتێ ئەوروپاییەکان کاتێ لەم جەنگەدا لە رۆژهەلات بوون لە رۆژهەلاتەوە گەرماوی گشتیان بینی‌و کەوتنە دامەزراندنی بەلام بەشێوەیەکی زۆر کەم .

لەم دوو شارەدا کە دۆزرانەوە لە مالەکانیاندا ئێسکی ئاژەلو پوولەکەی ماسی هەمەجۆر بینراوەتەوەو ئەو پەیکەرانەش کە دۆزرانەوە کە وەك ئەو بەرگە وابوون کە ئەو نەتەوەیە پۆشیویان . . ئەو بەرگە هەر لەو بەرگە خوریە ئەچێت کە ئەمڕۆ هندستانی‌یەکان ئەیپۆشن هەروەها لوکەشیان زانیوەو ژن‌و پیاویشیان هەروەك دەستوری ئەمڕۆیان بە هەموو جۆرە خشلێك خۆیان رازاندۆتەوە .

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە دلنیانین لەوەی کە بزانین ئایا

ـەی ( دراوری) یەکان هاتوون‌و دەستیان بەسەر هندستاندا
گرتووە بەلام وەك بۆچونێك ئەتوانین بڵێین کە لە کۆتای حەوت
هەزار ساڵی پێش زاین‌دا دەستیان بەسەر هندستاندا گرتووەو
ئەمەش بەوەی کە پێش هاتنی ئاری‌یەکان بۆ هندستان کە دوو
هەزار ساڵی پێش زاینە شارستانیەتیان سێ هەزار ساڵ
حەیندوێتی .

هندۆکەکان پێش ئەوەی ئاری‌یەکان بەسەر وڵاتەکەیاندا
ـەن‌و داگیری بکەن هەر لە هندستاندا بوون هەروەها زاناکان
ـێ ئەوە ئەچن کە ئەم هاتنەی ئاری‌یەکان بۆ سەر هندستان‌و
داگیرکردنی لە سەرەتای دوو هەزار ساڵی پێش دابووەو
دراوری) یەکان چ تالان‌و بڕۆ زۆرداری‌یەکیان سەبارەت بە
دانشتوانی رەسەنی هندستان کردووە ئاری‌یەکانیش بەرامبەر بە
(دراوری) یەکان کەمتریان نەکردووەو ئەنجام ئەوەی لە ترسانا
هەڵاتووە رووی کردۆتە بەشی خوارووو ئەوا هەڵاتووە ئەویشی
ماوەتەوە ئەوا لەناو ئاری‌یەکاندا تێکەڵ بووەو تواوەتەوە .

بەلام ئاری‌یەکان ئەم هندۆکە رانەکردوانەیان وەك براو
دۆست وەرنەگرتوو وەکو کۆیلە تەماشایان ئەکردن‌و ئەیان
چەوساندنەوە بەلام پێش دەرکەوتنی چینایەتی .

لە دەستنیشان‌کردنی رەسەنی ئاری‌یەکاندا زاناکان هەر
وەك لە دەستنیشان‌کردنی وڵاتەکەشیاندا کە تیایا پەیدابووبوون
ناویان لێ نابوون هندۆکە جەرمەنی‌یەکان هەر یەکە بە جۆرێکی
بۆ ئەچن . . . وتوویانە ئەمانە وڵاتەکەیان ناوەراستی ئاسیایەو
هەندێکیش ئەڵێن دانیشتووی رۆژهەلاتی ئەوروپان بەتایبەتی
مەجەرستان‌و نەمسا . . لەبەر ژیان وڵاتەکەی خۆیان جێ
هێشتووەو رویان‌کردۆتە رۆژهەلات‌و هەندێکیان لە ئێران
ماونەتەوەو ئەوانی تر بەرەو هندستان رۆیشتوون‌و دەستیان
بەسەر بەشی ژووروی دا گرتووەو لەوێ ماونەتەوە .

ئیتر کاتێ کە لە شێوەی نووسینی ئاینی‌دا ئاری‌یەکان بوونە
نووسەرەوەی مێژووی هندستان کەوتنە ئەوەی لە تواناو
دەسەلاتی ( دراوری ) یەکان بدەن چونکە بەجۆرێکی ئەوتۆ
چارەیان نەئەویستن بە نەتەوەیەکی دواکەوتوو درندە دابوویاننە
قەڵەمو بایەخیان بە هیچ رەنگێ پێ نەئەدان ، خۆ ئەگەر لە
چاڵەکانی ( سەندا ) دا ئەو ئەلقە ونبووە .

مێژوویەیە نەدۆزرابایەوە ئەوا خەڵکیش هەر وەك
ئاری‌یەکان (دراوری) یەکانی ئەناسی . . چونکە ئاری‌یەکان
هەروەك چۆن لە ئەفەریقادا لوتیان تەق بە لوتی پێست‌رەش یان
رەشتاڵەکانی ئەو کیشوەردا خۆیان بە گەورە دایە قەڵەمو

ئەوانیشیان ناو نا (بەربەر) ئاری‌یەکانیش لەوان خۆیان بە رەگەز
زانی‌و ناوی خۆیان نا (ئاری) یان (هەڵبژێر) و ناوی دانیشتووی
هندستانیشیان نا (ویسو) .

**مانگاو . . سەرنج دەربارەی**

عەرەب‌و رۆمانەکان بەم ناوە ناتۆرانە لەقەڵەم بدەن‌و
بەدرێژای رۆژگار لە چوارچێوەی مێژوویی‌و تەنیا زماندا مابێتەوە
بێ ئەوەی بگاتە وشە رەسەنەکەی خۆی . . دووبارە نەفرەت
کردنی ئاری‌یەکان لە دوژمنەکانیان بەوەی کە نەفرەتیان
لێکردوون و لە سنووری زمان دەرچووبێو هەروەك خۆی
مابێتەوە بووبێتە تەوقێك لە ملی سەرنەکەوتووەکانداو ئەم باوەرە
سیاسی‌و کۆمەلایەتی‌یە بووبێتە باوەرێکی ئاینی هندۆکەکانی
لەسەر بنیات‌نراوە واتە — ئاینی چینەکان‌و نەریت . . ئەوا دیارە
کە ئەم رەفتارەیە کە زۆر جار وای لە دانیشتوانی وڵاتەکە کردووە
کە لە بە ردەم هێرشی داگیرکەراندا هەڵبێن‌و لە ترسی ئازارو
کەللە رەقی ئاری‌یەکان(کە وەك کۆیلە تەماشایان ئەکردن) روو
بکەنە بەشی خوارووی هندستان لەگەڵ ئەوەی کە ئاری‌یەکان
هیچ پلەیەك لەوان بەرزتر نەبوون تا بۆ ئەمکارە خۆیانی پێوە
هەڵکێشن . . بەلام ئەم کردەنەوە ناپەسەندانەیان تەنیا هەر
لەبەر ئەوە بووە کە سەرکەوتوو دەست — (درێژکەر بوون ) واتە
دەست رۆیی‌و بوون

ئاری‌یەکان وەك نەتەوەکانی تری سەرەتای . . زەوی‌و
ئاسمان‌و خۆرو مانگ‌و روباردو درەخت‌و ئاگرو باو شتەکانی
تری دەرکەوتووی سروشتیان پەرستووەو پەیکەریان بۆ ئاژەڵیش
کردووەو پەرستوویانە بەتایبەتی (مانگا) و تا ئەمرۆش هەر
وان . . هەروەك دکتور ئەبو ریدە ئەڵێت هیندۆکەکان ژیان
ئەپەرستن ژیان ناپەرستن . . بەلام مانگایان بەلاوە پیرۆزەو
ئەیپەرستن . . چونکە ئەگەر ژیانیان بەلاوە پیرۆز بوایە دەرگای
پیرۆزیان بۆ ژیانی هەموو گیان لەبەرێك ئەخستە سەر پشت
بەتایبەتی ژیانی مرۆڤ کە چاکترین گیان‌لەبەرە بەلام بێجگە لە
مانگا هیچ شتێکی تریان نەپەرستووەو هەموو شتێکی تریان
کوشتووەو هەزاران کەسیان کوشتووە کە هندۆکی نەبوون‌و
مانگایان خواردووەو هەروەها لە سەردەمی بەردین‌دا چۆن
مانگا بەرەلا بووە ئەمرۆ لە هندستاندا وایە لە رێو بان‌و
بازارەکانی هندستاندا ئەوەی کە لە بەردەمتا قوت ئەبێتەوە
بێجگە لە وێنەی هەزارە رووت‌و رەجاڵەکان — لە هەموو
شارێکدا ئەو مانگا بە دەلاڵنەن کە سەربەست ئەسورێنەوە .

هندۆکی‌یەکان وەك رێگەیەك بۆ رزگاربوونی ئەمری

باوەریان بە گونجان( تناسخ) هەیە . . بەم گونجایە مرۆڤ لەو پلەیەی کە هەیەتی بەرزتر ئەبێتەوە یان بەلایەکدا ئەکەوێ . . هەروەها لە چینێکی دەست‌نیشان‌کراودا لە و چینە زۆرانەدا کە هەن پەیدا ئەبێو ئەمەش ئەنجامی ئەو کردەوە کۆنانەی کە لە جیهانی لەوە وپێشیدا بوویەتی . . بە کردەوەکانی جا یاخود ئەوەندە بەرزئەبێتەوەو تێکەڵ بە خوا ئەبێت یاخود وای لێ دێ ئەبێتە ئاژەڵ یان مێروویەك یان ئەمەبێ‌و جـا کۆتاي جیهان کە هەندێ ئاین پێ ئەڵێن رۆژی (قیامە) هەندێ جار ئەو ئاژەڵو مێروو مەیوانە تێکەڵ بە خوا ئەبن لەم رووەوە( منو سمرتی ) ئەڵێ : کەی هەموو گیان لە بەرێك تێکەڵ بە گیانی گەورە بوو (کە کانگای هەموو گیان لەبەرێکە) .

ئەو کاتە گیانی هەر گەورە ئەخەوێو لە بیرکردنەوەو فرمان رزگاری ئەبێ[1] .

هندستانی‌یەکان خۆیان ئەبن بە چوار بەشی سەرەکی‌یەوە کە ئەمانەن(برهمن ، کشتەری ، ویش ، شودەر) و ئەڵێن کە خوا (براهمە)ی لە سەری‌یەوە دروست کردووە و (کشتەری) یەکانیش لە کاڵەکانی‌یەوەو( ویش) لە رانەکانی‌یەوەو (شودەر) لە پێیەکانیەوە . . بەڵام لەگەڵ ئەم چوار بەشە سەرەکیانەشدا ئەوەندە بەشی تر هەن لە ژمارە نایەن .

وتمان هندۆکی‌یەکان هاتنە هندستانو بینیان کە نەتەوە یەکی خاوەن شارستانیەت‌و پێشکەوتنی تیدایە . . لەم نەتەوەیەوە فێری شارستانیەت‌و پێشکەوتن بوون‌و بۆ خۆیان دەستیان بەسەر یاندا گرت . . بێجگە لە مانەش پێوندی بازرگانی‌و گەشت‌و گوزاری‌یان هەمیشە لەگەڵ رۆژهەڵاتی ناوەراستدا بووە بەتایبەتی عیراق . . دووبارە هەرچی شارستانیەتێك لە عیراقیشدا بووە وەك هونەری نووسین گواستوویانەتەوە بۆ هندستان . . لە سەرەتای کارداشتی زۆریان نووسیوە وەك شتی مێژووین کە دوای گۆڕیویانە بە شتی ئاینی‌و ئەوەشی کە یەکەم جار نووسراوە نووسراوێکە بەناوی (رکوید) وانە زانینی پیرۆزتر دوای ئەوە سێ نووسینی تریان نووسی بەناوی (وید) ەوە کە ئەمەش بریتی‌یە لەو نیازەی کە (وید) ی لەپێناودا نووسراوەتەوەو نووسراوەکانیش ئەمانەن (یجروید ، ساموید ، واتهروید) دوای نووسینێکی تریان نووسی (کە نووسینی پێنجەمە) سەبارەت بە پایەی (وید) ئەمیش بەناوی (یران) دوابەدوای ئەمە نووسینی تریان زۆر نووسی وەك نووسینی (ابنشد) و شی‌کەرەوەی (وید) ە . ئەم نووسینانە کەوا ئاینی بوون ئەوەندە زۆر بوون تەنانەت ئەوانەی کە شارەزایشیان هەبوو وەك نەشارەزاکان نەیانتوانی شتێکی دەربارە زیادبکەن . . هەندێ زانایان لە سەدەی شەشەمی پێش زایندا هاتن نووسینێکیان نووسی‌و هاتن هەرچیەکیان پێویست‌بوو وەك کاروباری ژیان‌و باری یاسایان هەموویان لەم نووسینەدا کۆکردەوە کە لە هەموویان بەرزتر (منو سمرتی) یە . . واتە یاسای (منو) .

(منو) ئەتوانین پێی بڵێن خوای رۆژگار . . . چونکە هندۆکەکان بەلایانەوە وایە کە دوای هاتنی چواردە (منو) کۆتاي خولی جیهان دێت‌و هەر یەکێکیش لەم منۆیانە رۆژگارێکی تەرخان‌کراوی خۆیان هەیە خوا لەم رۆژگارەدا تەنیا کەسێکە کە دەسەڵاتی بەسەر ئەم گەردوونەدا هەبێت‌و بەشی هەر یەکێکیش لەم (منو) یانە حەفتا خولەو هیندوکەکان ئێستا ئەڵێن گوایە ئەم رۆژگارەی کە ئەمرۆ ئێمەی تێداین خولی بیست‌و حەوتە مینە . . واتە لە سەردەمی (منو) ی حەوتەمداین . . گوایە ئێستا جیهان لە نیوەی رێگای بوون‌و نەماندایەو ئەشڵێن رۆژگاری هەر (منو) یەك ( ٨٥٢) هەزار ساڵی پیرۆزی خوای‌یە . . واتە (٣٠٦/٧٢٠/٠٠٠) ساڵی خۆری (شمسی ئەم سەدەیەیان . .) ئەمەش وا دانراوە کە هەر ساڵێکی پیرۆزی ( ٣٦٠) ساڵی خۆری‌یەو رۆژگاری چواردە (منو) کە بریتیە لە رۆژێك لە رۆژەکانی( برهما) .

سێ خوا نەك یەکێ : هیندۆکەکان هەروەك دکتور ئەبو ریدە دەڵێ یەکن یەك نین بەڵکو ئەیانیشیان بە سێ خوای‌سەرەکی هەیە کە ئەمانەن (برهما ، شنو ، مهیش) و ئەڵێن یەکەمیان هەموو گەردوون دروست‌ئەکات‌و دووەمیان پەروەردەی ئەکات‌و پێنەگەیەنێو سێیەم ماندوی ئەکات‌و لەناوی ئەبات . دیسانەوە لە سەر و ئەم خوایانەشەوە باوەریان بە خوای هەرەگەورە هەیە کە پێ ئەڵێن( برماتما) یاخود گیانی هەرەگەورە .

هیندۆکەکان لەم باوەرەوە خوایەکیان لە (ثالوث) ی گاورەکان‌و هەردوو خوای مەجوسی‌یەکان زیادکرد کە باوەریان بە دوو خوا هەبوو یەکێکیان کە خوای فەرەو ئەوی تریشیان خوای خراپەیە . . خوای سی‌یەم پەیمان ئەبەستێو گیان لەبەر پەروەردەئەکات‌و ئەمەش هەموو ئەو خوایانە نین کە لای هیندۆکەکان هەن چونکە ئەوەندە خوایان هەیە سەرژمێر ناکرێن .

لەو باوەرەشدا نین کە (وید) و ەحییە لە خواوە هەروەك دکتور ئەبو ریدە والێی دواوەو سەرچاوەکەشی لە

ـیۆنی) یەوە وەرگرتووە . بگرە باوەڕیان بە (وحی) هەر نیەو ـەویش کە (بیرونی) وتوویەتی بەراوردێکە لەگەڵ ئاینی ـلامدا کردوویەتی . . هندۆکی‌یەکان باوەڕیان بە (وحی) نیە جونکە باوەریان بە پێغەمبەرێتی نیەو لایان وایە کە مرۆڤ هەر ـرۆڤ ئەبێت لە کاتێکدا کە ئەشبێتە خوا ، لەبەر ئەوە ئێمە ـەبینین لە لایان خوا زۆرەو کەچی ناوی پێغەمبەریکیان نیەو ـەگەش بۆ (منوسمرتی) یە کەوا (منو) بەهەموو دڵنیایی‌یەکەوە ـ یشتبوو . گەورەی هەموو کاهنەکان هاتو بەرێزەوەسلاویان ی کردوو-لێیان پرسی واتە لە (منو) : ئەی گەورەی هەرە پیرۆز ـویستی‌یەکانی دەستەکانی دوورەگرو فەرو چاـەو شتە ـرووست نەبووەکانمان پێ بڵێ چونکە هەر تۆی بەتەنیا ـەی مەزن کە کاروباری یاسای (شرعی) و زانینی گیانی‌و ئەحکامەکانی خوا ئەزانین ، کە پێویستی بە بوونەو نەبینراوێکەو هەست ناکات ، کاتێ گەورەی کەهنوتەکان لەم کەسە پەسەندکراووی کە دەسەلاتێکی بێ پایانی هەیە پرسی کە چییان ی پرسیوە(منۆ) سلاوی سەندنەوەو وتی گوێ بگرن[٣] :

هات کەوتە روونکردنەوەی ئەوەی کە چۆن(برماتما) براهمای درووست کردو دوای (براهما) ش خوای فرمانکەرو (منو) ی دروست کردوو(منو) ش جیهانو دە خواو خەڵکێکی زۆری درووستکرد .

ئەمە چاو پیاخشانێکە سەبارەت بە هندۆکەکان کە لە بەندو یاسا تایبەتی‌و گشتی‌یەکانیدا بەتەواوی لە ئاینی جولەکە ئەچێت‌و ئەوەشی کە (منو سمرتی) و تەورات بخوێنێتەوە گومانی نیە لە وەی کە سەرچاووی ئەم دوانە یەکێ نەبن . خۆ ئەگەر بشگەرێینەوە سەر مێژووی جوولەکەو هندۆك ئەبینین کە زۆر لە یەك نزیکن‌و وامان لێ ئەکان کە بڵێین هەردووکیان یەك سەرچاوەن ، بەلام ئەو ئاینانەی کە لە ئاینی هندۆکی‌یەکانەوە هەڵقولاوە ئەمانەن(ببوذی ، جینی ، سیك) .

ئاینی (جینی‌و بووذی) نزیکی سەدەی پێنجەمی پێش زاین پەیدابوون‌و جینی‌یەکان وەك هندوکی‌یەکان نەبوون‌و باوەڕیان وابوو کە هەموو گیان لە بەرێکی ژیان تەنانەت مەیویش گیانێکی هەیە . . لەبەر ئەوە کوشتنی گیانێك جا هەر کەسێك خاوەنەکەی بێت بەلایانەوە قەدەغە بوو . . ئەمانەش لە هندستاندا چەند ملێنیکن‌و مێشوو لەیەك ناکوژن . . خۆ ئەگەر بەشوێنێکدا برۆن دەم‌و لوتی خۆیان هەڵئەبەستن نەك مێشولەیەك یشێك بچێتە دەم‌و لوتیانەوەو بمرێ .

بەلام بووذی یەکان پێچەوانەی هندۆکی‌یەکان بوون و خاوەنی ئەم ئاینەش (کوتاما) هندۆکی بوو کە باوەڕی بەو هەموو خوایانە نەبوو کە هندۆکی‌یەکان هەیانبوو لەبەر ئەوە لێیان دوورکەوتەوەو دەستی کرد بە بیرکردنەوە لە ژیان . . ئەم بیرکردنەوە هێنایە سەر ئەوەی کە بروا پەیدا کات بەوە کە (ژیان) خۆی ئازارەو ئەم ئازارەش لە سووربوونی مرۆڤەوەیە ئازادبوونی مرۆڤیش لەم سووربوونە بەختیاری نەمری دەستئەکەوێو دووبارە باوەڕیشی بە گیان نەبووە کەلای هندۆکەکان باوەر بە گیان نەبوون بەلایانەوە باوەر بەخوا نەبوونە چونکە لایان وایە کە گیانی گیانلەبەر لە گیانی هەرەمەزنەوە وەرگیراوە .

ئاینی (کوتاما) کە نازناوی (بودها) واتە حەکیم بووە لای عەرەبەکان کە بۆتە (بوذا) بەکاروباری رەوشتی هەستاوەو بەلام ئەوانەی کە شوێنی کەوتبوون لە دوای مردنی وایان بلاوکردەوە کە باوەڕی بەخوا هەبووە .

ئەم بوذیەتە ئیتر لە هندستانەوە گەیشتە چین‌و ژاپۆن . . ژمارەشیان تا وکو ئەمرۆ لە شەشسەد ملیۆن کەمتر نیە .

ئاینی سێیەم کە لە هندۆکی یەکانەوە بەرپابوونی ئاینی (سیکە)ە کە عەرەبەکان بە (سیخ) ی ئەنووسن چونکە لە بێگانەوەکە SIKH واتە ئیس ئای کەی ئیج – ئەنووسن وەریانگرتووە لەگەڵ ئەوەشدا KH کەی ئیج یەك وشەیەو کاف‌و ئێچەکە و بەبێ دەنگ بەکارئەهێنرێن ، خاوەنانی ئەم ئاینە لە لق‌و شێوەدا لەگەڵ هندۆکەکاندا جیاوازن بەلام لە پەرستنی مانگادا ئەگەنەوە یەکتری‌و ژمارەیان لە هندستاندا چەند ملیۆنێکەو لە گەلێ کارەوە لە هندۆکەکان جیاوازترن وەك ئەمانە لە رۆژێکەوە کە لەدایك ئەبن تا ئەو رۆژەی ئەمرن هەر موویەك لە لەشیان دەربێ ئەیهێڵنەوەو دامەزرێنەری ئەم ئاینەش پیاوێکی (پەنجاب) ی‌یە کە ناوی (بابا نانك) ەو ئاینەکەی جیایە . . وتوویانە کە ئەمە موسوڵمان بووەو ویستوویەتی کە هندۆکەکان لە موسوڵمانەکان نزیك بکاتەوەو لوتی بووە بە لووتی دەستەیەکەوە کە موسوڵمانیان خۆش نەویستووە . هەشن کە ئەڵێن هندۆکەو بروای بە ئاینی هندۆکەکان نەبووەو ویستویەتی چاکی بکات‌و ئەم ئاینەش لە سەدەی شەشەمی زانیدا پەیدابووە .

ئەمە کورتە یەکە دەربارەی هندستان‌و ئاینەکان چونکە ئەگەر بێت بە درێژی بنووسرێ پێویستی بە زۆر نووسین هەیە . . بەلام بەم کورتەیە کۆتایمان پێ هێنا ●

**لە گۆڤاری ( العربي ) ژمارە ٢٦٢**
**سالی ٩٨٠ وەرگێردراوە**




دابەش کردنی ئەرشیڤەکان بەچەند جۆرێك بە پلەی یەکەم پشت بە گەورەیی کۆمەڵە ئەرشیڤییەکانو بایەخ و جێگای شیاوی پاراستنیان دەبەستێ هەروەها ئەکەوێتە سەر ژمارەی موچەخۆرە فەرمانبەرەکان لەبەش و بەڕێوەبردنییەکانداو ئاستی زانستیو شارەزایی پیشەییان. ئەم سەردەمەشمان بە پسپوریی ناسراوە، بۆیە دەبینین زۆر لە دەوڵەتە پێشکەوتووەکان لە مەیدانەکانی رێکخستنو بەڕێوەبردنی ئەرشیڤی دا ئەرشیڤی تایبەتییان دامەزراندوەو خانەدەرەی نوێی فراوانیان دروستکردووە بۆ پاراستنی بەڵگەنامەکانیان بە بابەتکراوی بۆ گەیشتنە ئامانجی خواستراو لە پاراستنی بەڵگەنامەکان.

دەتوانین بڵێین کە بۆ بەدیهێنانی ئەمە دوو رێگا هەیە:

**١ - دروستکردنی خانوی فراوان بۆ ئەوەی جێگای ئەو کۆمەڵە** بەڵگەنامانەیان تێدا بێتەوە کە لە دایەرەو دامەزراوە میرییەکانەوەو لەهی ترەوە بۆیان دێتو پاراستنیان بەپێی بابەتو جۆریو ئامادەکردنی رابەرو پێرست بۆیان.

**٢ - هاندانی ئەو دامەزراو ودایەرانەی کە ئەم بەڵگەنامانە** دەردەکەن بۆ دامەزراندنی ئەرشیڤێکی تایبەتی بۆیانو دانانی خانوی شیاو بۆیانو دامەزراندنی فەرمانبەری لێهاتوو بۆ ئەوەی بە هاوکاری لەگەڵ بەڕێوەبردنی ناوەندی ئەرشیڤەکەدا بەڕێوەی بەرن.

رێگای دووەم باشترە ئەگەر هاتوو ئەو رەگەزانە لەبەردەستدا نەبوون کە لە برگە (١) ی پێشودان. هەرچەندە وا دەردەکەوێ کە ئەرشیڤەکان زۆرنو دابەش کراون بەڵام بۆ بە ئاسانی گەیشتن بە بەلگەنامەکان بەوردیی وشارەزابوون لە ناوەرۆکەکانیان، چونکە ئەو بەڵگەنامانە تائێستا هەر لەلای دایەرەی سەرەکی (سەرچاوە) و بەهۆی هەبوونی ئەو فەرمانبەرانەوە کە هەموو رۆژێ لەگەڵ ئەم بەلگەنامانەنو لە بنەرەتو سەروبنیان شارەزان.

هەندێك لە زانایانی ئەرشیف وا ئەم ریگایە دەبینن کە رەنج بەفیڕۆ دانەو ئەوان سیستەمی ناوەندییان بەلاوە باشە.

واتە کۆکردنەوەی لە جێگایەك بەو پێیەی کە مەرجی پێویستی تێدابێ وەك فراوانیو دڵنیایی لە پاراستنیان، سەرەرای ئەوەی کە لە تواناداییێ پەنا ببردرێتە بەر دایەرە سەرەکییەکان (سەرچاوە) یاخود سود وەرگرتن لە خزمەتیان وەك پسپۆر دوای ئەوەی لە کارەکانیان خانەنشین دەکرێن.

ئەرشێفەکانیش دەتوانرێ بەمانەی خوارەوە بابەت بکرێن:

**١ - ئەرشیڤی مێژوویی :(The- historical Archives)**

**هەموو ئەو بەڵگەنامانەی تێدایە کە دەربارەی مێژووی وڵاتن لە هەموو لایەنەکانی سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتیو رۆشنبیریو هونەریو سوپاییو وهی ترەوە. بەڵگەنامەکانی بەسەر بابەتەکانی تری ئەرشیڤەکاندا دابەش کراون، هەروەکو زانراوە هەموو زانستێك لە زانستەکانو هەموو چالاکییەك مێژووی خۆی هەیە.**

**٢ - ئەرشیڤی داوەریی : The judical Archives**

بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دادو دادگاکانو دەستە یاسادانەرییو داوەرییەکانی تێدایە، لەگەڵ یاساو سیستەمو دادگا تایبەتییەکانو ئەوەی پەیوەندی بە پیاوانی یاساو دادوەرەکان هەیە..

**٣ - ئەرشیڤی ئەدەبو هونەر : The Archives of Heterature and Arts:**

دەکرێ هەموو ئەو بەڵگەنامانەی تێدا بێ کە پەیوەندییان بە بزوتنەوەی رۆشنبیرییەوە هەیە لە وڵاتدا لەگەڵ چالاکی کۆمەڵەو دامەزراوە ئەدەبیو رۆشنبیرییەکانو بەڵگەنامەی پیاوە ناودارەکان لە مەیدانی رۆشنبیریو

هەڵبەست‌و ئەدەب‌و ڕۆژنامەنووسی‌ی تێدەبی دا .

ئەرشیڤی هونەریش بەڵگەنامەی دامەزراو دایەرەو کۆمەڵو یانە هونەری‌یەکانی تێدایەو چالاکی‌یە هونەری‌یەکانیش دەگرێتەوە وەك سینەماو شانۆو موسیقاو گۆرانی‌و هونەری تەشکیلی وێنەو وێنەو کۆڵین‌و سواڵەت‌و هی تر ، سەرەڕای ئەو ئەرشیفەی کە هونەری خانوسازی‌و ئەندازیاری‌و بینای تێدایە .

**٤ – ئەرشیڤی سیاسی :– The Political Archives**

بەڵگەنامەی پارتی‌و کۆمەڵو دەستە سیاسی‌و بەڵگەنامەی پیاوە ناسراوەکانی چالاکی‌یە سیاسی‌یەکانی تێدایە . هەروەها دەتوانرێ پەیمان‌و ئەو ڕێککەوتنانەشی تێدا هەڵبگیرێ کە لە نێو دەوڵەتە بێگانەکان دەبەسترێ‌و ڕاپۆرتە گرنگەکانی کۆبونەوەسیاسی‌یەکانیش .

٥ – ئەرشیڤی بەڕیوەبردن : **The Archives of Administration**

بەڵگەنامەی وەزارەت‌و دامەزراوو دایەرەکانی میری بە جۆرەکانیەوەو زانکۆکان‌و ئامۆزگاو دەستە جۆربەجۆرەکان‌و هەروەها کۆمپانیاو ئەو دەزگایانەی تێدایە کە کاروباری جۆر بەجۆر دەکەن‌و چالاکی بەڕێوەبردن دەنوێنن .

**٦ – ئەرشیڤی سوپایی : The Millitary Archives**

بەڵگەنامەکانی وەزارەتی بەرگری‌و فڕۆکەوانی‌و دەریایی‌و جەنگەکان‌و دۆزینەوە جەنگی‌یەکان‌و چەك‌و تفاق بە جۆرەکانیەوەو نهێنی‌یە سوپاییەکان‌و بەڵگەنامەکانی دادگا سوپاییەکانی تێدایە وەك زانراوە زوربەی ئەرشیفە سوپاییەکان هەر لە ژێر چاودێری دەسەڵاتە سوپاییەکان‌دا ماونەتەوە چونکە نهێنی گرنگیان تێدایە .

**٧ – ئەرشیڤی دامەزراوو دەزگا ئاینی‌یەکان :**

**بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ئەوقاف‌و مزگەوت‌و کلیسەو کۆمەڵو قوتابخانە ئاینی‌یەکانی گشت تایەفەکان‌و فتوای پیاوە ئاینی‌یەکانی تێدا هەڵدەگیرێ .**

**٨ – ئەرشیڤی نهێنی :**

ئەو بەڵگە نهێنی‌یانەی تێدایە کە پەیوەندی‌یان بە سەلامەتی‌و ئاسایشی دەوڵەت‌و سیاسەتەکەیەوە هەیە وزۆر جار ئەم ئەرشیڤە لە ژێر چاودێری کەسێکی لێپرسراوی پایە بەرزدا دەبێ کە بە سەرۆکایەتی کۆمارەوە یاخود بە ئەنجومەنی وەزیرانەوە یان بە وەزارتی ناوخۆوە بەند دەبێ لە حاڵەتی نائاسایی‌و هەڵویستی سیاسی بەولاوە ڕێگا نادرێ کە بەڵگەنامەکانی ئەم ئەرشیفە ببینرێ .

**٩ – ئەرشیڤی نەخشەو ئەتڵەسەکان :**

ئەم ئەرشیفە نەخشەکانی دەوڵەت‌و هەموو ئەو ئەتڵەسانەی تێدایە کە تایبەتی بە خاك‌و پارێزگاو شارەکانیەوەو ئەوەی پەیوەندی بەوڵاتەکەوە هەیە لە کاروباری سیاسی‌و ئابوری‌و جوگرافیایی‌و هی تردا .

**١٠ – ئەرشیڤی مۆرو دروشم‌و پارە :**

ئەو مۆرە کۆن‌و نوێیانەی تێدایە کە ئێستا کە بەکارناهێنرین هەروەها دروشم‌و ڕەمزو ئاڵاو پارە بە هەردوو جۆری کاغەزو مەعدەنەوە .

چاوکەوتن بەم بەڵگەنامانەوە کە لەم ئەرشیڤانە دا هەڵگیراون‌و سود لێوەرگرتنیان لەلایەن مامۆستاو لێکۆڵەرەوانەوە دوای ئەوە دەبێ کە لایەنە لێپرسراوەکان بە نووسراوی تایبەتی ڕەزامەندی خۆیان نیشان بدەن ، بەڵگەنامەکانی وەزارەتی پەروەردە ( زانیاری پێشو) بەبێ ڕازی بوونی ئەم وەزارەتە نابێ‌و هەمان شت سەبارەت بە وەزارەت‌و دایەرەکانی تر ، ئەم بنەرەتەش لە خانەی ئەرشیفەکانی گشت دنیادا پەیرەو دەکرێ .

**سەرچاوەکان**


یەکەم : سەرچاوە عەرەبی‌یەکان :

١ – الوثائق التأريخية للاستاذ المرحوم محمد احمد حسين . القاهرة – ١٩٥٤ .

٢ – علم تحقيق الوثائق – المعروف بعلم الدبلوماتيك . بقلم : سالم عبود الألوسي . بغداد ، ١٩٧٧ .

٣ – دليل دور الوثائق ومراكز التوثيق في الوطن العربي – المنظمة العربية للتربية والثقافة والعلوم . جامعة الدول العربية ، القاهره ، ١٩٧٣ .

٤ – مجلة ( الوثائق الوطنية الجزائرية – العدد الأول ١٩٧٣ .

٥ – نشرة صادرة عن دارة الملك عبدالعزيز - الرياض ١٩٧٣ .

٦ – كتاب الفرع الاقليمي للوثائق ( عربيا ) : بقلم سالم عبود الألوسي – بغداد ، الطبعة الثانية ١٩٧٧ .

دووەم : سەرچاوە بە زمانی تر :

**1. Encyclopaedia Britanica, 1973.**

**2. Encyclopaedia International, Grolierm New York 1966.**

**3. Encyclopaedia of Libraries and Informations Sciences**

**ol. 1**

**y. Harold Lancour and Allen kent 1967.**

**4. Historical Records of the Government of Canada, Ottawa, 1978.**

**5. National Archives of New Zeland 1978.**

# چارەسەرکردنی

# هۆیەکە بۆ ڕزگاربوون

جمال عمر وەری گیراوە



# دەروونی

# لەترسە دەروونی یەکان

## بەشی یەکەم

شتێکی ئاسایی یە گەر هەموو مرۆڤێك هەست بەترس یان دڵەڕاوکێیەکی (قلق) کاتیی بکات لەهەندێ هەڵوێستی ڕۆژانەیدا ، بەڵام ئەم ترس و دڵەڕاوکێیە لای زۆرکەس کە ئەتوانین بەهەزاران بیانژمێرین ئەبێتە نەخۆشی‌یەك کەتاکو ماوەیەکی زۆر بەرۆکیان بەرنادا . .

دڵەڕاوکێ وەکو ناساغی‌یەك ، بریتی‌یە لەوەی کە هەڵچوونی مرۆڤ بەرامبەری ئەو شتانەی ڕووبەڕووی ئەبنەوە لەسنووری ئاسایی و زانراوی خۆی دەرئەچێ .

زۆر کەسان ئەم دڵەڕاوکێیە بەشێوەیەکی کت‌وپڕ زاڵ ئەبێ بەسەریانا تەنانەت لەکاتێکا کە لەشەقامەکاندا ئەڕۆن بەبێ هیچ هۆیەکی ڕوونیش .

ئەم دڵەڕاوکێیە تاوێکی زۆریان بۆ ئەهێنێ هەتا ئەبێتە ترسێکی گەورەو پەکیان ئەخات ، هەروەك بڕێك کەسی دیکە هەن تووشی جۆرە گرژبوونێکی دەروونیی کاتیی و ترسێکی وەها ئەبن کە لەبنەڕەتدا بارودۆخی ژیانیان گێرمەو کێشەو چەڵەمەیەکی وەهای تێدانی‌یە کەشایانی ئەوەبێ ئەو کەسە تووشی ئەو حاڵەتە دەروونی‌یە بکات ، هەر ئەمەیشە وامان لێ ئەکات کەناوی (ناساغی دڵەڕواکێ) بنێین بە تەوێڵی ئەو حاڵەتە نائاسایی‌یەوە .

لەم بوارەدا ئەتوانین دەستنیشانی دوو جۆر لە دڵەڕاوکێ بکەین ، یەکەمیان دڵەڕاوکێیەکی گشتی‌یە ؛ ئەویش لەوەدا کۆئەبێتەوە کە ئەو کەسە هەست بە گرژبوون و خەمێکی هەمیشەیی بکات . ئەم جۆرە کەسانەش تووشی جۆرە گرژبوونێکی مێشکی و هەڵچوونێکی خێرای هەمیشەیی ئەبن .

بەلاّم هەرچی جۆری دووەمیانە نیشانەکەی لەوەدایە کە ئەو کەسە تووشی هەندێ نۆرە ترس و سامێکی وەها ئەبێ زۆر جار وای لێ ئەدیێ بەبێ هیچ هۆیەك بیری بۆئەوە ئەچێت کە لەمردن یاخود شێت بوون نزیك ئەبێتەوە ، هەر لەو کاتەشدا لێدانی دلّ بەرەو زیادبێ ئەچێت . پزیشکە دەروونی‌یەکان لەو بروایەدان کە ئەم دووجۆرەی ئەم نەخۆشی‌یە جیاوازن .

هەندێکی دیکە هەن کە لە شوێنە گشتییەکاندا یان بەرزایی ئاسماندا ئەم ترسەیان لێ ئەنیشێ ، ئەوانەیشی کە تووشی ئەم چەشنەیان دێن حەزناکەن یان ئەترسن لەوەی کە بەتەنهایی بچنە دەرەوە یاخود بەبێهاوڕێ بچنە سەفەر .

ئەم نەخۆشی ترسە بەزۆری لەدوا دوایی قۆناغی هەرزەکاری یان سەرەتای تەمەنی بیست ساڵیدا دەست پێئەکات . شایانی باسە کە بەلایەنی کەمەوە بەسێ قۆناغدا تێئەپەرێ ؛ لەقۆناغی یەکدا نەخۆشەکە وا هەست ئەکا کە هیچی نی‌یەو بەلاّم بەبێ هۆیەکی روون و ئاشکرا تووشی نۆرە ترس ئەبێ ، زۆر جار خۆیشی پیشانی دکتۆرێك ئەدا بێ ئەوەی دکتۆرەکە هەست بەو هۆیە بکات .

کە تووشی ئەم حالەتەی کردووە بەتایبەتی ئەو کاتەی کە تان و پۆی نەخۆشی‌یەکە کەم ئەبێتەوە . . پاش ئەوە نەخۆشەکە تووشی نۆرە ترسی دووەم و پاشان سێیەمیش ئەبێ ، لە نێوانی هەر نۆرەیەك و نۆرەیەکی دیکەدا هەست کردنی نەخۆشەکە بە گرژبوونە دەروونی‌یەکەو ترس دەست پێئەکات ، ئەم قۆناغی زیادبوونەش بە قۆناغی دووەمی ئەم نەخۆشی‌یە نەفسی‌یە دائەنرێ – کە بە قۆناغی ترسی ناوبەناو ناوزەد ئەکرێ – ، جا ئەوەی شایانی باسیش بێت نەخۆش لەم حالەتەدا هەوڵی ئەوە نادات کە یارمەتی و هاوکاری لەلایەن ئەم و ئەوەوە دەست بکەوێ هەتاکو ئەگاتە قۆناغی سێیەم ، ئەویش بریتی‌یە لە قۆناغی – دوورکەوتنەوە – کە بریتی‌یە لە دوورکەوتنەوە لەو هەڵوێستانەی کە نەخۆش تیایدا هەست بەترس ئەکات بەوەی کە یارمەتی و هاوکاری دەست ناکەوێت کاتێك نۆرە ترسی تووش ئەبێت .

کە نەخۆش ئەگاتە ئەم قۆناغی سێیەمە حەز بەوە ناکا کە بەتەنهایی گەشت و گەران بکا ، تەنانەت ئەگەر خاوەنی ئۆتۆمبیل بێت حەز بەوە ناکاکە ئۆتۆمبیلەکەی بەسەر پردێك یان ناو تونێلێکدا بتاژوێ ، ئەگەر چووشە سینەما حەز بەدانیشتنی سەر ئەو کورسییانە ئەکات کە ئەکەونە ئەمسەری یان کەناری رەوەکانی سینەماکەوە ، هەروەها لە کۆبوونەوە گشتییەکانیشدا کورسی‌یەکانی بەشی دواوە هەڵئەبژێرێ بۆ دانیشتن .

ئەو دیاردانەی کە ئەو کەسە نەخۆشە هەلس و کەوت لە چوارچێوەیاندا ئەکات ئەوە دەرئەخات کە لە برێك کاروباری جیاواز ئەترسێ ، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کەسە لە راستەقینەی حالەتەکەیدا لە یەك شتی سەرەکی ئەسلەمێتەوە ئەویش ئەوەیە کە تووشی نۆرە ترسێك ئەبێ وای لێ ئەکات بیر لەوە بکاتەوە یان لەوە بترسێ کە لەو بارەی تێیدایەتی توانای ئەوەی نەبێ بە هیچ کارێك هەستێ . ئەو ترسەشی کە تووشی ئەم جۆرە نەخۆشە دەروونی‌یانە ئەبێت لە رادە بەدەرە ، بەشێوەیەك وەکو ئەو کەسانەیان لێ بەسەر دێ کە لە ژوورێکدان و پڵنگێك دێتە ژوورەکەیانەوە ، یان هەست بە دڵتەنگی و ئازار لەسنگدا ئەکەن هەروەك ئەوەی وایان بە بیردا بێت کە لە مردن نزیك بوونەتەوە ، یان کاتێك ئەو کەسانە بە پێوە ئەوەستن هێزیان لەبەر ئەبرێو وایان لێ ئەدیێ قاچی‌یان توانای هەڵگرتنی لەشیانیان نەبێ ، لەهەمان کاتدا پەلوپۆی تووشی کۆمەڵێك نۆرە ئالۆ سەرمای یەك لە دوای یەك و هەروەها ئارەق کردنەوەیەکی زۆر ئەبێ کە ئەبنە هۆی هەڵ لەرزینی ماسولکەکانی .

ئەم نەخۆشی‌یە ئەچێتە قالبی تاقیکردنەوەیەکی ناقۆلای ژیانی ئەو کەسەوە ، زۆر جار ئەوکەسەی کەتووشی ئەم جۆرە ترسە ئەبێ ئەچێتە لای پزیشکێکی دڵو وائەزانێ نەخۆشی دڵیتی ، پزیشکی دڵیش دوای تاووتووکردنی هیچی تیا بەدی ناکاو رەوانەی دکتۆرێکی نەفسی ئەکا .

لێکۆڵینەوە زانستی‌یەکان دەریان خستووە کە لە توانای زانیاریی پزیشکی دا هەیە ئەم حالەتەی نەخۆش بەرەو چاك بوونەوە بەرێ ، ئەویش بەوەی کە هەندێ داوو دەرمانی دژی – ( دڵ گوشران ) – ی بدرێتێ لە بری ئەوەی کە دەرمانی هێمن کەرەوەی مێشکی پێ بدرێ ، هەروەك دەریشکەوتووە کە ٩٠٪ ی ئەو نەخۆشانەی بەداوو دەرمانی دژی – دڵ گوشران – چاریان کراوە بەرەو چاك بوونەوە چوون ، لەو دەرمانانەش وەکو (ئیمیبرامین) . . .

وەکو زۆربەی چارە سەرە پزیشکییەکانی تر ئەم جۆرە چارە سەرەش هەندێك ئاکامی لاوەکی لێ ئەبێتەوە ، لەو ئاکامانە کە لە ئەنجامی خواردنی داوو دەرمانەوە دێتە دی وەکو دەم وشك بوون ، بەلاّم ئەم جۆرە ئاکامانە ئەوەندە ئاڵۆزو کاریگەر نین تا ببنە هۆی مەترسی .

زۆربەی زۆری ئەو نەخۆشانەی کە ئەم جۆرە داوو دەرمانانەیان پێئەدرێ ، واتە داوو دەرمانی دژ بەدڵ – گوشران ، هەوڵ ئەدرێ کە بەردەوام بیاندرێتێ – تاکو ماوەی شەش مانگ – بەشێوەیەکی بەردەوام تاکو ئەو کاتەی نەخۆشەکان هەست بەوە ئەکەن کە حاڵەتیان بەتەواوی باش بووە ، ئەمە لەگەڵ ئەوەی پێویستە بزانین کە ٢٠٪ ی ئەو نەخۆشانە جاری وا هەیە لە ماوەی ساڵێکدا نۆرە ترس بەکەمی دایان ئەگرێ کە پێویست وایە هەمان چارە سەریان بۆ بکرێ .

شایانی باسکردنیشە بڵێین ئەو نەخۆشانەی کە تووشی ترسێکی نائاسایی دێن ، بەڵام نۆرە ترسی قورس دایان ناگرێ پێویستە برێك هێمن کەرەوەی مێشکیان پێ بدرێ ، لەگەڵ ئەوەی کە ئەو لێکۆڵینەوانەی لەسەر ئەو نەخۆشانەی تووشی ترسی نائاسایی سووك بوون بەتەواوی نەیان چەسپاندووە کە ئەم جۆرە داوو دەرمانە سوودێکی ئەوتۆی هەبێ .

* * *

## بەش دووەم

### ئایا بۆماوە( الوراثە) ڕۆڵی خۆی ئەگێڕێ لەو بوارەدا

لەم بوارەدا هەندێك بەڵگەی نیمچە سەلمێزاو هەن ئەوە ئەگەیێنن کە تووشبونی کەسان بەم نۆرە ترسە پەیوەندیی هەیە بە ( بۆماوە – الوراثە)ەوە ، هەر لەوێشەوە ئەوە ئەگەیێنن کە ئەم نەخۆشی‌یە ، هەرە هۆی سەرەکیی گەشە سەندنەکەی بریتی‌یە لە ڕەگەزی بۆماوە نەك هۆی ڕۆشنبیري یان هۆی دەوروبەر . کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەی زانستیش هەنکە ئەوە ئەگەیێنن ، بەڵام بەشێوەیەکی کەمتر . . . هەروەك زۆربەی نەخۆشەکانیش ئەوە ئەڵێن کەدایکیان یان باوکیان کاتی خۆی تووشی هەمان نەخۆشی هاتوون . لە لایەکی دیکەوە دکتۆرەکانی دەروون ڕوونیان کردۆتەوە کە نزیکەی ٢٠٪ ی ئەو نەخۆشانە خاوەنی سەربردە یان مێژوویەکی وەهان کەدەلالەتی ئەوە ئەکات ئەمانە لە قۆناغی مناڵیدا هەمیشە تووشی گرژبوونی دەروونیی بوونو لە ژیانیشیان بەزۆري پشتیان بە دایكو باوكو ئەو کەسانەی کە بەردەوام لە تەکیانا بوون بەستووە ، دکتۆرەکان لەو بڕوایەدان .

ئەم ڕەوشتی پشت پێبەستنە لە قۆناغی مناڵیدا بەشێوەیەکی لەڕادەبەدەر ئەوە دەرئەخات کە عاتیفەی ئەو جۆرە کەسانە لەو ئەمدا ئامادەمان ئەکات بۆئەوەی لەگەورەییاندا تووشی ئەو نۆرە ترسە ببن .

زۆربەی زۆري ئەو جۆرە چارەسەرە دەروونیانەی لەم پێناوەدا ئەکرێن – جگە لە مەسەلەی داوو دەرمان – لە شێوازی = ڕازی‌کردن یان قەناعەت پێکردندا = دێنە دی ، ئەمە سەرباری ئەمەی کە ئەو نەخۆشانەی بە هۆی حاڵەتێکی تایبەتیو نائاساییەوە تووشی ئەم نەخۆشی‌یە بوون چەند جارێ بخرێنە هەمان حاڵەتەوە کە بۆتە هۆی ترس پێپەیداکردنیان ، وەکو ئەوەی کە یەکێك ترسی هەیە لەوەی بەناو تونێلێکدا تێپەڕێ ، جا بۆ چارەسەرکردنی پێویستە چەند جارێكو لەگەڵ کۆمەڵێك نەخۆشی دیکەدا بەر – شوێنەدا ببرێ ، چونکە ئەگەر کۆمەڵێك نەخۆش بن ، ئەوە لەدووسەرەوە باشە ، یەکەمیان لەبەرئەوەی نەخۆشەکە هەست ناکا بەوەی تەنها خۆی ئەو حاڵەتەی هەیە ، دووەمیشیان لەبەر ئەوەی جۆرە هێزو بڕوایەك دروست ئەکات . . . ئەمە لەگەڵ ئەوەی پێویستە ئەوە لەیادنەکەین کە لەم کاتی تاقیکردنەوەیەدا پێویستە داوو دەرمانی – دڵ گوشران – ی پێبدرێ ، نەکا لە ناکاودا نەخۆشەکە تووشی نۆرەترسێکی قورس ببێو زیانێکی زۆری پێبکات .

* * *

## بەشی سێیەم

### ڕۆڵی خێزانو هاوڕێیان لەم چارەسەرەدا

شایانی باسە کەخێزانو هاوڕێیانی نەخۆشەکە ڕۆڵێکی گرنگ لەم ڕووەوە ئەگێڕن ، گومانی تیانی‌یە ئەگەر خێزان یان هاوڕیانی نەخۆش هەستیان بەوەکرد کە نەخۆشي ترسو دڵەڕاوکێ ، چارەسەري چزیشکیيو دەروونیی توانای زالبوونی هەیە بە سەریا ئەوکاتە یارمەتی‌یەکی چاکی نەخۆشەکە ئەدەن بۆ ئەوەی بگاتە چارەسەرێکی ڕاست ، هەروەك دەریشکەوتووە کە ئەو کەسانەی تووشی ترسە نەخۆشی ئەبن وەکو ئەو کەسانە ئاڵۆز نین‌کەتووشی نەخۆشی شیزۆفرینیا یاخود دڵ گوشرانی قورسو تیژ ئەبن ، هەر – لێرەیشەوە ئەگەینە ئەو بڕوایەی کە ئەوانەی نەخۆشیی ترسیان هەیە بەرێكو پێکیي ئەتوانن کارو کردەوەی خۆیان وەکو زۆربەی خەڵکی دیکە جێبەجێ بکەن . هەروەها دۆستایەتیي لەگەڵ هاوڕێو هاودەمی خۆیاندا ببەستنو ژیانێك بژین کە لەناوەرۆکیا ژیانێکیي سروشتيو چالاکانە بێت

**لە گوڤاری طبیبك ژمارە ٢٧٤ سالی ٩٨٠ وەرگێردراوە.**

# لادانی منال*

## هۆیەکانی و چارەسەرکردنی

**یعقوب قصاب**

منالْ که دەبیْ به رەوشتو خووی کۆمەلْ نازانیْ ، وناتوانیْ به شێوەیەکی راست بیربکاتەوه ، منالْ له ئارەزووو خواستەکانی له ئەندازه بەدەرو بیْ سەرو بیْ جێیه ، بۆ خۆیشی خۆپەرسته هەر شتێك بەردەستی کەوێت وەری‌دەگریْ بەبیْ خوا‌ ‌ ‌بخسەتو زەوتی‌دەکات ، قیژاندنو پەلاماردان چەکێکه بو بەدی‌هێنانی خواستەکانی ، ئەو کاته ئەگەر دایكو باوکی ئارەزووه سروشتی‌یەکانی نەهێنەدی سەرفرازو بەرەڵلا دەبیْ له رەفتارو نەریتی ، واته لائەدات له رەوشتی شیاو . لەم بابەتەوه «جۆن دیوی» دەلیْ : —

**«منالْ خۆپەرسته دەیەویْ هیچ کەسانێك هاوبەشی نەکەن له کارەکانیدا بۆ وەدی‌هێنانی ئارەزووەکانی خۆی .»**

منالْ له خۆ پێشاندان حەزدەکات وه به زۆری لەلای خەڵکی نەناسراو ، بەتایبەتی ئەگەر بیْ‌بەش بیْ له سۆزو میهری دایكو باوکی ، ئەمەش بۆ ئەوه دەکات سەرنجیان رابکێشیْ بۆ خۆیو دەری‌خا کەوا جێگای رەزامەندی‌یه ، له لایەکەوه دایكو باوکی ئەم رەزامەندی‌یان پیْ نەبەخشیوه ، هەروەها به سروشتی‌یەوه حەزدەکات له لێکۆڵینەوەو داهێنانو پشکنین ، بۆ ئەم مەبەستەش جمو جۆلْو چالاکی‌یەکانی بەدیار دەخات ، کەچی دایكو باوکی نەفامیش کۆمەڵێك فەرمانو ئامۆژگاری گرانی بەسەردا دەسەپێنن به مەبەستی پەكخستنی له جمو جۆلْو چالاکی‌یەکانی . وەیان دەیانەویْ فێری هونەری بکەن به بێژەی رووت که تێیان ناگات ، ئەویش تووشی کێشه دەبێت لەنێوان :

ئارەزووەکانیو ئارەزووی دایكو باوکی ، دەیەویْ بێزار بیْ له دەسەلاتو رکێفیانو بەرهەڵستیان‌بکاتو یاخی‌بیْ له رەوشتیان . لەم بابەتەوه دەروونناسان دەڵێن : —

«چەند هەرەشەو گورەشه له منالێك کرانەوه تینی بەرهەڵستیان زیاددەکاتو فێری سەرکێشی‌و دژوەستان بەرامبەریان ئەکات» .

دەشیْ منالێك لەبەر کەم توانا هۆشی‌و نەتوانیْ ئەرکه زۆر گرانەکانی قوتابخانه جی‌بەجیْ‌بکات ، ئەمەش دەبێته هۆی سەرنەکەوتنی له ژیانی قوتابخانەیی‌و بەدگومان بیْ .

به سەرژماردن بەدیار کەوتووه کەوا «٧٠٪ — ٨٠٪»ی لادانی منالْ دەگەرێتەوه بۆ ئاژاوەی نێوانی خێزان ، ئەوسا چ بەهۆی : —

أ — **بەرەڵلاکردن** ، که منالْ بیْ‌بەش دەکات له سۆزی دایكو باوك ، ئەمەش دەبێته هۆی کەم ئاراستەکردنی بۆ رێگای راست .

ب — **مردنی دایك یان باوك** ، وەیان هەردووکیان که منال بیْ بەری‌دەکات له : — دڵنیایی دەروونو له چێشتنی خۆشی‌ی بەر سێبەریان ، له ئاکامدا تووشی گەرداوی ژیان دەبێتو ناتوانیْ بەرهەڵستی بکات .

جـ — **زۆری ئاژاوەو ناکۆکی نێوان دایكو باوك** کاردەکاته سەر کەسێتی منالەکه ، چونکه بەشداریان دەکات له هەموو ئەو ناخۆشی‌یه . لەم بابەتەوه «ئایرنست وور» دەلیْ : «ئاژاوەی خێزان کاردەکاته سەر دەروونی منالْو بیروراکانی بەرامبەر به ژیان» .

به سەرژماردن بەدیار کەوتووه کەوا هەژاری چاووگەیەکه بۆ بلاوبوونەوەی بیروباوەری بۆگەنو کۆنەپەرست لەناویاندا . ئەو منالەی تووشی کلۆلی کەم خۆراك بیْ ، ئەوه هەرگیز هەست ناکات به دڵنیایی‌و ئارامی ، له ئەنجاما لەشی بیْ‌هێزو لاواز دەبیْو گیانیشی پەشۆکاو دەبیْ ، پی‌زانینی بۆ جیهانی دەرەوه دەشێویْو بەد دەبیْ . هەروەها نەبوونی خانووبەرەی باش دەبێته هۆی بیْ‌بەش‌بوونی منالْ له هێمنی ، وه مەست نەکردنی‌و نەچێشتنی خۆشی لەناو هەوای سازگارو بەرەڵلا ، ئەمەش

ـەبێتە هۆی تووش‌بوونی بە نەخۆشی کە کاردەکاتە سەر ـەرمانەکانی هۆشی‌و پەشۆکاوی دەروونی زیاددەکات. هەروەها خانووی بە جمەو قەڵەبالغ دەبێتە هۆی سەر شێوانی ـ ـ ێو پشت نەبەستن بە خەڵك ، هەروەها منالێ لەم مەڵبەندە ـێبەش دەبێ لە هاوڕێیەتی دایك و باوکی ، ئەوانیش بوارەیان ـبێت بۆ ئەوەی گیروگرفتی منالەکەیان شی‌بکەنەوە ، ئەوسا ـردەبێ لەناو دەوروبەرێك وە لە ئاژاوەدا ژیان ئەباتە سەر. گوێ نەدانی دایك‌و باوك بۆ منال‌ێو سەرنەکەوتنی لە ژیانی قوتابخانەیی‌و دابین نەکردنی پێویستی‌یەکانی‌و ، نارەحەتی باری خانووبەرەو ، سوود لێ‌وەرنەگرتن لە کاتەکانی بێ‌ئیشی ئەمانە هەموویان پاڵ بە منالەوە ئەنێن بۆ سەر شەقام‌و کۆڵان‌و گەڕان‌و سووڕان لەگەڵ هاوڕێیەکانی بۆ یاری‌کردن هەوای سازگار شتی جوان‌و بریقەدار سەرنجی منال ، ڕادەکێشی‌و هەڵی ئەخەڵەتێنێ ، بۆ وەدەست‌هێنانی پارە کە ناچاردەبێ پەنا بباتە بەر ڕێگای ناپاك‌و خراپی.

تەلەفزیۆن‌و سینەما هەستی منال دەورووژێنن‌و بابەتەکانیان زوو دەچنە دڵی‌یەوە ، هەروەها ئارەزووەکانی پێ دابین‌دەکا.

ئەوەش لە بیرمان نەچێ کەوا هەندێ گۆڤاری گەندە بابەت‌و ڕۆمانی پۆلیسی ، هەندێ بیری پڕوپووچ‌و تەنگ‌و هەڵە دەربارەی مرۆڤ‌و خواستەکانی کە گیانی خۆپەرستی‌و زۆرو ستەم ئەبزوێنێ ، ئەمانە کاردەکەنە سەر خووڕەوشتی منالەکە ، دەشێ پەیڕەوی ڕەوتی ڕۆمانەکە بکات‌و لاسایی‌یان بکاتەوە.

هیچ گومانی تیادا نی‌یە کەوا شەڕ کە تەرو ووشك پێکەوە دەسوتێنێ ترس‌و لەرز لەناو دڵی هەموو منالێك بلاودەکاتەوە ، وە بێبەشی دەکات لە دڵنیایی‌و خۆشی لەناو خێزان‌دا چونکە ئەبینێ باوکی وا لە مەیدانی شەڕا ، دایکیشی خۆی تەرخان‌کردووە بۆ دابین‌کردنی نانی ڕۆژانە ، ئەویش فەرامۆش کراوەو ماوەتەوە بەبێ چاودێرکردن ، ئەمانە دەبنە هۆی سەرلێ‌شێواندن‌و کێشەی دەروونی ، نازانێ کامیان ڕاستن‌و کامیان چەوتن دەشێ تووشی لادان بێت لەبەر ئەم کێشە دەروونی‌یەی ، ئەوەش لەبیر نەکەین کەوا شەڕ بێبەشی دەکات لە کارگوزاری ڕۆشنبیری‌و کۆمەلایەتی‌و تەندروستی‌و دەرامەتی ، دەشێ فڕێبداتە ناو شەقام‌و چۆڵی ئەوسا دوور نی‌یە بەرەڵلابێ‌و تووشی خراپە بێ.

**چارەسەرکردنی لادان**

**١ - سازدانی مەڵبەندێك تا پێویستی‌یەکانی منال دابین بکا**

وەکو لە ڕووی خۆراك‌و جل‌وبەرگ‌و خانووبەرە لەگەڵ سایکۆلۆژی منال هەروەکو منال پێویستی بە سۆزو خۆشەویستی‌و دڵنیایی هەیە. تا بە باشی پەروەردە بێ ئامادە بێ بۆ خۆبەخت‌کردن لە پێناوی داخوازی‌یەکانی‌دا.

**٢ - دەبێ دایك‌و باوك بەشدار بن لە پەروەردەکردنی** منالیان بەیەك ڕێڕەوی پەروەردە ئالوویلی لەگەڵدا بکەن ، ئەم ڕێڕەوەش سووربێ لەسەر پوخت‌کردنی ڕەووشتەکەی‌و ڕاگیرکرانی لەسەر خۆشەویستی‌و ڕابەری تێگەیشتن. لەم بابەتەوە پزیشك «کولات» دەڵێ: **«هۆی لادانی منال وەستاوە لەسەر پەیوەندی دایك‌و باوك بە منالیانەوە ، بەتایبەتی باوك کە دەبێ جلەوی بۆ شل‌نەکات بۆ هەموو هەستان‌و دانیشتنێك ، پێویستە هەڵوێستی ئاشکرای هەبێ دەربارەی کاروباریان.**

**٣ - ئەو ناوەندی‌یە ڕۆشنبیری‌یەی کە منال تیایدا دەژی** کاردەکاتە سەر ڕۆشنبیری‌یەکەی ، لە هەمان کاتیش‌دا بیری نەش‌و نما دەکات‌و ئاگانامەی کە بۆی پێشکەش دەکرێت ، هەروەها ڕۆشنبیری دایك‌و باوك کار دەکاتە سەر ڕەفتاری منال.

**٤ - بایەخ‌دان بە دەروونی منال پێش فێرکردنی لە قوتابخانە** واتە دەبێ پرۆگرامەکانی بگونجێ لەگەڵ پلەی بیری ، لەهەمان کاتیش‌دا دەبێ پەیوەندیی بەتین هەبێ لەنێوان قوتابی‌و مامۆستاو بنچینەی پەیوەندییان لەسەر ڕێزلێنان‌و دۆستایەتی‌و خۆشەویستی دامەزرێ.

**٥ - پێویستە منال هەست بکات بە دڵنیایی دەروون** لە مەڵبەندی ماڵ‌و قوتابخانەو کۆمەڵ ، تاکو تووشی نەسرەوتی دەروون نەبێت‌و بە دڵنیایی‌و خۆشی‌یەوە ژیان بگرێتەبەر.

**سەرچاوەکان :**


١ - انحراف الصغار/سعد المغربي
٢ - انحراف الصغار/جان شازال
٣ - انحراف الصغار/شالز و. ليونارد
٤ - عيادات العلاج النفسي/د. محمد خليفة بركات
٥ - المشاكل الانفعالية للنمو/ترجمة الدكتور السيد محمد خيري
٦ - مشكلات الطفولة في المجتمع المدرسي جليل شكري عجبان
٧ - التربية وطرق التدريس/جـ ٢. الاستاذ صالح عبد العزيز وزميله
٨ - جريدة الراصد/العدد (٥٣٣) في ٤ - ١٩٨٠/٥/١٠

# ئۆجین دیلاکرۆ

## پیشرەوای رومانسە



شاعیری فەرەنساوی بەناوبانگ چارل بۆدلێر دەڵێت : ( ئەگەر ئۆجین دێلاکرۆ نەبوایە ئێستاکە ئەڵقەیەکی زنجیرەی شارستانیەت کەم دەبوو .) بێگومان شاعیر راستی کردوە ، بگرە دێلاکرۆ لەوە زیاتر مەزنترەو بەیەکێك لەگەورەترین دامەزرێنەرانی قوتابخانەی رۆمەنسیەت دادەنرێت . ئەو قوتابخانەیەی کەسەدەی نۆزدەهەم ژانی لەدایك بوونی بوو فەرەنساو هەموو جیهانی هەژاندو شلەقاندی .

**جوانی ی بەبێ هیچ هەولو تەقەللایەك نادۆزرێتەوە .**

● **ژیانی ئۆجین دێلاکرۆ :—**

هەرکەسێك ئەگەر زۆر یان کەم لەسەر ژیانی ئەم بلیمەتەی خوێندبێتەوەو شارەزایی یەکی دەربارەی هەبێت ، دەزانێت سەرتاپا ژیانی ئەم هونەرمەندە مەزنە هەر لەمنداڵیەوە تا مردنی پڕبوە لە دەردەسەری و قوربانی دان ، وەخۆی زۆربەی ئەوانە لەیاداشتەکانیدا نوسیونەتەوەو باسی کردوون .

دەگێڕنەوە لەتەمەنی منداڵیدا کەوتۆتە نێو ئاوی ( مەرسیلیا) وە لەوەدابوە بخنکێت و ژیان لەدەست بدات ، ئەگەر ئەو دەست و بازوە نەبوایە کەلە ئاوەکە دەری هێناوەو لەمردنێکی مسۆگەر ڕزگاری کردوە . هەرووەها جارێکی تر لەژێر چنگی تاوانکارێکی تردا دەریان هێناوە ، خەریك بوو هەر لەتەمەنی منداڵی دا بمرێت و مرۆڤایەتی لەکارەنایابەکانی بێبەش بێت وئەو دەست و پەنجانە برزێت کەبەرزترین ونایابترین تابلۆی بەپێزی لێهاتونەتە بەرهەم .

**سەرکەوتنی هونەرمەند لەوەدایە کەژیان بە هونەرەکەی بدات**

**محمد ساڵەیی**

دێلاکرۆ تازە خەریك بوودڵی بەدنیای رۆشن خۆش دەکردو لەماناى ژیان تێدەگەیی ، بیستی گوایە لەباوکی خۆی نییەو کوڕی (چارڵ دی تالیران) ی وەزیری دەرەوەی فەرەنسایە . چونکە دێلاکرۆ لە ٢٦ی مانگی نیسانی ساڵی ١٧٩٨ لەشاری شارانتۆنی charenton فەرەەنسی‌دا هاتۆتە رووی جیهانەوە ، ئەمە لەکاتێکدا کەباوکی بەچەند مانگێك پێش لەدایك بوونی لەئەنجامی نەشتەرگەریەكدا تووشی نەزۆکی هاتبوو . ئالەم کاتەی تەمەنیدا دێلاکرۆ بیروڕای بەرامبەر ( ڤیکتۆر ئۆبین ) ی دایکی گۆڕاو قینی لێدەبووەوە ، ئەو دایکەی کەتاماوەیەکی کەمیش لەوەوپێش گەورەترین سۆزو خۆشەویستی بەرامبەر دەنواند . رقو کینەی دێلاکرۆ بەرامبەر دایکی تادەهات پەرەی دەسەندو زیادی دەکرد . بەتایبەتی پاش مردنی چارڵ دێلاکرۆی باوکی لە ساڵی ١٨٠٥ کەیەکێك بوو لەگەورە پیاوانو پایەبەرزانی سەردەمی خۆی . مردنەکەی بووە هۆی ئاوارەبوونو سەرگەردانی دێلاکرۆ ، دایکی لەگەڵ مێردە تازەکەیدا جەنەڕاڵ سێرڤۆنی cervoni چوونە مەرسیلیاو ئەمیان ناردە قوتابخانەی ( لویس لۆگران) ی ناوخۆیی ، لەکاتێکدا کەتەمەنی لەنۆساڵی تێنەدەپەری . لەم ماوەیەی ژیانیدا هیچ نیشانەیەك بەدی ناکرێت بۆئەوەی بکرێتە بەڵگە بۆ داتاشین دێلاکرۆ بەلای هونەری وێنەکێشاندا ، جگە لەوتاقە نامەیە نەبێت کە لەساڵی ١٨١٥دا بۆ هاوڕێکی نووسیوە تیادا دەڵێت :( حەز دەکەم دوای تەواوکردنی قوتابخانە هەندێ وێنەبکێشم . بەلایەنی کەمەوە دەمەوێت شارەزاییەکی رووکەشم دەربارەی هەبێت) .لە ڕاستی‌دا بەهرەی دێلاکرۆ لەوێنەکێشاندا لەساڵی ١٨١٤ بەدواوە دەست پێدەکات ، لەمساڵەدا بۆیەکەم جار وێنەی نابلیۆن بۆناپارت ووێنەی پیاوێکی پیری کۆمو چەند دانەیەکی تری هەڵکۆڵی .

ئۆچێن دێلاکرۆ پاش کارەساتەکەی دایکی بیروڕای بەرامبەر ئافرەتان گۆڕاو بەشێوەیەکی دیکە تێی دەڕوانین .

هەموو دەم لەئافرەتان دوورە پەرێز دەوەستا ، وەهەتا لە توانای دابوایە لێیان دوور دەکەوتەوە . پەیڕەوی ئەو ووتەیەی

سۆكرانى دەكرد كەدەڵێت : ( چاترین ڕێگە بۆ بەرەنگاری کردنی خۆشەویستی هەڵاتنە) بەڵکو بەو لایەنگیریەشەوە نەوەستاو خۆی ئەم ڕستەی خستەپاڵ ووتەی سۆکرات ( ڕاکردن تەنها ڕێگەیەکە بۆ رزگاربوون لەخۆشەویستی) ، وەهەتا مردیش ژنی نەهێنا . لەگەڵ ئەمانەشدا هەمیشە دێلاکرۆ لەشی ئافرەتانی بەجوانترین و بێگەردترین دەستکەوتەکانی خۆی لەسروشتدا دادەنا .

هەندێك لەرەخنەگرانی هونەری لەسەر ئەوە ڕێك كەوتوون كە تاقەهونەرمەندێکە بەجوانترین شێوە ئافرەتی وەکو پارچەیەکی جیانەکراوە لەسروشت وێنەکێشاوەو مافی خۆیانی داوەتێ لە جوانی .

زرنگی وبلیمەتی دێلاکرۆ لەوەدا دەردەکەوێت کە لە چەند مەیدانێکی هونەری کاری کردوەو بەمەردانە ئەسپی خۆی تیا تاوداوەو سەرکەوتوانە کاری تێدا کردوون . لەسەرەتای ژیانیدا زیاتر حەزی بەچیرۆك نووسین دەکرد وحەزی دەکرد نووسراوی خۆی لەگۆڤارو ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمەدا بلاوکاتەوە . ئەگەر لەم لایەنەوە سەیری دێلاکرۆ بکەین واتە وەکو نووسەرێك دەبینین ئەوەندە کتێب و نووسراوی هەمە چەشنەی هەیەکە بەسن بۆ پڕکردنەوەی دوو ڕەفە بەتەواوەتی هەروەها بەسن بۆناسینی وەکو نووسەرێکی لێهاتووی کارامە . بەرهەمە نووسینەکانی دێلاکرۆ بریتین لەمانە :

نامەکشتیەکانی کەلەپێنج بەرگدان ، یاداشتەکانی لەدوتوێ هەزارو پێنج سەد لاپەرەدا نووسراونەتەوە وەکراونەتە سێ بەرگەوە جگە لەچەند نووسینێکی ئەدەبی دیکە کەتیایاندا ڕای خۆی بەرامبەر بەهەندێك لەنووسەرو شاعیرو هونەرمەندانی پێش خۆی دەردەبرێت . لەوانە جان جاك ڕۆسۆ کەبەدرێژی دێلاکرۆ باسی لەسەرکردوە ، بە (ئامۆژگاریکەر) ی ناودەبات وبەهیچ کلۆجێك لەریزی فەیلەسوفەکانی داینانێت ، ئەوەتا لەنامەیەکیدا کە بۆ ڤلیکس جیاردی هاورێی رەوانەکردوە دەڵێت :(هەرچەندە ڕۆسۆ بەتوندی بەرەنگاری باروزرووف بۆگەنی شارەکانی فەرەنسای دەکردو هەستی بە کولەمەرگی و چەرمەسەری هاولاتیان دەکرد ، بەلام نەیتوانی بڕیار بدات کەلە گوندا بژیت وەکو جوتیارو هەژارەکان ! ) دێلاکرۆ شانۆگەری(فاوست) ی گۆتەی زۆر لاپەسەند بوو ، وە لەئەدەبی (رووسی) دا حەزی بەنووسینەکانی گۆگۆڵ دەکرد وە (کچی ئەفسەرەکە) ی پۆشکینیشی پێخۆش دەهات ، بەیەکێك لەشاکاری ئەدەبی ڕووسی دادەنا .

وەکو زانیمان ساڵی ١٨١٤ بەسەرەتای گەشەکردنی دێلاکرۆ دادەنرێت ، لەم ساڵەدا خۆی وەکو وێنەکێشێك دۆزیەوەو هەستی دەکرد ڕۆژ بەڕۆژ بەهرەکەی لە برەودایەوەو زیاتر دەچێتە نێو جیهانی جوانی و سەرسورمانەوە لەنامەیەکیدا بۆهاورێیەکی باسی ئەو ماوە پێشووە دەکات .

کە لەنۆرماندی بەسەری بردووە دەڵێت : (سەرلەبەیانی ئەو ڕۆژە لەلای هونەرمەند گیران Guerin بووم ، ئەو تابلۆیانەم دی کەبۆ پێشانگای داهاتوو ئامادەکرابوون .

چەنداخ دەخۆم کەناتوانم ئەمساڵ هەندێ وانەی لەلا بخوێنم . ئەو هەلە لەدەستی خۆم نادەم دوای تەواو بوونی ساڵی خوێندن خۆم دەگەیەنمە ژووری وێنەکێشانەکەی و دەبێت هەندێك سوود لەبەهرەکەی وەربگرم) . وەنەبێت (گیران) تەنها ماندەری بوبێ بەڵکو لەوەوپێشیش هاموشۆی مۆزەخانەی لوڤەری دەکرد - وەکوخۆی لەیاداشتەکانیدا دەڵێت - هاورێتی بەتینی لەگەڵ تابلۆکانی ڕۆبنز (١٥٧٧ - ١٦٤٠) وتیتیان (١٤٧٧ - ١٩٧٦)وگۆیا (١٧٤٦ - ١٨٢٨) دا پەیدا کردبوو .

لەساڵی ١٨١٥دا دێلاکرۆ ڕووی کردە مۆسیقا وە بڕیاریدا ببێتە هونەرمەندێکی مۆسیقی ، بەلام ئەوەندەی پێنەچوو لەو رایە ، تەوەلابوو وازی لێهێنا چونکە بینی وێنەکێشان زیاتر ڕایدەکێشێت ، بەتایبەتی پاش ئەوەی تابلۆی (گیوماری (Guillemardet) ی هونەرمەندی ئیسپانی گۆیا(Goya) ی بەرێکەوت لەمۆزەخانەی لوڤەردا بەرچاوکەوت . لەهەمان ساڵدا دەستیدایە لاسایی کردنەوەی چەند تابلۆیەکی ڕۆبنزو ڕۆفائیل کەلەمۆزەخانەکان دیبوونی .

پاش مردنی دایکی دێلاکرۆ لەسەر داخوازی خوشکەکەی چووە (لامیزۆن دوکارد) وەلەوێ جێگیر بوو ، لەم ماوەی ژیانیدا هونەرمەند چەند تابلۆیەکی کێشا لەوانە (ئافرەتە ڕۆمیەکان بۆوولات خشڵەکانیان دادەکەنن) هەروەها (دروێنە) وەهەندێکی تریش .

ئەوەی شایانی باسە زۆربەی تابلۆکانی هونەرمەند کە لەبەرهەمی ئەمشارەن بەرێبازێکی ئەکادیمیانە جوێ دەکرێنەوە . لە ساڵی ١٨٢٢ دا دێلاکرۆ یەکێك لە بەناوبانگترین تابلۆکانی کێشا کەناسراوە بە (دانتی و ڤرگیل لەدۆزەخدا) ، هەرچەندە . ئەم تابلۆیە بووە هۆی ڕووبەڕووبوونەوەی هەندێ جنێوو قسەی

ماشرین لەلایەن خەڵکیەوە بەرامبەر بە هونەرمەند بەڵام رەخنەگرانی ئەمرۆ بەیەکێك لە چاکترین تابلۆکانی دادەنێت ، چونکە توانی بەبەرهەم هێنانی ئەو تابلۆیە کۆت‌و یاساو رێبازی ئەکادیمیایی کلاسیکی پێش خۆی بشکێنێت‌و خۆی لێ سەرفراز بکات . ئەوەی جێگای باسە ناوەرۆکی ئەم تابلۆیە لە (کۆمیدیای خواوەند) ی شاعیر دانتی‌یەوە وەرگیراوە . لەتابلۆکەدا دانتی ڤرگیل لەپێشەوەی کەشتیەکدا . بەدی دەکرێن وەیەکێك لەئازارەدراوەکانی دۆزەخ دەبینرێت کەخۆی بەکەشتیەکەوە هەڵگڕاندوەو دیەوێت رزگاری بێت ، لەولاشەوە شاعیر دانتی بەدی دەکرێت کە بەچاوی سۆزو بەزەیی‌یەوە دەڕوانێتە ئازاردراوەکە .

وێنەکێش ئۆجین دێلاکرۆ لەمیانی ژیانیدا گەلێك شوێن گەڕاوەو زۆر وولاتی بینیوە وەکو میسرو مەغریب‌و جەزائیرو وولاتی ئینگلستان . بەڵام زۆر حەزی دەکرد بچێتە ئیتالیاو لەنزیکەوە تابلۆکانی هونەرمەندانی سەردەمی وریابوونەوە ببینێت‌و ئاشنای شاکارەکانی میکائیل ئەنجیلۆو دۆناتیللۆو رۆفائیل‌و داڤینش بێت .

**ئەو شتانەی لەخەیاڵی خۆمدا دروستی دەکەم لەهەموو شتێ راستەقینەترن بۆم ، هەرچی ئەوانەی دیکەیە وەکو لم بێگیانن .**

● **دێلاکرۆو رۆمانسیەت** : -

لە ساڵەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا فەرەنسا بوە گۆڕەپانی چەند شۆڕشێکی هونەری‌و سەرهەڵدانی هەندێ رێبازی نوێو پەیدابوونی هونەرمەندانێك کەرێرەوی هونەریان گۆڕی‌و بەرەولایەکی تریان‌برد . ئەم شۆڕشانە بەمەیووی لەجی‌خۆیان نەمانەوە بەڵکو زۆربەیان سنووری فەرەنسایان بڕی‌و زۆربەی ئەوروپایان گرتەوە . یەکێك لەو شۆڕشانەی کەکاریگەریەکی جیهانیان هەبوو (رۆمانسیەت) بووکەلە دوادوای ساڵەکانی ١٨٢٠ دا پەیدابوو ، ئەم دیاردەیە خۆی لەخۆی‌دا یاخی بوونێکی رامیاریانە بوو بەرامبەر زوڵم‌و زۆرداری شا شارلی دەیەم شای بۆربۆن . رۆمانسیەت لەکاتێکدا هاتەکایەوە کە سەربەستی تاك بەگشتی‌و سەربەستی هونەرمەندان بەتایبەتی لەچوارچێوەیەکی دیاری‌کراوی سنووردار تێنەدەپەڕی – رۆمانسیەت مانای سەربەستی گۆڕی‌و سیاکانی لەلای هونەرمەندانی ئەو قوتابخانەیە جۆرێکی ترن‌و بەشێوەیەکی جیاوازتر وەسفیان دەکردو ناویان دەبرد . وەلەڕوانگەی رۆمانسیەتدا سەربەستی‌بە ئیمتیازێك دانانرێت کەتایبەت بێ‌بەکۆمەڵیەك یان بەتاکێکی ناسراو ، بەڵکو هەموو کەسێك ئەو مافەی هەیەو دەبێت هەر تاکێکی کۆمەڵ بێبەش نەبێت لەومافەکە سەربەستی‌یە . بەڵام لەلایەن هونەرەوە لەو سەردەمەدا سەربەستی لەتایبەتی‌یەکانی هونەرمەندە بەرزو بلیمەتەکاندابوو ، رۆمانسیەت بەتەواوەتی دژی ئەو دیاردەیە بووەبەرەنگاری لێدەکرد . هەمیشە لەسەربەستی هونەرمەند دەدواو هەقی گۆڕینی رێبازو یاسای باوی دەدایە کە ئەمەیان لەلای هونەرمەندە کلاسیکی‌یەکان هەڵەو گوناهێکی بێ‌وێنەبەو هیچ کاتێك هونەرمەندێکی کلاسیکی ئەوەی بەخەیاڵدا نەهاتوەو حەزی نەکردوە هەر باسیشی بکات .

لەپێش پەیدابوونی رۆمانسیەت‌دا نووسەرو هونەرمەندەکان هەموو توانایەکیان خەرج دەکرد بۆ رازی‌کردنی دڵی خەڵکی وئەو مامۆستا هونەریانەی کە سووربوون لەسەر پەیڕەوکردنی رێبازی ئەکادیمیایی کۆن . بەڵام لەسەردەمی رۆمانسیەت‌داو پاش پەیدابوونی مەسەلەکە بە بارێکی ترگۆڕاو هونەرمەندان بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ زەوقی بینەران نەدەجووڵانەوەو جڵەوی هونەرەکەیان بۆ ئارەزووەکانیان شل نەدەکرد وەکو لەلای زۆربەی هونەرمەندانی پێشوو باوبوو . بگرە هونەرەکەیان بوە هۆی هێنانەدی‌و پەیداکردنی رەخنەی تێکشکێنەرو دووبەرەکی لەنێوان هونەرمەندان‌و جەماوەردا ، تەنها لەبەرئەوەی سەربەستیان دەویست لەکارکردنداو داواکاری هونەرێك بوون کە بەری مێشك‌و ماندووبوونی کەسایەتی هونەرمەندەکە بێت .

جەماوەر هەقی ئەوەیان نەبێت هونەرمەندان بخەنە ژێر تیشکی سەرنجی تایبەتی خۆیانەوەو بەئارەزووی خۆیان هەڵیان بسورێنن‌و لەچوار چێوەی داب‌و دەستوورێکی سواودا حەشاریان بدەن ، بە جۆرێکی وەها کەنەتوانن پەل‌بهاوێن‌و لەژێر رکێفیان دەربچن .

لەبەر ئەوهۆیانەو چەندانێکی دیکەشدا هونەرمەندان بەجارێ پەیوەندی خۆیان لەگەڵ کۆمەڵدا بچڕان وە هەرچی شتێك بەلای خۆیانەوە پەسەند نەبوایە دەیان نەدەبڕی . جابۆیە زۆربەیان پاڵپشتی (هونەر لە پێناوی هونەردا) یان دەکرد ، چونکە لێرەدا هونەرمەند جوانی وەکو بناغەیەك دەبینێت بۆ هونەرو بروا بەهیچ کاریگەریەکی تر ناکات .

ووشەی رۆمانسیەت زۆری لەبارەوە ووتراوەو نووسراوە تاکوئێستا رەخنەگران‌و مێژوونووسانی هونەرین لەسەر لێکدانەوەیەك‌و رایەك رێك‌نەکەوتوون ، هەریەکێك لەوان بەپێی بۆچوونی خۆی قسەی لەسەر کردوەو پێناسەی داوە . لۆبلان (Leblanc) لەوبارەیەوە دەڵێت

ووشەی ڕۆمانسی بەئینگلیزی مانای هەر شتێك دەگرێتەوە کەسۆزو خۆشەویستی پێ دەبزوێت لە هەمانکاتدا ڕۆسۆو ڤاتلێ لەسەر ئەوە ڕێككەوتوون کە ڕۆمانسی بەمانا شوێنێکی چۆڵی ترسناکی نائاوەدان دەگرێتەوە .

بیرۆکەی ڕۆمانسیەت لەکاتێکدا سەری هەڵدا کەدووبەرەکایەتی نێوان بۆرژوا بچووکەکان لەوپەڕیدا بوو ، گەورە بچووکی دەخواردو بەرژەوەندی چینایەتی تادەهات نشونمای دەکردو زیادی دەکرد ، وەباروزرووفی ڕامیاری ئەو سەردەمەیەش ژیانێکی لەباری بۆ ڕخساندبوون .

دامو دەزگای پاشایەتی ببوە گۆڕەپانی ئەو کێشەو زۆرانبازیە . بەکورتی مرۆڤی ساکاری فەڕەنسی زۆر ناخۆش ببوو هیچ لێپرساوێك بەدەم خواستیانەوە نەدەچوو بیری لە نەخۆشیەکانیان نەدەکردەوە هونەرمەندانو ئەدەبیانی ئەو سەردەمەی فەرەنسا پێشڕەوی ئەو کەسانە بوون کەهەستیان بەوبارەی کۆمەڵ دەکرد ، زۆربەیان باوەڕیان وابوو کە چارەسەرکردنی ئەوگیر وگرفتانە شتێکی زۆر مەحاڵو گرانە ، جاهەر لەبەئەوە هەتا لەتوانایاندا بوایە لەدەنگو باسیکۆمەڵ دووردەکەوتنەوەو ئاوەڕیان لەڕابردوو دِدایەوە ، هەرچی کۆنبوایە لای ئەوان پیرۆز بوو . بۆیە دەبینین هونەرمەندان ڕوویان دەکردە شارە دواکەوتوەکان لەڕووی شارستانیەتەوە ، چونکە چەند شتێکی زیندووی باویان لەوناوچانەدا دەدی کەلەلای خۆیان فەوتاوو لەناوچوو بوو .

ئەوەی گومانی تێدانیەو دەبێت بوترێت ئەوەیە کە قوتابیەکانی هونەرمەند (داڤید) بوون کە بوونە هۆی سەرهەڵدانی ئەم شۆڕشە هونەریەو ڕێ خۆشکەری بوون بۆی ، بەناوبانگترینی ئەوانە هونەرمەند گرۆس (Gros) و جریکۆ (Gericault) بوون ، پاش ئەوانیش دیلاکرۆ دێت کەبەهەق گەورەترین مامۆستایە لەناویاندا چونکە کاریگەری ئەم بۆ بلاوکردنەوەی ووشەی ڕۆمانسیەت لە هەموویان زیاتر بوو ، لەبەرئەوەی ئەو دوانەی پێشوو قەدەر زۆر مەودای نەدانو هەر لەتەمەنی لاویدا جیهانیان بەجێهێشتو ماڵئاواییان لە مرۆڤایەتی کرد . دێلاکرۆ وەکو نموونەی ڕۆڵەی سەردەمی خۆی هەستی بەژیانی فەڕەنسیەکان دەکردو قینی لەو ژنە چەپەڵە دەبوەوە ، وەنەبێت ئەو هەستکردنە بەو واقیعەو حەز نەکردن بە ژیانی ڕۆژانە تەنها لەتەمەنی گەورەییو گەییندا سەری هەڵدابێت بەپێچەوانەوە دێلاکرۆ هەر لەسەردەمی لاوێتیەوە حەزی بەووشەی ( ڕابردوو ! ) دەکردو زۆر لە ئەدەبی کۆنی دەخوێندەوەو چێژی لەنووسینەکانی ڤایلدینگو لۆرد بایرۆن وێنەکانی هونەرمەندی ئینگلیزی تۆرنەر (Turner) وەردەگرت .

«شاری پاریس سەرچاوەی هەڵچوونی هەمیشەیە ئەو دەنگە دەنگو هاوارە ناسازانەی فرۆشیارەکان بێزارو وەڕسیان کردووم . . .» ئەمە پارچەیەکە لەنامەیەکی هونەرمەند دێلاکرۆ کەبۆ هاوڕیەکی خۆی ناردوە لەتەمەنی بیستوسێ ساڵیدا . لەمیانەی ئەم نامەیەدا ئەوەمان بۆساغ دەبێتەوە کەهونەرمەند چەندێ قینی لە واقیع دەبوەوەو ڕق لەشاری پاریس هەڵگرتوە ئەو شارەی کەلەکۆنە لانەی گەشتکەران بوە . جابۆیە هەموو دەم دێلاکرۆ لەکۆڕە گشتیەکان دووردەکەوتەوە بەتایبەتی ڕامیاریەکان ، لەهەریەکێ لەوکۆڕانە باسی درووخی ڕامیاری یا واقیع بکرایە ئەوێی بە جێ دەهێشت یان خەوی لێدەکەوت – وەکو هاوڕێکانی دەیگێڕنەوە – چونکە لەو باوەڕەدا بوو شۆڕش کردن هۆیەکی بنەڕەتە بۆ شکاندنی مرۆڤو زەبوون کردنی .

**هونەری بێناوەڕۆك وەکو پیاوێکی بێگیان وایە . . . یان لاشەیەکی بێ جوولەیە .**

**● دێلاکرۆ لەمیانەی گەڕانەکانیدا : –**

هونەرمەند ئۆجین دێلاکرۆ وەکو ووتمان زۆر لەشاری پاریس بێزار بو ئەو شارەی کە قیبلەگای زۆربەی هونەرمەندانی جیهانی بووە جا لە بەرئەوە زۆربەی کات ڕووی دەکردە گوندەکانی دوور شارو جێگا ئارامەکانی ناوشاریشی هەڵدەبژارد لە پێناوی هەمان مەبەستدا چووەتە باکووری ئەفریقاو لەوێدا وولاتی مەغریبو وولاتی جەزائیرو هەندێ ناوچەی تری بینیوە . دێلاکرۆ لەهەشتی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٨٣١ دا بووکەداواکاریەکی بۆسەرۆکی مۆزەخانەی لۆڤەر ڕەوانە کرد کەتێدا داوای گەشتەکەی کرد لەژێر چاودێری دەستەیەکدا بۆ ئەفریقا بەتایبەتی وولاتی مەغریب کەپەیوەندی دیبلۆماسی هەبوو لەگەڵ فەڕەنسا . پاش ڕازیبوونو بڕیاردان لەسەر ئەو گەشتە هونەرمەند لەگەڵ دەستەکەیدا لەساڵی ١٨٣٢دا گەیشتنە مەغریب وەلەوێدا زیاتر هامو شۆی کەلاوەو جێگا بەجێهێشتراوەکان وزەماوەندەکانی دەکرد وەزۆر بەپەرۆشەوە وێنەی دەکێشان بەڕادەیەکیوا ئاواتی دەخواست کەهەر لەسەرەتاوە لەمەغریبدا بژیایەو چاوی بەو دیمەنە دەگمەنانە تێربکردایە .

ئۆجین دێلاکرۆی وێنەکێش بەم جۆرە هۆی ڕقو کیتەی بەرامبەر فەڕەنسا «بەتایبەتی شاری پاریس» و خۆشەویستی

بەرامبەر ووڵاتانی دەردەبڕێت : «واهەست دەکەم مرۆڤایەتیم وپیاوەتیم لەدەرەوەی پاریسدا زیاترە ، بەڵام لەپاریسدا جگە لەپیاوێکی ساکار هیچی تر نیم . وەمرۆڤی ساکار لەڕوانگەی منەوە وەکو بووکەشوشە وایە . . .» . یان وەکو لەم نامەیەدا دەبینین لەهەمان مەسەلە دواوە «ئەوانەی من لەمەغریب دەیبینم بەتایبەتی کەکاتێك عەبا لەشان دەکەنو بەسواری ماینو ووشتر هاموشۆ دەکەن زیاتر بە دڵمەوە دەچن وەکو لەوانەی لەچیرۆکەکانی شێکسبیر هاتوون ، تەنانەت مرۆڤی ساکاری ئێرە برۆتسو هاملێتیان لەبەرچاوم خست .» . هەروەها هونەرمەند لەیاداشتەکانیشیدا زۆری لەسەر ژیانی رۆژانەی مرۆڤی ئەفریقی نووسیوە بەتایبەتی جەزائیرەکانو مەغرییەکان . هەتامردیش خۆی بەقەرزاری ئەو دوو ووڵاتە دادەنا چونکە سەرچاوەی زۆربەی پەیامەکانی بوون وشاییو هەڵپەڕکێ ی خەڵکی «بەتایبەتی جووەکان» وئافرەتە بەژنو باڵابەرزەکانی ئەو ووڵاتانە بوونە هەوێنی گەڵی تابلۆی بەپێز لەوانە [چەند ئافرەتێکی جەزائیری «١٨٣٤» ، شۆڕشگێڕانی شاری تەنجە «١٨٣٨» ، داگیرکردنی شاری قوستەنتینە لەلایەن خاچ پەرستەکانەوە «١٨٤٠» ، زەماوەندی جووەکانی مەغریب «١٨٣٩» ، چەند ماینێکی عەرەبی «١٨٦٠» ، راوە شێر «١٨٦١»] . دێلاکرۆ پاش بەجێهێشتنی ئەفریقا لەکاتی گەڕانەوەی بۆفەرەنسا لەئیسپانیا دابەزی ، ئەووڵاتەی کە لەکۆنەوە ئاواتەخوازی بینینی ئاسمانی شینی بێگەردیو جلوبەرگی رەنگاورەنگی ئافرەتانی بوو . لەڕاستیدا هونەرمەند زۆری لەبارەی ئیسپانیاوە نەدەزانی ، ئەوەیشی دەیزانی لەدۆن کیشۆتەکەی سێرڤانتسەوە



ئازادی سەرکردایەتی گەل دەکات ١٨٣٠

خوێندبیەوە یان لەتابلۆکانی گۆیاوە بینی بووی . وێنەکێش پاش دابەزینی لەسەرخاکی ئیسپانیا یەکسەر رووی کردە کۆڵانو کڵێسەو بازارو شوێنە میللیەکانو دەستی کردە وێنەکێشانیان

**«ئەم ووڵاتە بوەهۆی شادمانیم ، ئەوەی لێرەدا دەیبینم هیچ جیاوازیەکی ئەوتۆی نی یە لەگەڵ ئەوانەی لەمەغریبو جەزائیر بینیم جگە لەئاینەکەیان نەبێت»** .ئەمە ناوەرۆکی ئەونامەیە بوو کەهونەرمەند بۆ (پێریێ Pierret) ی هاوڕێ ی ناردوە کەتیادا باسی دڵخۆشی خۆی دەکات لە ووڵاتی ئیسپانیا . ئافرەتێکی دەستەسڕ بەدەست ، نوێژکردن لە کڵێسەیەکی ئەندەلووسی ، گۆڕەپانێك لەگۆڕەپانەکانی ئەشبیلیاو هەندێکی تریش لەو تابلۆیانەن کەلەم ووڵاتە هونەرمەند کێشاونی .

لەساڵی ١٨٢٥دا پێش چوونی بۆ ئەفریقا بۆیەکەم جار لەژیانیدا فەرەنسای بەجێهێشتو رووی کردە ئینگلستان وەلەوێدا ئاشنایەتی لەگەڵ هونەرمەندان بۆنگتنو تاڵسو ڤایلدنگ دا پەیدا کرد .

وێنەکێش لەکاتێکدا رووی کردە ووڵاتی ئینگلیز کەقوتابخانەی رۆمانسی ئینگلیزی لە سایەی هونەرمەندی بەناوبانگ کۆنستابڵ گەورەترین سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو پاش کردنەوەی پێشانگایەك بۆ تابلۆکانی لەساڵی ١٨٢٤ دا ، هەتا ماوەیەکی کەم پێش کردنەوەی ئەو پێشانگایە قوتابخانەی رۆمانسی ئینگلیزی تابلۆی بەخەڵکی نەناسراو بوو . دێلاکرۆ ئەوەندەی دەیخوێندەوەو دیقەتی دەدا ئەوەندە وێنەی نەدەکێشا لەم ووڵاتە . نووسینەکانی بایرۆن کارێکی گەورەیان کردە سەر هەستو نەستیو ئاراستەبوونی هونەریی . تابلۆی «مردنی ساردانابال» کەلەساڵی ١٨٢٧دا

کێشاویەتی یەکێکە لەو تابلۆیانەی کەلەناوەڕۆکی چیرۆکێکی شاعیر بایرۆنەوە وەریگرتوە . کورتەی چیرۆکەکە ئەوەیەکە شاساردانابال پاش ئەوەی تەخت وتارای لەدەست دەچێتو دوژمنەکانی دەست دەگرن بەسەر وولاتەکەیدا ئەم هەڵدێتو فرمان دەدات دوای خۆی هەموو ئەو شتانە لەناوببرێن یان بگوژرێن نەوەکو لەپاش خۆی بینەمایەی خۆشی خەڵکانێکی تر .

ئەوەی شایانی باسە هونەرمەندی بلیمەت دێلاکرۆ ڕوخسارێکی تازەگەری دایە چیرۆکـــەکـــەو شتـێکی نوێی خستـــە ناو یـەوە ، لەتابلـۆکـەدا شاساردانابال لەسەر جێگەکەی ڕاکشاوەو دەڕوانێتە ئەو قەسابخانەیەی دەوروپشتیو بەوپەری ئارامیەوە بەبێ هیچ سڵەمینەوەیەك دەستی ناوەنەتەژێر سەریو پاڵی لێداوەتەوە . وەنەبێت دێلاکرۆ ئەو شێوە تازەیەی کەلەتابلۆکەدا دیمان بەبێهوودە ئاخنبێتیە ناویەوەو بەکاری هێنابێت ، بەڵکو ئەوە خۆی لەخۆیدا گەرانەوەیەکە بۆ تەمەنی منداڵی کە ئاگر بەربوەژووری نووستنەکەی بەبێ ئەوەی داوای یارمەتیەك بکات سەیری ئەو ئاگرەی دەکردو فەرامۆشی بەبینینی بڵێسەکەی دەهات تاکو ئاگرەکە زۆری بۆهێناو کراسەکەی هەڵلووشی .

**ژیان هونەری وێنەکێشانە . . .**

**● چەند لایەنێکی هونەرەکەی دێلاکرۆ : —**

جیهانی هونەرمەند دێلاکرۆ جیهانێکی بەرفراوانە ، شارەزابوونی ئەو جیهانە زۆری دەوێت چونکە وێنەکێش زۆر تابلۆی هەیە وەهەر سەردەمێکی ژیانی بەجۆرێك مامەڵەی لەگەڵ بۆیەدا کردووەو جۆری بیرکردنەوەی تارادەیەك جیاوازبووە . دێلاکرۆ وەکو زانیان داستانو ئەفسانەو چیرۆکو بەسەرهاتی کۆنی دەقواستەوەو وەکو بابەتێك لەچوارچێوەی تابلۆیەکدا گەورەترینو بلاوترین مەبەستی پێ دەگرتەوە . هەردەم بەدووربینیو ووردبینی ناسراوە وەهەر ئەو دیاردەیەبە تێیدا کەبووەتە هەڵەنەکردنی ئەو ڕێگەیەی لەسەری دەڕۆیشت بەهۆی ئەو ڕەخنانەی ئاراستەی دەکران . جائەگەر لەگەڵیدا بوبێت یان لەدژی . وەخۆی زۆر بەباشی دەیزانی نرخی تابلۆکانی چۆن دەبێت .



مردنی ساردانا پال ١٨٢٧

کارەکانی ساڵی (١٨٣٠) بەبەرزترین بەرهەمەکانی دادەنرێت وەکو بەرهەمی هونەرمەندێکی ڕۆمانسی لێهاتوو ، گەورەترین مەسەلەی مرۆڤایەتی لەتابلۆی «سەربەستی سەرکردایەتی گەل دەکات» دا گرتووەو ڕووبەڕووی ئەوانەی کردەوە کەبە بێهەڵوێست یا نامرۆڤ وەیان بێهەستیان ناودەبرت . هەمان تابلۆ بووە جێی سەرسووڕمانی ڕۆمان نووسی بەناوبانگ «ڤیکتۆر هیگۆ» وەکەسەکانی ڕۆمانە بەناوبانگەکەی «کلۆڵەکان» لەناوەڕۆکی ئەو تابلۆیەوە وەرگرت ، لەوانە گاڤرۆش کەنموونەی منداڵی ئاوارەی شۆرشگێری فەرەنساویە وەپارێزەرە بێپارەو پوولەکەو ئاوارەکانو بێجێگەکانی فەرەنسا بە نیسبەت دیلاکرووە وەکو .

وێنەکێشێکی بەتواناو کارامە بە دەربڕینی کارەساتە مێژوویەکان ، هیچ شتێکی لەمێژوو نەدەدی جگەلەوەی کەکاری دەکردە سەریو دەیهەژاندو لەو لایەوەبیری لەچارەنووسی مرۆڤ دەکردەوە بەرامبەر بەیاسای ژیان ومردن ، وەچۆن مرۆڤایەتی لەولایەنەوە هەرەشەی لێدەدرێت موفتەلابووە بەدەستیەوە . لەهەمان کاتدا پەنای دەبردە بەربابەتە ئاینیەکانو داستانو ئەفسانەکان چ

ﻪچەرخەکانی ناوەراست بێت یاهینی سەردەمی وورپابوونەوە بێت وەیان ئەو بابەتە ئەدەبیانە بێ کە لە بایرۆنو گۆتەو هەزار شەووشەوێك و راسین وەری‌گرتوون هەمووی ئێشی مرۆڤایەتی بەدەستی قەدەرەو تلاندنەوەی بەو چارەنووسەوەو کێشەی مرۆڤ لەگەڵ مانو نەمانداو مردنو ژیانو سەرکەوتنو داکەوتنی هاندەری بوون بۆ هەڵبژاردنی ئەو بابەتانە ، وەلەگەڵیاندا جووت دەبوو پەیتا پەیتا ئازارەکانی دەروونی خۆی تێ دەهاویشتن ، ئەو دەروونەی کە هەمیشە پڕبوە لەخەمو خەفەتو پەژارە ، جاگرنگ نی‌یە گەر سەرچاوەکەی خەڵکی دەوروپشتی بووبێت یا ئەوانەی وەکو تەرزەو باران بەسەری خۆیدا دادەبارین . لەبەرئەوە شاعیری ناسراو بۆدلێر راستی گوتوەکە «رەنگ‌و بۆیەکانی دێلاکرۆ بەردەوام دەنووزێنەوە . .» .

لەوەڵامی ئەو قسەیەی فیلیب جۆلیان (PH.Jullian) دا کەدەڵێت هونەرمەندی مەزن دێلاکرۆ وێنەی هەموو شتێکی کێشاوە تەنها وێنەی سروشت نەبێت ، دەڵێین بەپێچەوانەوە دێلاکرۆ ئاسۆیەکی فراوانی بۆ دەربڕینی سروشت‌کردەوەو جۆرە وتووێژێکی خەمگینانەی لەگەڵدا تێکەڵ‌کرد لەگەڵ ئەوەشدا کە وێنە سروشتیەکانی لەدەتابلۆ تێپەرناکەن ، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کەبەیەکجاری وێنەی سروشتی فەرامۆش کردوە هەرچەندە مامەڵەکردن لەگەڵ سروشتدا مەرجێکی بنەرەت نی‌یە بۆناسینی بەرهەمی چاك بەڵکو جۆرێکە لە کەرەسەی خاو کەهونەرمەند بەگوێرەی ویست هەڵیدەسورێنێت .

پشتەکیەکانی تابلۆکانی جۆرە ئالۆزیەکیان تیا بەدی دەکرێت‌و هۆشەنگی خۆی لەدەربڕیندا دەناسرێتەوە وەکو دیمەنی رۆژئاوابوونو خۆرهەڵاتن‌و کازیوەو سپێدە کەبەبۆیەی تۆخ وەبەهەڵچوونو کوڵانەوە وێنەکە دەکێشێت . لێرەدا دەتوانین دێلاکرۆ بەیەکێك لەو هونەرمەندانە دابنین کە بوونە هەوێنی قوتابخانەی کاریگەری‌و مژدەی لەدایك‌بوونیان پێ‌بوو . بەتایبەتی تابلۆی «قەسابخانەی شیۆ ١٨٢٤» پاڵپشتی ئەم قسەیەمان دەکات کەتێدا بۆیەکەم جار هونەرمەند رێبازی دابەشکردنی تیشکی رۆژی گرتەبەر کەئەوە لەگەورەترین جیاکەرەوەکانی هونەرمەندانی کاریگەری‌یە . وە هەروەها زۆر لەهونەرمەندانی هونەری نوێ خۆیان بەقەرزاری ئۆچێن دێلاکرۆ دەزانن . . هونەرمەندی ناسراو پۆل‌سیناك (Paul Signac) لە کاتی‌خۆی‌دا کتێبێکی لەچاپ‌دا بەناوی (لەدێلاکرۆوە بۆ کاریگەری هاوچەرخ) . سیناك لەکتێبەکەیدا دەڵێت :

«دەبێت هەموومان دان بەبلیمەتی‌و زرنگی دێلاکرۆدا بنێین کەیاسای هێڵ‌و بۆیەو پێکهاتنی بۆ ئێمە بەجێهێشت» . وەئەمانەش بەڵگەیەکی دیکەن بۆ کاری دێلاکرۆ بەسەر هونەرو هونەرمەندانی تازەوە .

ئەو رێبازەی دێلاکرۆ دەیگرتە بەر لە وێنەکێشانی پۆرترێت‌و کەسەکانیدا دووبارە جیاواز بوو لەگەڵ رێڕەوی هونەری سەردەمیداو پەیرەوی یاساو رێبازە باوەکانی نەدەکرد ، هەر بەدەربڕینی شێوە دەرەکیەکە یان دەم‌وچاوەکەوە نەدەوەستا بەڵکو دەیڕوانیە دەروونو مێشکی کەسەکەی بەرامبەری‌و شۆردەبوەوە بۆناخی‌و هەموو هەست‌و نەستێکی دەردەخست . وەنەبێت ئەم رەفتارەی تەنها بەرامبەر بەمرۆڤ هەبێت بگرە گیانەوەرانیش هەمان تێڕوانینیان دەکرایە سەر لەلایەن هونەرمەندەوە ، سات‌و دووسات بەرامبەر گیانەوەرەکانی باخچەی گیانەوەران دەوەستاو وێنەی دەکێشان بەتایبەتی شێرو پڵنگ کە گەورەترین بەشیان هەبوو لەو وێنانە ، هەروەها ئەسپ‌و ماینیش لەزۆربەی ئەو وێنانە بێبەری نین ، خۆیشی لەیاداشتەکانیدا بەزۆر لا ئەو راستیەی ووتوەو لەسەریان واتە گیانەوەران نووسیویە . «چەندێك گیانەوەرانم خۆش دەوێت . . !» . . . «زۆربەی گیانەوەران دەمبزوێنن . . !» .

بەڵام دێلاکرۆ وەکو وێنەکێشێکی ئایینی کەوێنەی ئەو چیرۆکانە دەکات لە ئینجیل‌دا هاتوون ئەوا جۆبان (Joubin) لەو بارەیەوە قسەی کردەوەو دەڵێت : «ئۆچێن دێلاکرۆ باشترین وێنەکێشی ئاینی‌یە لەسەدەی نۆزدەهەم‌دا ، لەپێشرەوی ئەو کەسانەیە کەخۆیان بە مامۆستا دادەنێن لەو مەیدانەدا» . بەڵام دەبێت ئەو راستیە بوترێت کە دێلاکرۆ زۆری حەزی بەئایین نەدەکردو باوەری پێنەبوو چونکە لەسەردەمێکدا دەژیا کە هەستی ئایینی لەناو خەڵکدا لەوپەری کزیدا بوو . لەهەمان کاتدا نووسراوەکانی دێدرۆ و ڤۆلتێری دەخوێندەوە ئەوەندەی کە هاندەری بوون بۆ دوورکەوتنەوە لەئایین ، لەبەر ئەو هۆیانە هیچ خۆشیەکی لەرەسم کردنی چیرۆکە ئاینیەکان نەدەبینی جگەلەوەی کڵێسەکانو شوێنە ئایینیەکان دەرفەتێکی باشیان بۆ دەرەخساندو ئارەزووی لایەنە هونەریەکانیانی دەکردو ئاهەنگەکانیان جۆش‌و خرۆشێکیان دەخستە لەشیەوەو ژێی حەزیان دەلەراندەوە . خۆی سەبارەت هەمان مەسەلە دەڵێت : «هێشتا لەیادمە کە لە




کڵێسەی سان دنیس دی سان سکریمان وێنەم دەکێشاو گوێم لەمۆسیقای ئایینی دەگرت . خۆشیەکەم دووقات زیادی دەکرد وەبڵێسەی ئارەزووم بۆ وێنەکێشان بەرزدەبووەوە بەتایبەتی لەرۆژی یەك شەمواندا» . هەندێك لەرەخنەگرانی هونەری نەخش‌و نیگارەکانی کڵێسەی سان سۆلپیس بەبەرزترین شاکاری دەستی دێلاکرۆی دادەنێن لەڕووی ناوەرۆك‌و فۆرمەوە . چونکە بەرهەم هێنانی ئەو وێنانە شتێکی مەحاڵە بەنیسبەت هونەرمەندێکەوە کەگڕی چرای ئایینی ئەوەندە کزبێت ! ، بەڵام وەکو مۆریس سیرۆلاز (Mautice Setullaz) دەڵێت : «تەنها هەر باوەرهێنان مەرج نی‌یە بۆ لەدایك بوونی کاری هونەری مەزن لەبەرئەوەی زۆر لەهونەرمەندان بڕوای ئایینی بەوپەڕی جوانیەوە دەردەبڕن بەبێ ئەوەی هیچ نرخێك بدەن بەمەسەلەی فۆرم‌و وەزعی دەرەکی ، بەڵام دێلاکرۆ هەموو بڕوایەکی لەهونەرەکەدا دەتواندەوەو تیشکی سەرنجی دەدایە» . باشترین نموونە بۆ ئەوەی ڕاستی ئەو قسانە بسەلمێنێت وێنەی «کێشەی یەعقوب لەگەڵ فریشتەدا» یە . ئەم وێنەیە وەکو ئەوانەی دیکە سنووری ئاینەکەی بڕیوەو بەستویەتەوە بە بۆچوون‌و بیرو باوەری خۆیەوە . هونەرمەند لەوێنەکەدا کاتی بەیانی هەڵبژاردوە تازە تیشکی زێرینی ڕۆژ خۆی گەیاندۆتە زەوی گومانی تێدا نی‌یە ئەمە مەسەلەی دەربڕینەکە زیاتر ئاشکرا دەکات‌و ماناکەی بەهێزتر دەکات . لەو لایشەوە لەناو زەوی دارستانەکەدا دوو داری پیری بەیەکداچوو بەدی دەکرێت کە خەریکن ب.. و پۆپەکانیان ئاسمانی وێنەکە شارنەوە . لەژێر ئەم دارانەدا یەعقووب دەردەکەوێت کەباوەشی لە فریشتەیەکی تووڕەداوەو هەوڵی خستنی دەدات . هەرچەندە ئەم وێنەیە کێشەی یەعقووب لەگەڵ فریشتەکەدا نیشان دەدات بەڵام لەڕاستی‌دا ئاسۆیەکی فراوانە بۆ ڕەنگدانەوەی بەربەرەکانێ‌ی مرۆڤ بەرامبەر قەدەر . قەشە پاتۆی دەپرسێت‌و دەڵێت نازانم بۆچی هونەرمەند ئەو فریشتەیەی وا بەتوورەیی کردوە ؟ . پاش ئەوە گلەیی ئەوە دەکات کە ئەو وێنە توندو تیژە هیچ هێمنی‌و ئارامیەك ناخاتە دڵی تەماشاکەرەوە بگرە جۆرە پەشۆکاوی‌و شێرزەیی‌یەکی پێ دەبەخشێت . بەڵێ دێلاکرۆ ئەوەیشی دەویست‌و بۆ ئەو مەبەستە هەوڵی دەدا . کێشەو سەرکەوتن‌و شەرکردنی مرۆڤ خستە نێو وێنەکەوە بۆ ئەوەی تەنانەت لەکاتی نوێژکردنیشدا بەر چاوی پێ بکەوێت‌و ئاگای لەدەوروپشتی بێت‌و ووریا بێتەوە . هونەرمەند لە هەموو وێنەکە پەیڕەوی چیرۆکەکە ناکات . خۆی چۆنی ویستوە وای ڕەسم کردوە . لەوێنەکەدا یەعقووب لەوپەڕی تواناو هێزدایە وەلەوەیایە کەفریشتەکە بەپشتا خات‌و خۆی بەسەردا بدات . ئەمە بەتەواوەتی پێچەوانەی چیرۆکەکەیە کە تێدا یەعقووب بەزاوە .

**پێویستە هونەرمەند زۆر ئازاو بەتوانا بێت وکۆت‌و وزنجیری بیری بشکێنێت‌و سەربەست بێت .**

● **بیروڕای دێلاکرۆ بەرامبەر هونەرو هونەرمەندانی پێش‌خۆی :**

هونەرمەند دێلاکرۆ بەبێ‌شك مامۆستای ڕۆمانسیەت‌و هەردەم بەپێشەوای ئەو قوتابخانەیە دادەنرێت . تەنانەت لە سەردەمی خۆیشیدا کەس نەبوو نکۆڵی لەو قسەیە بکاتەوەو ڕەتی بکاتەوە جا پێویستە هونەرمەندێکی وا گەورە ڕاتایبەتیەکانی بەرامبەر هەندێ لەهونەرمەندانی پێش‌خۆی بزانین و ئەو ئەرازوە دەرکەین کە پێ‌ی سەنگاندوون . ئەوەی زۆر سەرنجمان ڕادەکێشێ ئەوەیە کە هونەرمەند زۆر بەووزدی وەبەبێ ترس وشاردنەوە هونەرمەندان دەکاتە ژێر تێبینی‌و ڕەخنەی خۆیەوە . لەهەمووی سەیرتر ئەوەیە کە ئەم تێبینیانە لەپەرتوکێکی ...سیونەتەوە بەڵکو هەمووی لەکون‌و ..نی یاداشتە دوورو درێژەکەیدا ..کراونەتەوە . دێلاکرۆ هەندێك لە هونەرمەندان بەنموونەیی دادەنێت وەپێچەوانەشەوە هەندێکی تریان دەداتە بەر تیرو توانج‌و ڕەخنە ! . سەبارەت بە مامۆستای سێبەرو ڕوناکی هونەرمەندی هۆڵەندی ڕامبرانت دەڵێت : «لەوەیە لەدواییدا بزانرێت کە ڕامبرانت لە بۆیەو ڕەنگ‌دا گەلێ بەتواناو بەهێزترە لە ڕۆفائیل . ئەم شتەی من ئەیڵێم دەشێت ...اوی ئەکادیمیایەکان بەرێت کە خۆیان بەرێسایەکەوە دەبەستنەوە . .» . دێلاکرۆ ئەم شتەی هەرگیز نەشاردۆتەوەو هەمیشە دووپاتی کردۆتەوە هەرچەندە ڕۆفائیل پلەو پایەیەکی هونەری بەرزی هەیە لەلای . .

هونەرمەند لەسەنگاندەکانیدا




چاوپۆشی لە کەسایەتی هونەرمەندەکە دەکاو تەنها مەبەستی دەرخستنی پیتۆڵی هونەرمەندەکە وای لێ دەکات کە نووکی قەڵەمی بخاتە کار بۆ شیکردنەوەو پالاوتن . دەست دەبە ژماردنی لایەنە ئیجابیەکانی ئەوە لەکاتێکدا کەلایەنە سلبیەکانی فەراموش ناکات . باشترین نموونە بۆ ئەم قسانە ئەو نووسینەیە کەلەبارەی هونەرمەند ئانگەرەوە (Ingres) نووسیویەتی لە ساڵی ١٨٤١ وەمایەوە تالە ساڵی ١٨٧١ دا لە رۆژنامەی «تان» بلاوکرایەوە کورتەکەی ئەمەیە «لەسەرەتاوە پێویستە من رووبکەمە هونەرەکەو کەسایەتی هونەرمەندەکە لەبیری خۆم بەمەوە ، لەوە بێگومانم کە ئانگەر بەبێ نرخ و ساویلکە ناوم دەبات . ئانگەر سێ‌ودوو لەدەرکردنی قوتابیەکی ناکات گەر بزانێت ئەوەندەی تۆزقاڵێك حەز بەبۆیە دەکاتو بەلای رەنگدا دادەشکێنێت . بەلام هەرچۆنێك بێت نامەوێت باسی خۆی بکەم لەکاتێکدا لە تابلۆکانی دەدوێم . ئانگەر بەهەموو توانایەوە هەوڵ دەدات لەرەنگیش‌دا سەرکەوتن وەدەست بێنێت . من دەڵێم سەرناکەوێت ئەوەتا لەتابلۆی «ستراتۆنیس»دا جۆرە دروستکراوێکی بۆیە دەبینین کە هیچی لەجیێ خۆیدا نین ، تابلۆکە وەها دەبریقێنەوە دەتوانرێت ریشی لەبەردا بتاشرێت .» .

هەرچەندە دێلاکرۆ رۆڵەی سەردەمی خۆی بوو بەلام خەیاڵو بیری لەلای سەدەکانی کۆنو ناوەراست بوو وەکو لەوەوپێش باسمانکرد ، هەمیشە ئاواتەخوازی ژیانی ئەو سەردەمانەی دەکرد . دانی بەوەدا ناوە کە پەیکەری یۆنانی گەیوەتە ئەوپەری جوانی . «یۆنانیەکان دەستێکی بالایان هەبوە لەپەیکەرتاشیندا هەروەکو ئەو توانایەیان هەبوە لەئەدەب دا» .

هونەرمەند دێلاکرۆ بەرامبەر دوو کەڵە وێنەکێشی سەدەی حەڤدەهەم دەوەستێ‌و بەووردی تیان دەروانێت ئەوانیش هونەرمەندان پۆسانو رۆبنزن . دەبێت لەبارەی ئەم دوانەوە چی ووتوە ؟ ، پۆسان بەیەکێك لە هونەرمەندە بەتواناکان دادەنێت لەبابەتی تازەگەریدا ، پۆسان بەدوای شتەشاراوەکانی سروشتدا دەگەرێتو ئاوارەی خاڵە نەزانراوەکانیەتی بۆهەمان مەبەست تاك پشت‌گوێ دەخات لەپێناوی گشتدا . بەلام رۆبنز لەلای دێلاکرۆ ئەو بەختو پایەیەی نی‌یە . بەرامبەر شکڵە زلەکانی دەوەستێتو بەنەزانی دادەنێت لەبواری جوانیدا . لەبارەی کۆربیۆە دێلاکرۆ زۆری ووتوە زۆر دابەزیوەتە سەری بەم جۆرە باسی دەکات :

«ئەی نەفرەت لی‌کراوی شێتو شەیدای راستەقینە وادەزانیت -من بەو دیمەنەی بۆت رەسم کردووم هەڵدەخەڵەتێم ؟ . من لەراستەقینە رادەکەمو روودەکەمەوە کەلاوەکانو شوێنەچۆڵەکان . کەسانی نێو تابلۆکانت حەزیان پی‌ناکەم رۆژی سەدەها جار لەنێو بازارو شوێنەگشتیکان دەیانبینم . بڕوام بی‌بکە هەرکە ئەوانە دەبینم رووم لێیان وەردەگێرم وە هەست بە تەمەڵی‌و تەوەزلی دەکەم کاتێك لەناویاندا خۆم ببینم .» .

**سەرچاوەکان**

١ – أوجين ديالكروا من خلال يومياته . نووسینی زينب عبد العزيز .

٢ أوجين دولاكروا . نووسینی : حسن كمال .

٣ النقد الجمالي . نووسینی : أندريه ريشار

٤ – الفن والانسان . نووسینی : دكتور عز الدين أسماعيل .




بارو دۆخی دووەمین جەنگی جیهانی وای لێکرد گوندێك لە قەد چیاکانی ئەلب لە نزیکی گوندی (گرە نۆبل) ی فەرەنسایی‌یەوە هەڵبژێرێت ، بۆ ئەوەی وەرزی هاوینی تێدا بەسەر بەرێت تیایدا خۆراکێکی باش بخوات بەچێژ بێت لەبەر نەبوونی خۆراكو خواردەمەنی لە پاریس لەو سەردەمەدا . ژیانی گوندیش ڕێ بەوە دەدات هەندێك خواردەمەنی پاشەکەوت بکرێت بۆ ئەوەی لە گەڕانەوەدا لە تەك خۆیدا بیبات .

لەوێ چاوی بە پەیکەری سەگێك کەوت لە ناوەڕاستی گوندەکەدا دامەزرابوو . لە خۆی پرسیاری کرد! بڵێت بەسەرهاتی ئەم سەگە چی بووبێت؟ بڵێت مرۆڤێکی لەناو بەفرێکی زۆردا ڕزگار کردبێت ئەو کاتەی خەریکی وەرزشی خلیسکانێ بووبێت ؟ یان سەرگوزەشتەیەکی دیکەی هەیە وای پێویست کردووە ئەم پەیکەرەی بۆ دروستکرابێت ، ئەمە وای لێکردم بگەڕێمو شارەزای بە سەرهاتەکە بم سەگی خاوەندی ئەم پەیکەرە ماوەیەکی دوورو درێژ لەگەڵ خاوەندەکەیدا ژیا ، خاوەنەکەیشی کوێر بوو ، هەموو سەرلەبەیانی‌یەك لە گوندەکەیەوە بۆ ئیستگەی شەمەندەفەر دەڕۆیشت کە چوار



کیلۆمەتر لە گوندەکەوە دوور دەبێت بۆئەوەی سواری شەمەندەفەر بێتو بڕوات بۆ «گرە نۆیل» ، بۆ ئەوی لەسەر ئەو ئیشەی ئەنجامی دەداتو بەڕێوەی دەبات ڕۆژگار بەسەربباتو مۆتەکەی پێداویستیی لێ دووربخاتەوە .

پاش ڕۆیشتنی شەمەندەفەرەکە سەگەکە بەتەنیا بۆ ماڵ دەگەڕێتەوە : پیاوەکەیش ئێوارە کە دەگەڕێتەوە هەست بە سەگەکە دەکات لە کاتی گەڕانەوەی شەمەندەفەرەکەدا بەبێ ئەوە دوابکەوێت چاوەڕوانیەتیو بە ئەژنۆی سەگەکە پێ دەزانێتو زنجیرەکەی دەگرێت بۆ ئەوەی بیباتەوە ماڵ لە گوندەکەدا .

ئەم کارە هەموو ڕۆژێك دووبارە بووەوە تا ماوەیەکی دوورو درێژی بەسەردا تێپەڕی پیاوەکە کۆچی دوایی کردو ، سەگەکە مایەوەو ، لەسەر ڕەفتاری خۆی بەردەوام بوو ، سەرلەبەیانیان بەتەنیا دەچوو بۆ ئێستگەی شەمەندەفەرەکەو ئێوارە دەگەڕایەوە چاوەڕوانی خاوەندەکەی دەکرد پاشان کە نائومێد دەبوو دەگەڕایەوە ، پاش شەش مانگ بینییان سەگەکە لە ئێستگەی شەمەندەفەرەکە تۆپیوە پاش ئەوەی ئەوەند چاوەڕوانی خاوەندەکەی کرد تا ماندوو زەبری لێ ستاندبوو سەرەڕای ئەوەیش نائومێد ببو .



شوقی البغدادی نووسیویەتی
ڕۆشنبیری نوێ وەری گێڕاوە

# هەڵوێست

(١)

● نازانم بۆچی هەر کاتێك باسی (دەوری هونەر لە کورتە چیرۆکێکی نووسەری ئەمریکی بەناوبانگ (ئوهنری) دا کرا ئیتر تیا رانەمێنمو بیری لێ ئەکەمەوە کە لەو کورتە چیرۆکەدا سەر گوزشتەی کچێکی نەخۆش ئەگێڕێتەوە گوایا ئەو کچە خەفەتی ئەوەی لێ هاتووە کە ژیانی بەستراوە بەو گەڵایانەوە کە لەسەر کەپری مێوەکەداو لەسەر دیواری بەرانبەر پەنجەرەی ژوورەکەیدا بڵاوبۆتەوەو وا ئەزانێ هەر ئەو بایەی ئەو گەڵایانە ئەخاتە خوارەوە لە دواییداو لەگەڵ دووا گەڵادا ژیانی ئەویش ئەباتو هونەرمەندە وێنە کێشەکەی دراوسێی لە شەوێکی ساردا توانیویەتی لەسەر دیواری بەرانبەر پەنجەرەکە وێنەی گەڵایەك بکێشێ کە با نەیتوانیوە بیخاتە خوارەوەو هونەرمەندەکە لە سەرمای ئەو شەوەدا تووشی نەخۆشی بووە، بەڵام سەرکەوتوو بووە کە توانیویەتی بەهۆی هونەرەکەیەوە تاڵێك هیوای باریك لە خەیاڵی کچە ـ کەدا دروستبکات، بەوەی مادەم با نەیتوانیوە دووا گەڵای سەر کەپری مێوەکە بخاتە خوارەوە ئیتر ئەمیش ئەتوانێ بەرەنگاری نەخۆشییەکەی بکات.

کچەکە لە مردن رزگاری بوو ، لە کاتێکدا ژیانی هونەرمەندەکە کەوتە ترسەوە ، بەڵام هونەر دەوری خۆی بەتەواوی بینی . ( ئوهنری) بەم شێوەیە لە گرنگی هونەر لە ژیاندا گەیشتوە ، ئەبێ گیان‌و وزەی ورەی رووخاو لە ناو مرۆڤدا بەرزبکاتەوە — هەرچەندە بۆ ئەوەش هونەرمەند ژیانی خۆی بخاتە ترسەوە .

بەڵام هونەر چۆن ئەتوانێ ئەم دەورە ببینێ ئەگەر خۆی لە ژیانی رۆژانە دا برببێت‌و نەزانێ ژیانی خەڵکی چۆن‌و چی هیلاکی‌و خەم‌و ناخۆشی‌یەکی تیایەو هەر بەدوای ئەوەدا بچێت کە بیەوێ بە خەیاڵ بگاتە نەوەکانی داهاتو ، ئەویش بە زمانێك کە خەڵکی ئەم رۆژە تێی ناگات .

( ٢ )

بەراستی من ئەمەوێ بپرسم :— ئەبێ مانای چی بێ ئەگەر لە یەکێك لەو نووسەرانەت پرسی کە حەز لە هێما(رەمز) و شتی نادیارو شاراوە ئەکەن ، ئایا تۆ بۆ کێ ئەنووسیت ؟

وەڵامت بداتەوە و بڵێ :— من بۆ دووارۆژوو نەوەکانی داهاتو ئەنووسم . ! !

ئەم وەڵامە مانای چی‌یە ؟ .

ئەم وەڵامە سەرەتا شارینەوەیەکی ناوەرۆکی ئەگەیەنێ — ئەگەر خراپەمان نەوتبێ بەو کەسانەی کە لە سەردەمی ئەو نووسەرەدا ئەژین — لێرەشدا ناتوانین ئەو بەرەنگاری‌یەمان لەبیر بچێ کە دێت بە خەیاڵدا ، ئەویش ئەوەیە نووسەر کاتێك گرنگی ئەدات بە نەوەکانی داهاتو ئەبێ خاوەنی دەورێکی سەرەکی‌و دیار بێت‌و ئەوە وای لێ بکات کە لە ویژداندا گرنگی‌یەکی تایبەتی بە نەوەکانی ئێستا بدات‌و ئەمەش بە شێوەیەکی تایبەتی بیگەیەنێتە ئەوەی کە حەز بکات ئەم نەوانەی ئێستا بەرەو پاشەرۆژێکی فراوانترو باشتر ببات . ئەم بەرەنگار بوونەوەیە خاڵی نیە لە راستی :— بەڵام گومان لەوەدا ئەمێنێ کە حەز کردنی چاك بە تەنها بەس نیە بۆ دەرکەوتنی هیواو ئامانجی نووسەر بۆ کاری راستەقینە ، لەکاتێکدا کە نەوەکانی ئەمرۆ نەتوانن لەگەڵ نووسەرێکدا رێك بکەون‌و لێی تێ نەگەن — بە هۆیەك لە هۆکانەوە کە زۆر کات پەیوەندی بە شکڵەوە هەیەو لە کاتی تریشدا بە ناوەرۆکەوە گومانی تیا نی‌یە کە نووسەر زۆر لە خۆی ئەکات‌و هەوڵ ئەدات بۆ بچران‌و دابرانی تەواو لە خەڵکی سەردەمەکەی خۆی ، ئیتر ئەو کاتە تەنها شتێك کە متمانەی بکاتە سەر بۆ مانەوە لەسەر رێرەوی راست تەنها رێکەوت (الصدفة) یە ، یاخود هۆکانی تری کۆمەڵایەتی‌و ئابووری ، نووسەریش‌و جەماوەریش وەك یەك بروا بەم مەسەلەسە یە ئەکەن ، چونکە پەیوەندی راستەقینە لەنێوانیاندا پەیوەندی‌یەکی جەدەلیە ، ئەوەندەی نووسەر کار ئەکاتە سەر خەڵکی ، ئەوەندەش کاری تێئەکەن ، هەروەها ئەوەندەی نووسەر دەوری پێشەوایەکی رێ نیشان‌دەر ئەبینێ هەر لەو کاتەشدا ئەوەندە دەوری وەرگرو رێ نیشان‌دراو ئەبینێ . کاتێکیش پەیوەندیان لاواز ئەبێ یاخود ئەپچرێت ، ئیتر هەر بە زەروورە مانای ئەوەیە کە گۆرانکاری هەر یەکەیان مەرجی تایبەتی خۆی هەیەو دوورە لەوی تریان ، وە پێك گەیشتیان لە دووا رۆژدا — وەکو هەندێکیان وا ئەزانن — زۆر زەرووری نیە — جا ئەوەبوو ئەوەشمان بەست بە رێکەوتەوە .

دەربارەی ئەم مانایەش فەیلەسوفی ئەسپانی ( سانیتانا) ئەڵێ :—

(مەرج نی‌یە هونەرمەندی ئەمرۆ ئەوە بکات بە رێگا کە لە لایەکەوە لەوە بترسێ بکەوێتە ناو رێکوپێکی تەرکردنەوەی دارسشتنی تاریف کردنی هونەری ئاکادیمی داو لە لایەکی تریشەوە لە لادان لە زەوق بەهۆی حەزکردن لە تازە کردنەوەوە . مەگەر ئەو کاتە نەبێ کە بگەرێتەوە بۆ پەیوەندی سروشت‌و ئەبێ ئەو پەیوەندی‌یەش رۆژ بەرۆژ پەرەبسێنێو تازە بکرێتەوە .

(٣)

کەواتە ناوەرۆکی تازەکردنەوە لە هونەردا ئەوە نی‌یە کە زمانێکی تازە دابهێنین — کە لە وانەیە خەڵك لێی تێ نەگات — بەڵکو ئەوەیە ئەبێ زمانی خەڵکی بەکاربهێنین بەکارهێنانێکی تازەو راست یان بە واتایەکی تر بە شێوەیەکی راست‌و دوور لە نەخۆشی بێ‌سەروبەر قسەی پێ بکەین . خەڵکی لەنێوان بەیەکداهاتنی ژیانی رۆژانەیاندا ئەکەونە بەر شەپۆلی تێك چوونی گیانی قوڵو لە دووایشدا رۆژ بە رۆژ زمانەکەیان بەشێوەیەکی تێك‌چوو هەڵەوەشاوەتر بەکارئەهێنین ، لێرەشدا مەبەستمان لە رێزمان نی‌یە بەڵکو مەبەستمان لە تێکەڵکردنی رێگاکانی دارسشتنە لە زمانەکەدا . وە کاتێك ئەیان گێرینەوە بۆ سەرچاوەکانی قسەکردن‌و دارشتنی راست‌و دروست یان بۆ هۆکانی دارشتنی جوان — ئەوە ئێمە زمانەکەیانمان رزگارکردووەو لە دووایشدا خۆیان ، لەم کارەشماندا زمانێکی تازەمان بۆ دانەهێناوون بەڵکو فێرمان کردوون کە چۆن زمانە راستی‌یەکەی خۆیان بەشێوەیەکی راست‌و دروست بەکار بهێنین . لەژێر کاری ئەم

وتـەیـەدا(بـرنـادشۆ) شانۆگەری‌یە بەناوبانگەکەی(خانمە جوانەکەم) ی نووسیوە . کاتێك زامای زمانەوانیەکە – لە شانۆ گەری‌یەکەدا – گرەوی لەسەر رزگارکردنی کچەکەی سەر شەقام کرد کە زمان‌و رەوشتی تەواو نەبوو تێك چووبوون ئەویش لە رێگای راهێنانیەوە لەسەر قسەکردنی راست‌و دەرهێنانی پیتەکان‌و قسە پێکردنیان لە شوێنی خۆیاندا .

ئەمە ئەوەی گەیاند کە گەرانەوە بۆ سەرچاوەی زمان تەنها زمانی کچەکەی رزگار نەکرد بەڵکو توانی کچەکە لە هەموو روویەکی رەوشتی‌و گیانی رزگاربکات – هەروەکو لە کۆتایی شانۆگەری‌یەکەدا دەرکەوت .

کەواتە هونەرمەند کە ئەچێتە لای خەڵکی وەکو ئەوە وایە کە پێیان بڵێ :–

ئەمە زمانەکەتانە وا هەروەکو خۆی بۆم هێناونەتەوە .

نەوەك وەکو یەکێك کە بچێتە لایان‌و بەسەریانا بقیرێنێو پێیان بڵێ :–

زمانەکەی خۆتان لەو لاوە دانێن‌و ئەم زمانە تازەیە وەرگرن . کاتێك هونەر مەند ئەم راستی‌یە ئەخاتە پێش چاوو بیری خۆیەوە – ئیتر بەقەدەر ئەوەی خەڵکی رزگارئەکات خۆیشی رزگاری‌ئەکات – ئیتر تەنها لەم کاتەدا ئەتوانێ بەسەر رێگاکانی تازەکردنەوەدا بڕوات‌و ، ئەبێ بڕوای هەبێت بەوەی کە پەیوەندی بەخەڵك‌و ژیانەوە نەبڕێت .

(٤)

تازەکردنەوە لە ناوەرۆکدا تەنها بیرکردنەوەو داهێنانێکی تاکەکەسی نی‌یە ، بەڵکو هەر لەو کاتەشدا بیرکردنەوەو داهێنانێکی کۆمەڵی‌یە ، گەورەترین بزوتنەوەی تازە کردنەوە لە هونەردا ئەوانەی کە کاریان کردووەو ماونەتەوە هەمیشە ئەم مەسەلە جوانەیان تیا دەرکەوتووە – کە داهێنانەکانی هونەرمەند خۆی تێکەڵ داهێنانەکانی کۆمەڵ لە دووای پاش ماوەی تێکەڵاوی سەر زاری‌یەوە بووەو بوتە هۆی ئەوەی کە هونەرمەند ئەنجامێك بەدەست بهێنێ گیانی کۆمەڵو گیانی تاکەکەس خۆی تیا کۆبکاتەوە بەرادەیەك کە زۆر بە نارەحەت جیاوازی نێوان بەرهەمی بیری تاکەکەس‌و بەرهەمی بیری کۆمەڵی تیا ئەکرێت‌و لێرەدا کۆمەڵی خەڵك خۆی لە هونەری تازە دا ئەدۆزێتەوە .

ئەگینا هەموو هەوڵێکی تازەکردنەوەی تاکەکس‌و دابراو لە گیانی سەردەم‌و سروشتی راستەقینە نابێتە هیچ تەنها هەوڵێك نەبێ کە زۆر زوو ئەتووێتەوەو دووای ماوەیەکی کورت بینی دروست‌کراوی نامێنێ – هەروەکو بەسەر زۆر قوتابخانەو بیروباوەری هونەری تازە داهات کە زۆر تر لەو منالێکی کۆتو کۆیرو ئیفلیج نەژیان کە چەند رۆژێکی کەم ئەژی‌و ئیتر دووا هەناسەی لە ژیانی بێ بەزەییدا ئەدات‌و ئەمرێ .

(٥)

جارێکیان کرێکارێکی ناو کانە خەڵوز نامەیەکی بۆ شاعیرێکی بەناوبانگ نووسیبو لە نامەکەیدا بە شاعیرەکەی وتبوو :–

( من نازانم شیعر چی‌یە ؟ بەڵام کاتێك کە تۆزی خەڵوزم لە دەم‌و چاوم ،سری‌و ئێوارە گەرامەوە بۆ ماڵەوە) جوان خۆم شۆری‌و جلی پاکم لەبەرکردو دووای ئەوە منالە بچکۆلانەکەم هەڵگرت‌و چومە بەر دەرگا ، ئاسمان بە ملیۆنەها ئەستێرەیەوە کە تیا ئەدرەوشانەوە ، وەکو هۆڵێك وابوو کە میهرەجانێکی گەورەی تیا بکرێت . لەوێدا هیچ دەنگێك نەئەهات بێجگە لەو دەنگە نادیارانە لەو ماڵانەوە بەرزئەبووەوە کە خۆیان ئامادە ئەکرد بۆ نانی ئێوارە یان شەونخونی یان خەوتن ، تەندروستیم زۆر چاك بوو . . . هەروەها تەندروستی منالەکەشم . . . لێرەدا ئیتر نازانم بۆچی هەستم کرد کە ئەوپەری بەختیارم‌و ئەبێ ئەمەت بۆ بنوسم .

کاتێك شاعیرەکە بە نامەیەکی تایبەتی وەڵامی ئەو کرێکارەی دایەوە کە دەربارەی شیعر لە گەڵیدا دووابوو یەکەم رستەی لە نامەکەیدا ئەمە بوو :–

خوایە . . . تۆ نازانی شیعر چی‌یە . . . کەچی ئەوەی بۆت نووسیووم خۆی شیعرە .

(٦)

بەڵێ ئەو وێنەکێشەی کە هەوڵێ دا بو وێنەکێشان وەکو لە چیرۆکەکەی( ئوهنری ) دا هاتبو : بیری لە درواسی‌یەکەی‌ئێستای ئەکردەوە پێش ئەوەی بیرلە و دراوسیە بکاتەوە کە رۆژێك لە رۆژان دێتە جێگای ئەم دراوسیەی ئێستای . . . ئەو کرێکارەش کە بە هەموو سادەیی‌و بێ گوناهیەکیەوە لە شیعری ئەپرسی . . . بێ ئەوەی بزانێ شیعری دروست‌ئەکرد . جا ئێمە بە زمانی خەڵکی‌و بەرەنگیان‌و ئاوازیان گەورەیی‌و لێهاتنی هونەری خۆمان وەرئەگرین ، گرەویش لەسەر دووا رۆژ لە گرەوکردن لەسەر ئێستاوە دەست‌پێئەکات دووا گەڵای سەر کەپری مێوەکە لە دەستی ئەوانەدا بوو کە لە پەنجەرەکەوە سەیریان ئەکرد بۆیە بوو بە گەڵایەکی نەمر ●

**لەگۆڤاری( المسیرة) ژمارە (٥) ساڵی ١٩٨٠ وەرگێردراوە**

# بەرەوپێشکەوتن

## کوێرەکان بە چاوی تەلەفزیۆنی جیهان دەبینن !

رۆژ نی‌یە زاناکان خزمەتگوزاری‌ی نوێ پێشکەشی کوێرەکان نەکەن . . پەرەسەندنی تەکنەلۆژی لە بواری ئامێردا کە یارمەتی‌ی کوێرەکان دەدات ، سەرکەوتنی دیار وەدی دەهێنێت .

وا لەو رۆژە نزیك دەبینەوە کە کوێرەکان تێیدا دەتوانن جیهانی دەوروبەری خۆیان بەهۆی دەستکەوتە نوێیەکانی تەکنەلۆژیاوە ببینن .

لەو داهێنانە نوێیانە ، پەیدابوونی کتێبی قسەکەرە شارەزایان ئامێرێکی نوێیان داهێناوە . چاوێکی ئەلەکترۆنی‌ی تێدایە ، کوێر ئاراستەی هەر لاپەرەی کتێبێکی بکات ئامێرەکە پیتە چاپکراوەکان دەکاتە لەرینەوەی دەنگی . . بە چەشنێك ئەو کوێرە بەیارمەتی‌ی ئامێرەکەی دەتوانێت دەنگەکان بکاتە ووشە !

شارەزایان دەڵێن کۆمپیووتەر دەورێکی گەورە لەم کارەدا دەبینێت . . چونکە پیتە چاپکراوەکان بە هەر زمانێك بێت ، دەکاتە دەنگی ئاشکرا کە دەکەوێتە بەر گوێ‌ی کوێرەکە !

لە ئەڵمانیای رۆژئاوادا پەرەسەندنێکی سەرنج راکێشەر پەیدابووە . . ئەویش کۆمپیووتەرێکە کوێر چی کاری ژماردنی بوێت بەرێكوپێکی‌و زۆر وورد بۆی ئەنجامدەدات . لەم کۆمپیووتەرەدا نمرەکان بە داگیرساوی دەردەکەون . . کە بەکاردەهێنرێت ، ژمارەکان دەبنە هێمای دەنگی ، مایکرۆفۆنێك دەنگەکان گەورە دەکاتەوە . . ئەنجا کوێرەکە گوێ‌ی لەو ژمارانە دەبێت کە بەهۆی پەنجەنان بە دوگمەکانیدا بە کۆمپیووتەرەکەی ووتووەو چەشنی ژماردنەکەش دەبیسێت ، ئەنجا بە ئاشکرا گوێ‌ی ئەنجامی داواکاری‌یەکەی دەبێت .

## کۆمپیووتەر ئاگاداری فرۆکەوان دەکاتەوە

کاتێك فرۆکەوان هەڵە بکات ئەو کۆمپیووتەرێکی تایبەتی گورج ئاگاداری دەکاتەوە لەگەڵ چەند ووشەیەکی نەرم‌و نیانی سەرزەنشتی‌دا . .

ئەوە بوو یەکێك لە کۆمپانیاکانی هێڵی ئاسمانی‌ی ئەڵمانیا ٤٨ ملیۆن مارکی ئەڵمانی‌ی خەرج کرد بۆ ئەوەی یەکەمین کۆمپانیای فرۆکەوانی بێت لە جیهاندا چوار کۆمپیووتەری لەو چەشنەی هەبێت پاش ئەوەی دەرکەوت کە کۆمپیووتەر لە کابینەی فرۆکەرانیندا زووتر بیر دەکاتەوە وەك لە دەزگاو ئامێرەکانی تر .



## ئەم ئافرەتە شارێکی تەواو دەدۆزێتەوە

مۆنیکا بارنیس ، ئافرەتێکی ئەمریکایی‌یە بە دووی شوێنەواری کۆن‌دا دەگەڕێت ، لەم دوایی‌یەدا شارێکی تەواوی لە ژێر وێرانکاری‌و خۆڵ‌و تەپ‌و تۆزدا لە پیرۆ دۆزیوەتەوە ، ئەو شارە لە هەمان ئەو شوێنەدا هەبووە پێش ئەوەی یەکەمین شارستانیەت کە شارستانیەتی ئەنکایە هەبووبێت .

لەم وێنەدا مۆنیکاو چەند شتێك لە دۆزراوەکانی دەبینرێن .




## پەرەپێدانی بۆینگ

کۆمپانیای بۆینگ ڕایگەیاند کە خەریکە نموونەیەکی نوێی فڕۆکەی بەناوبانگ ٧٣٧ کە دوو ماشینی هەیە پەرەپێبدات .

ئەم پەرەپێدانە نوێیە بە ناوی ٧٣٧ - ٣٠٠ دەناسرێت‌و کۆمپانیاکە دەڵێت ئەم سیفاتە نوێیانە گرنگی‌یەکی تایبەتی بە کۆمپانیا عەرەبی‌یەکانی فڕۆکەوانی دەبەخشن وەکوو کۆمپانیای فڕۆکەوانی کوێت‌و سعودیەو کەناری عەرەبی کە لەم چەشنە فڕۆکەیە بەکاردەهێنن بەڵام لەنموونەی ترن .

ئەوسیفاتە نوێیانەیش ئەوەن کە بۆینگی ٧٣٧ – ٣٠٠ کەمتر سووتەمەنی‌ی دەوێت‌و بۆدی‌یەکەی لێژ ترەو دەنگ لە ماشینەکانیەوە نایەت ئەگەرچی گەورەترن بەڵام لەبەر دەمی باڵەکانیەوە دادەمەزرێنرێن .

لە ناوەوە ، لەبەر درێژیی فڕۆکەکە ئەوا سێ ڕیز ئەسکەمیلی دەبن هەریەکەیان شەش ئەسکەمیلی‌ی تێدایە سەرەڕای نیو ڕیز کە سێ ئەسکەمیلی‌ی تێدایە .

هەروەها شوێنی جانتاو شت‌ومەکەکان بە ڕێژەی ٢٢ لە سەددا لە ژێر لاشەوە پتر دەکرێت .

کابینەی ڕانینی فڕۆکەکەیش نوێترین دەزگای ئەلیکترۆنی‌ی تێدا دەبێت کە لەو دەزگایانە باش ترن ئێستا لەناو فڕۆکەی ٧٣٧ – ٢٠٠ دا هەن .

کۆمپانیای بۆینگ دەڵێت ئەم نموونە نوێیە نزیکەی سێ سەد فڕۆکەی لێ دەفرۆشرێت .

ئەوەي ئاشكرایە ، شۆڕشی حەڤدەی تەمووز یەکەم شۆڕش نەبوو لە مێژووی عیراقدا . . بەڵکو شۆڕشی چواردەی تەمووز دەساڵ پێش ئەم بەرپاکرا کە لە سروشتە بنەڕەتییەکەیدا شۆڕشێکی نیشتمانیو نەتەوەییو دیموکراتیو پێشکەو تنخوازبوو . . بەڵام ئەوەندەی نەخایاند ، دەستەڵاتی شۆڕش لایداو بەرەو رژێمێکی دیکتاتۆریی راستڕەوی هەرێمایەتییانە گۆڕا . . هەرچەندەش سروشتی گشتی فەرمان رەوایيە نیشتمانیەکەی پاراستبوو . . لە هەشتی شوباتی ١٩٦٣ دا حزبی بەعسی عەرەبیی سۆشیالیست سەرکردایەتی شۆڕشێکی کرد دژي ئەو رژێمە . . کە تەقەللایەکی بەجەرگانەی بوو بۆ دامەزرانی سیستەمێکی دیموکراتیی شۆڕشگێڕانە کە بۆ بەدەستهێنانی یەکێتی تێبکۆشێ . .

بەڵام ئەو تاقیکردنەوە شۆڕشگێڕییە لاوە ، ئەوەندەي نەخایاند لەبەرچاوونبوو . .

لەئەنجامی پاشگەزبوونەکەی(ردە) تشرینی رەشدا . . هێزە هەرە راست رەوو دیکتاتۆرو پاشکەوتووەکان لەسەردەمی ١٤ی تەمووزی (١٩٥٨)ەوە گەیشتنە سەرحوکم ، کە لە هەموویان زیاتر ئارەزووی رێککەوتنیان لەگەل ئیمپریالیزمدا دەکردو کەلەبەرو کەلێنیان ئەخستەوە بۆ خۆتێکوتانو پەلهاویشتنی کۆنەپەرستانەو بۆ بەگژا چوونو دوژمنایەتی کردنی دیموکراتیو بیرو پراکتیکی پێشکەوتنخوازانە . .

لەئەنجامی ئەمەشدا ئەو دەستکەوتە نیشتمانیو پێشکەوتنخوازو دیموکراتییانەی کە لە یەکەم قۆناغی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨و شۆڕشی ٨ی شوباتی ١٩٦٣وە هاتبوونەدی ، هەموویان دووچاری هەڕەشەلێکردنو گەمارۆدانو پاشگەزبوونەوەو شێواندن بوون . . هەروەك جەماوەرو هێزە پێشکەو تنخوازەکانیشی لە پێش هەموویانە حزبی بەعسی عەرەبیی سۆشیالیست دووچاری جۆرەها تۆقاندنو زەبرو زەنگ بوون .

شۆڕشی حەفدەی تەمووزی ١٩٦٨ لە ناوەڕۆكو مەبەستدا شۆڕشێکی رزگاریخوازی دیموکراتی سۆشیالیستی یەکگرتن خوازە . . بەڵام بەهۆي باری تایبەتی عیراقو لە ئەنجامی ژێرکەوتنی هەردوو شۆڕشی ١٤ي تەمووزو ٨ی شوبات ئەم شۆڕشە دووچاری زیادە ئەرکی هێجگار گرانو ئاڵۆز ببوو . . سەرباري ئەوەی کە هەڵەو گیروگرفتەکانی قۆناغی پێشوو شوێنەوارو پاشماوەکانیشی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بە میرات بۆ مابووەوە ، لە هەمانکاتدا پێویستبوو لەسەری کە چارەسەریان بکاتو بەردەوام بێت لە بەدیهێنانی ئەرکە قۆناغیەکانی لەسەر رێگەی هێنانەدی ئامانجە ستراتیژەکانی لە یەکگرتنو سەربەستی سۆشیالیستدا .

بەڵام ئەو ئامانجانەی کە ئەرکی جێبەجێکردنیان لە قۆناغی پێشوودا روو رووی شۆڕش بوون لەسەر ریگای شۆڕشی رزگاریو دیموکراتیو سۆشیالیستانەی یەکگرتنخواز ، مایەی جێگیرکردنی دەستەڵاتی شۆڕشگێرانەو سەرکردایەتیی حزبی بوون لەگەل تەواوکردنی ئـــەرکـــە رزگاریو دیموکـــراتیو پێشکەوتنخوازییەکانیدا کە هەر دوو شۆڕشی ١٤ تەمووزو ٨ی شوبات جێبەجێیان نەکردبوون ، هەروەها ئەو ئەرکە نوێیانەی قۆناغی نوێی پەرەسەندنی شۆڕشگێرانەیان بە پێویست دادەناو بەپێی توانا دانانی سەرەتاو بنچینەی گواستنەوە بەرەو سۆشیالیزمو هاوبەشیکردنی کاریگەرانەش لە خەباتی عەرەبدا بۆ روو بەڕوو بوونەوەی دەستدرێژییەکانی ئیمپریالیزم زایۆنیزمەکانو بەربەستکردنی مەترسیەکانی برەو پێدانو تەشەنەکردنی پیلانگێڕانی کۆنەپەرستانە لە ناوچەی عەرەبدا . .

راپۆرتی سیاسی سەر
بە هەشتەمین کۆنگرەی
هەرێمایەتی

